حکومەتی هەرێمی کوردستان - عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# مێژووی نوێ و هاوچەرخ

## پۆلی دوازدەهەمی ئامادەیی وێژەیی

**دانانی**

**نازەنین محەمەد وهبی　　　عطا عەبدوڵڵا معـروف**

**دارا محەمەد عەبدوڵڵا**

**پێداچـوونەوەی زانسـتی**

**عومەر عەلی شەریف**

**جەمال مەجید فەرەج　　　ئاکۆ صابر عوسمان**

چاپی یازدەهەم　　٢٠١٥زایینی　　٢٧١٥کوردی　　١٤٣٦کۆچی

# بەشی یەکەم

## ململانێی عوسمانی - ئێرانی و کاریگەریی لەسەر کوردستان

### *عوسمانییەکان و سەرەتای دەرکەوتنیان:

عوسمانییەکان بە ڕەگەز دەچنەوە سەر هۆزێکی تورك کە لە ناوەڕاستی ئاسیاوە لەژێر فەرماندەیی میر (ئەرتوغرول)دا لەسەرەتاکانی سەدەی سیانزەهەم دا لەترسی ڕاوەدونانی (مەغۆل) ڕوویان کردە باکووری ڕۆژئاوای (ئەنادۆڵ)، پاشان بەهۆی چەند هۆکارێکەوە عوسمانییەکان توانیان میرنشینێك لەساڵی (١٢٩٩) دا دروست بکەن، بەناوی (عوسمان کوڕی ئەرتوغرول)ەوە ناوی (عوسمانی) بەسەردا برا.

عوسمانییەکان بە درێژایی هەردوو سەدەی چواردەهەم و پانزەهەمی زایینی دەسەڵاتیان بەسەر ئاسیای بچووك و نیمچە دوورگەی (بەلقان)دا سەپاندووە، ئەم دەسەڵات و پەلکێشان و فراوانکردنی زەوییە لە ئەوروپای ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتدا درێژەی کێشا، تەنانەت هەتا دوای ڕووخاندنی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی و کەوتنی (قوستەنتینیە)ی پایتەختیان بە دەستی سوڵتانی عوسمانی ( محەمەد فاتیح )لە ساڵی (١٤٥٣)زدا.

داگیرکردنی قوستەنتینیە و ڕووخاندنی دەوڵەتی بێزەنتی لەسەر دەستی سوڵتان (محەمەد فاتیح) دا بووە هۆی یارمەتیدەرێکی باش بۆ پاڵ پێوەنانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ بەهێز بوون و بڕوا بەخۆکردن و هەوڵدان بۆ فراوانخوازی دەرەکی لەڕۆژئاوا تاگەیشتنە نزیك ڤیەننا، بەڵام لەگەڵ هاتنی سوڵتان (یاوز) سەلیمی یەکەم (١٥١٢–١٥٢٠ز) بۆ تەختی دەوڵەتی

عوسمانی دا، گۆڕانکارییەك لە سیاسەتی دەوڵەتدا رووی دا، هێرشیان بۆ سەر ڕۆژئاوا وەستاندو روویان لە ڕۆژهەلات (کوردستان و نیشتمانی عەرەب)کرد، لەبەر ئەم هۆیانە:

١- لەسەرەتاکانی سەدەی شانزەهەم عوسمانییەکان لە ئەوروپادا زیاتر هەڵوێستی بەرگرییان وەرگرت، نەك هەڵوێستی هێرشکردن، لەبەر ئەوە چاریان نەمابوو ، تەنها ئەوە نەبێت کە شوێنی تازەتر بدۆزنەوە بۆ فراوانخوازیان ئەو شوێنەش بریتی بوو لە کوردستان و نیشتمانی عەرەب.

٢- کاتێك کە ڕۆژئاوای عەرەب و ئاوەکانی خوارووی عەرەب تووشی داگیرکاریی ئیستعماری پورتوگالییەکان هاتبوو، دەرفەتی بۆ عوسمانییەکان ڕەخساند کە بێنە ڕۆژهەلات و لە پاشان بیخەنە ژێر دەستی خۆیانەوە.

٣- سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەفەوی لە ولاتی فارس(ئێران) داو هەوڵدان بۆ فراوانخوازی و پەلهاویشتنی بۆ کوردستان و عێراق وای لە دەوڵەتی عوسمانی کرد ، ئەویش بێتە کایەی کوردستان و پاشانیش نیشتمانی عەرەب ، بۆ بەربەرەکانی و بەرگرتن لە دەسەلاتی سەفەوییەکان.

## * سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەفەوی لە ئێران :-

ناوی دەوڵەتی سەفەوی بۆ ناوی (شێخ صفی الدین) دەگەڕێتەوە کە لە ساڵی (١٣٣٤) ز دا کۆچی دوایی کردووە ، ئەم شێخە لە (ئەردەبیل) ناوبانگی دەرکردووەو خاوەن تەریقەتی (سۆفیگەری) بووەو خەڵکێکی زۆر لایەنگریان کردووە لە (ئازربایجان) .

لەگەڵ سەرەتای سەدەی شانزەهەمدا تەرازووی سیاسی لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا گۆڕا بەهۆی لاوازی دەوڵەتی (ئاق قۆینلو) و دەسەڵات و ناوبانگی بنەماڵەی سەفەوی زیاتر بووە، لەو کاتەدا ئیسماعیلی سەفەوی ئەم لاوازییەی (ئاق قۆینلو) بەهەل دەزانێت ولە ئازربایجانی ئێران دەوڵەتی سەفەوی ڕادەگەیەنێت (ساڵی ١٥٠١ز) و خۆشی بە (شا)ی ئەو دەوڵەتە دەست نیشان دەکات و شاری (تەورێز)یش دەکاتە پایتەختی دەوڵەتەکەی و مەزهەبی شیعەش دەکاتە مەزهەبی ڕەسمی دەوڵەتەکە، پاشان دەسەڵاتی خۆی بەسەر تەواوەتی ئێران داسەپاند. ئینجا کەوتە هەڵپەی داگیرکردنی ناوچەکانی دراوسێی لەوانە کوردستان و عێراق. دەتوانین چاو تێبڕین و هەوڵدانی شا ئیسماعیلی سەفەوی بۆ داگیرکردنی کوردستان و عێراق بگەڕێنینەوە بۆ چەند هۆیەك لەوانە:ـ

١– خراپی و دواکەوتوویی باری سیاسی کوردستان و عێراق لەبەر ئەوەی پڕبوو لە ئاژاوەو ناکۆکی ناوخۆیی.

٢– عێراق بایەخێکی تایبەتی و گرنگی هەبوو بۆ بنەماڵەی سەفەوی ، چونکە مەزاری گەلێك لە ئیمامەکانی شیعەی لێ بوو ، بێ تۆمانیش دەوڵەتی سەفەوی بەهەمان شێوە دەوڵەتێکی مەزهەب شیعە بوون.

٣– گرنگی شوێن و زەوی و زاری کوردستان بۆ کشتوکاڵ بەهۆی بەپیتی زەوییەکەیەوە و، مەڵبەندێکی گرنگی بازرگانی بوو بەهۆی هەڵکەوتنی شوێنەکەی.

لەسەرەتادا شا ئیسماعیلی سەفەوی سیاسەتێکی نەرمی لەگەڵ میرو بەگەکانی کوردا پیادەکرد، بەڵام دواتر کە دەسەڵاتی چەسپاند بە توندی ڕەفتاری لەگەڵدا کردن ، تەنانەت دژی ئەو میرە کوردانەش بوو کە بۆ

پیشاندانی لایەنگری خۆیان و پیرۆزبایی بۆ دەوڵەتی سەفەوی سەردانیان کردبوو ، کەچی بە پێچەوانەی بیرو بۆچوونی میرە کوردەکان و پێچەوانەی ڕەوشتی مرۆڤایەتییەوە، لەجیاتی سوپاس و پێزانینی بۆ میرە کوردەکان دەستی کرد بە زیندانی کردنیان و لابردنیان و گۆڕینیان بە دانانی لایەنگرەکانی خۆی لە قزڵباشەکان.

ساڵی ١٥٠٦ز یەکەم هێرشی سەفەوییەکان بۆ سەر کوردستان دەستی پێکرد بە تاڵانی و کوشتن و بڕین و کوشتاری خەڵکی بێتاوانی کوردستان و سیاسەتی دژە کوردی بەکارهێنا. هەروەها شا ئیسماعیل لە درێژەی فراوانخوازییەکاندا ساڵی ١٥٠٨ز توانی بەغدا داگیربکات و کۆتایی بە دەسەڵاتی دەوڵەتی ئاق قۆینلو بهێنێت کە حوکمی ئەوێیان دەکرد.

## * شەڕی چاڵدێران و کاریگەری لەسەر کورد :-

عوسمانییەکان لە دژی ئەو فراوانخوازیە وەستان کە شائیسماعیل لە ناوچەکانی کوردستان و عێراق کردی، چونکە وەکو ئاشکرا بوو لەو کاتەدا عوسمانییەکان ئەو فراوان خوازییەیان بە دەست تێخستنی سنوورەکەیان واتە (سنووری دەوڵەتی عوسمانی) دادەنا ، جگە لەوەی کە سنووری کوردستان جێگیر و ڕێك و پێك نەبوو.، بەم جۆرە کێشەی سنوور بووە هۆیەکی کاریگەر بۆ هەڵگیرساندنی شەڕو ناکۆکی لە نێوان عوسمانی و سەفەوی . ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەوانەی کە لە دەست دەسەڵاتی سوڵتان واتە سوڵتانی عوسمانی ڕایان دەکردو پەنایان دەبردە بەر دەوڵەتی سەفەوی لە ڕێگای هاوبیرەکانیانەوە کەوتنە هاندانی خەڵکی ئەنادۆڵ کە شۆڕش دژی عوسمانییەکان بەرپا بکەن.

کاتێ سوڵتانی عوسمانی (سوڵتان سەلیمی یەکەم) بەمەیزانی هەڵسا بە ڕاگواستنیان بۆ ئەوروپا لەوێ پەرش و بڵاوی کردنەوە.

هەروەها مەترسی بەرفراوانبونی دەسەڵاتی سەفەوی هۆیەکی تر بوو کە پاڵی نا بە سوڵتانەوە تا لەشکرێکی گەورە بەرەو ئەنادۆڵ و کوردستان بنێرێت، ئینجا سوڵتان سەلیم هەلێکی باشی بۆ ڕەخسا کە زۆربەی میرنشینە کوردییەکان بەلای خۆیدا ڕابکێشێت بۆ ئەوەی دژی شا ئیسماعیلی سەفەوی شەڕ بکەن .

پاشان لە ۲۳ی ئابی(١٥١٤)ز لە دۆڵی چاڵدێران کە دەکەوێتە بەشی باکووری ڕۆژئاوای دەریاچەی ئورمیە شەڕی چاڵدێران لە نێوان لەشکری عوسمانی و سەفەوی دا ڕووی دا کە بە سەرکەوتنی عوسمانییەکان کۆتایی هات، ئەم شەڕە بە شەڕێکی مێژوویی گرنگ دادەنرێت، چونکە یەکەم شەڕ بوو لەنێوان ئەم دوو دەوڵەتەدا ڕوویدات و عوسمانییەکان توانیان سەفەوییەکان بە شکاوی ڕاوبنێن و شا ئیسماعیلی سەفەوی بە برینداری هەڵهات و تەورێزی پایتەختی دەوڵەتەکەی بەجێ هێشت و سوڵتان سەلیم داگیری کرد ، پاش ماوەیەك سوڵتان سەلیم تەورێزی بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ (ئەماسیە) لە ناوەڕاستی ئەنادۆڵ.

دوای گەڕانەوەی سوڵتان سەلیم بۆ ئەماسیە شا ئیسماعیلی سەفەوی گەڕایەوە تەورێز و دەستی کرد بە خۆ ئامادەکردن بۆ تۆڵەسەندنەوە لە عوسمانییەکان.

سەرکەوتنی عوسمانییەکان لە شەڕی چاڵدێران بەسەر سەفەوییەکاندا بە هاوکاری کوردەکان بوو، چونکە شا ئیسماعیلی سەفەوی خراپەی زۆری لەگەڵ کوردەکاندا کردبوو، لەبەر ئەوە کوردەکانیش لەڕێگەی مەلا

ئیدریسی بەدلیسی یەوە پشتگیری دەوڵەتی عوسمانیان کرد دژ بە سەفەوییەکان . بەم شێوەیە عوسمانییەکان توانییان ناوچەیەکی زۆری کوردستان بخەنە ژێر دەستی خۆیانەوە بەتایبەتی دوای ئەو لایەنگیرییەی کە پیشانیان دا بۆ دەوڵەتی عوسمانی، ئەم ناوچانە لە جیاتی داگیرکەری سەفەوی کەوتنە ژێر دەستی داگیرکەری عوسمانی تورك.

## ئەنجامەکانی شەڕی چاڵدێران( ١٥١٤ز ):-

١- دابەشبوونی کوردستان لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا، بەشێکی کەوتە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی سەفەوی (ئێرانی) وبەشەکەی دیکەی کەوتە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی

٢ - عوسمانییەکان بەهۆی داگیرکردنی بەشی زۆری کوردستان توانیان پارێزگاری لە سنووری ڕۆژهەڵاتی دەوڵەتەکەیان بکەن.

٣- سەردەمێکی نوێ لەشەڕو ناکۆکی لە نێوان دەوڵەتانی ئێران و دەوڵەتی عوسمانیدا دەستی پێکرد کە لەسەدەی شانزەهەمەوە بەو جۆرە مایەوە هەتا سەرەتاکانی سەدەی بیست.

## * نزیکبوونەوەی عوسمانی و کورد و ڕۆڵی مەلا ئیدریسی بەدلیسی:-

کاتێك شا ئیسماعیلی سەفەوی کە دەوڵەتی سەفەوی دامەزراند و کۆتایی هێنا بە دەسەڵاتی ئاق قۆینلو و هەرچی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئاق قۆینلو بوو هەمووی داگیر کردو خستیە ژێر دەستی خۆی، لەوکاتە مەلا ئیدریسی بەدلیسی ناچاری شاری تەورێزی بەجێهێشت، هەرچەندە خۆی و خێزانەکەی لە پێشتر لە ساڵی(١٤٦٩ز) لە دیاربەکرەوە

چوو بوونە تەورێز، چونکە دەیزانی کە لەگەڵ شا ئیسماعیلی سەفەوی ناتوانێت لەگەڵیدا هەڵبکات و بژی، لەبەر ئەوەی زۆر بە توندی دەستی داوەتە مەزهەبی شیعەو شیعەگەری و دوای هاتنی سوڵتان سەلیمی یەکەمساڵی(١٥١٢)ز بۆ سەر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی و لەسەر داوای سوڵتان سەلیم مەلا ئیدریسی بەدلیسی گەڕایەوە.

مەلا ئیدریسی بەدلیسی دەبێتە ڕاوێژ کاری سوڵتان سەلیم لەبەر ئەوەی یەکێك بووە لە رۆشنبیرە زیرەکە لێهاتووەکانی سەردەمی خۆی، هەرچەندە نووسینەکانی بە زمانی تورکی و فارسی و عەرەبی نووسیوە، بەڵام یەکێك بووە لە لێهاتووەکانی کورد،و سوڵتان سەلیم داوای لێ کردووە، وەك ڕاوێژ کارێکی کورد هەوڵی هێنانە ناوەوەی میرنشینە کوردەکان بدات بۆ ژێر دەستی عوسمانی و هەوڵ بدات کوردەکان بە هەر ڕێگایەك بێت بیانکات بە لایەنگری عوسمانی، مەلا ئیدریس بە پاڵپشتی سوڵتان سەلیم توانی لایەنگری و پاڵپشتی میرنشینە کوردییەکان بۆ دەوڵەتی عوسمانی دابین بکات، بەمەرجێك پارێزگاری لە دەسەڵاتی خۆیان بکەن لە میرنشینەکەیاندا.

پاشان مەلا ئیدریسی بەدلیسی توانی پەیمانێکی تایبەتی بە سوڵتان سەلیم دەربکات کە ئەم بەندانەی تێدا بوو:

١- پارێزگاری لە سەربەخۆیی میرنشینە کوردەکان (واتە دەسەڵاتی عوسمانی هەر بە ناو دەبێت لە میرنشینەکاندا).

٢- میللەتی کورد لەکاتی شەڕدا یارمەتیی عوسمانییەکان دەدات.

٣– فەرمانڕەوایەتی لە میرنشینەکاندا پشتاو پشت بێت، واتـە لـە باوکـەوە بۆ کوڕ و نەوەکانیان بمێنێتەوە، یاخود پـەیڕەوی ئـەو ڕێبـازە بکرێت کە لە ناوچەکاندا باوە.

٤– کوردەکان زەکات و باج و سەرانە بدەنە گەنجینەی دەوڵەتی عوسمانی.

شایانی باسکردنە کە لەسەرەتادا دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی هـەر بـەناو ئەو دەسەڵاتانەی لـەخۆگرتبوو: دەرکردنـی فەرمانـەکان و ناولێنـانی مـیر و بەگەکان و دابەشکردنی دیاری بە سەریاندا، سوڵتانی عوسمانی هـەر میرێك نازناوی (بەگلەربەگ)ی دایە، واتە (سەرۆکی بەگەکان).

## * داگیرکاری و فراوانخوازی دەوڵەتی عوسمانی لە کوردستان:–

سـوڵتان سـەلیم دوای سـەرکەوتنی لەشـەڕی چـاڵدێران یـەکێك لـە فەرمانـدەکانی کـە نـاوی (فـەرهاد پاشـا) بـوو لەناوچـەکەدا جێهێشـت، تـا داگیرکردنی ئەو شار ناوچانەی کوردستان تەواو بکات کـە کەوتبوونـە سـەر سنوری عوسمـانی. تـا سـاڵی ١٥١٥ز بەشـێکی گـەورەیان داگیرکـرد لەوانـە (ماردین، روها (ئورفە)، موسڵ، شەنگال، تەلەعفەر، جەزیرەی ئیبن عومـەر (جزیرا بۆتـان)، ئامێدی و هەولێر و کەرکوك) لەگەڵ (ڕەقە) لە سوریا.

## * ڕەتکردنەوەی دەسەڵاتی عوسمانی لەلایەن کوردەوە:-

میرنشینە کوردەکان هەرچەندە سەربەخۆ بوون ولایەنگیری دەوڵەتی عوسمانییان دەکرد، بەڵام زۆری نەخایاند کە دەوڵەتی عوسمانی پەیمانەکانی کە لەگەڵ کورد و سەرکردەو میری میرنشینە کوردییەکان بەستبووی شکاندی و خیانەتی لە بەڵێنەکانی خۆی کرد و میرنشینە کوردییەکانی فەوتاند، بە ڕادەیەك کە لە کۆتایی سەدەی حەڤدەهەمدا تەنها چەند میرنشینێکی کوردی کەم مابوونەوە. لەبەر ئەوە هەندێ کات ڕاپەڕین و شۆڕش دژ بە عوسمانییەکان بەرپادەبوو.

یەکەم پێکدادان پاش چوارده ساڵ لە سەردانی سوڵتان سلێمانی قانوونی بۆ کوردستان لە ساڵی (١٥٣٨)ز بوو کە میری میرنشینی ئەردەڵان میر(حسین) ڕاپەڕی دژی دەسەڵاتی عوسمانی، بەڵام دەوڵەتی عوسمانی هێرشێکی گەورەی کردە سەر و ڕاپەڕینەکەی لە ناو برد.

بەڵام جارێکی تر لە ساڵی(١٥٤٩)ز دا میری میرنشینی ئەردەڵان ڕاپەڕییەوە و، بەڵام عوسمان پاشای والی حەلەب بەهێزێکی زۆرو ئاگر و ئاسن ڕاپەڕینەکەی دامرکاندەوەو لە ناوی برد، ئەمە سەرەڕای چەندین شەڕ و ڕاپەڕینی دیکە میرنشینەکانی تری کورد وەك میرنشینی سۆران و میرنشینی بۆتان و بابان کە لە بەشی چوارەمدا باسیان دەکەین.

## * ململانێی عوسمانی و سەفەوییەکان و کاریگەری لەسەر کوردستان:-

سەدەی شانزەهەم ململانێیەکی ترسناکی بە خۆیەوە بینی لە نێوان هەردوو دەوڵەتی ئیسلامی عوسمانی ( تورکی ـــ سوننی مەزهەب)و سەفەوی ( ئێرانی ــ شیعە مەزهەب)دا ، لە پێناوی سەپاندنی دەسەڵاتیان و فراوانکردنی خاکەکانیان لەسەر وڵاتانی تری ئیسلامی لە ڕۆژهەڵاتی

ناوەڕاست دا، چونکە لەسەرەتای سەدەی شانزەهەمدا ئەم دوو دەوڵەتی(عوسمانی و سەفەوی) لەوپەڕی هێزو توانادا بوون و هەریەکەیان دەیویست لەسەر حسابی ئەوی دیکە هەنگاوی فراوانخوازی خۆی چڕ بکاتەوەو دەوڵەتەکەی خۆی فراوانتر بکات.

بۆ ئەم مەبەستە گەلێك ڕێگای تیادا بەکارهێنرا وەك هێز و فێڵ و تەڵەکەبازی و هەندێك جاریش فریودان و بەڵێنی تروسکەدار، شەڕو ململانێی نێوانیان هەمووی بوونەتە هۆی دروستکردنی کارەسات و وێرانکاری و کوشتن و بڕین و تێکدان بۆ ناوچەکە،بە تایبەتی کوردستان، چونکە کوردستان دەکەوێتە نێوان هەردوو دەوڵەتەکەوەو هاوکێشەی ئەم ململانێ سیاسی — سەربازییەداو، بوو بە شانۆی جەنگ و پێکدادانی هێزەکانی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی، و زۆربەی شەڕەکانی هەردوولایان لەشکر کێشییەکانیان بە ناو خاکی کوردستان تێ دەپەڕین ، ئەم شەڕو لەشکرکێشییەش کە لە نێوان هەردوو دەوڵەتەکەدا دەکرا، هیچ بوارێکیان بۆ کولتورو دامەزراوە ناوخۆییەکان نەهێشتەوە، هەروەها کوردستان ناوچەی سنوری جیا کەرەوەی هەردوو دەسەڵات و دەرگایەکی کراوەش بووە ، بۆ لەشکرکێشی سەفەوی بۆ عێراق کە شوێنە پیرۆزەکانی مەزهەبی شیعەی بە خۆیەوە گرتووەو هەمیشە بۆ فارسەکان مەڵبەندێکی ڕووحی پیرۆز بووە ، بێجگە لەوەی کە عێراق تاکە ڕێگای سەفەوی بوو ، بۆ سەر دەریای ناوەڕاست. کوردستانیش هەروەکو باسمان کرد لەبەر ئەوەی کەوتووەتە نێوان هەردوو دەوڵەتەکەوە (عوسمانی و سەفەوی) شتێکی ئاساییە کە بووە مەیدانی سەرەکی ئەم ململانێیەی نێوانی هەردوو دەوڵەتەکەو، گەلەکەی گەورەترین بەشی لەم وێرانکاریەدا بەرکەوت، لە

کارەساتەکانی شەڕ، بەتایبەتی لەبەر ئەوەی کە پارچە پارچەش بوو، چەند میرنشینێکی دەرەبەگایەتی کە کەسیان نەیاندەتوانی بە تەنها بەربەرەکانی داگیرکەران بکەن.

ڕژێمی دەرەبەگایەتی کە لەو ڕۆژگارەدا باو بوو لە کوردستاندا کۆسپێك بوو لە ڕێگای یەکگرتنی گەلی کوردو کۆکردنەوەی میرنشینە کوردەکان لەژێر ئالای یەك دەوڵەتدا کە بتوانێت بەرگری لە کوردستان بکات و هێرشی بێگانەکان بۆ سەر وڵاتەکەیان نەهێڵێت و لەمەترسی شەڕ دوور بخاتەوە ئەو شەڕەی کە هیچ پەیوەندییەکی بە گەلەکەیەوە، واتە گەلی کورد لە کوردستان نەبوو نە لە دوور و نە لە نزیکەوە.

ئیمپراتۆری عوسمانی لە سەدەی شانزەهەمدا لە ماوەی زێڕینی هێزی دابوو، لە بەر ئەوە نەیدەتوانی لەبەرامبەر فراوانخوازییەکانی ئیمپراتۆریەتی سەفەوی بێ دەنگ بێت، لە نێوان ئەم دوو هێزە ناکۆکە مەزهەبی نەتەوایەتی دا میر و بەگە کوردەکان کە زۆربەیان بە مەزهەب سوننی بوون، نەیانتوانی ببن بە هێزی سێیەم لە ناوچەکەدا ، سەرەڕای نەبوونی هەستی نەتەوایەتی لەناو کوردا لەو کاتەدا بە مانای نوێ، کە بتوانێ هێزو توانای هەموو ڕۆڵەکانی کورد کۆ بکاتەوە، بەڵکو هەستی مەزهەبی ئایینی زاڵبوو بەسەریاندا، ئەمە بووە هۆی ئەوەی فەرمانڕەواکانی عوسمانی و سەفەوی سوودی لێ وەربگرن و بەکاری بهێنن تا کورد ڕابکێشن بەلای خۆیاندا.

سەرەڕای سیاسەتە دوژمن کارییەکەی دەوڵەتی سەفەوی بەرامبەر بە میرنشینە کوردەکان، هەر هێندەیان بۆ کورد هێشتەوە کە بکەونە داوی لایەنگری و پاڵپشتی ئیمپراتۆری عوسمانی بۆ پاراستنی خۆیان لە هەڕەشەی سەفەوییەکان، کە ئەمەش یەکەمین هەنگاوی دیاردەی

پاشکۆیەتییەکی ناچاری بوو کە لەناو میرنشینە کوردییەکاندا دەرکەوت ، ئەمە سەرەڕای لاوازی میرنشینە کوردییەکان لەبەرامبەر ئەم هێزانەدا کە بە تەنها نەیاندەتوانی بەرپەرچی دوژمن بدەنەوە ، لەبەر ئەوە هەریەکە لەو میرانە بۆ پاریزگاریکردن لە خۆیان لەژێر کاریگەری سۆزی ئایینی و مەزهەبی دا دەچووە پاڵ یەکێکیان.

## *داگیرکاری و فراوا نخوازی دەوڵەتی عوسمانی لە نیشتمانی عەرەب:-

داگیرکردنی عوسمانی بۆ نیشتمانی عەرەب لە سەردەمی سوڵتان سەلیمی یەکەم (١٥١٢-١٥٢٠ز) وسوڵتان سلێمان قانونی(١٥٢٠-١٥٦٦ز) دابوو، لەم ماوەیەدا دەسەڵاتی عوسمانی توانی وڵاتی شام و میسر وحیجاز ویەمەن و عێراق و خۆرئاوای عەرەبی داگیربکات بەم شێوەیە:

### ١ - داگیرکردنی وڵاتی شام و میسر وحیجاز و یەمەن ( ڕووخاندنی مەمالیك ):

دوای ئەوەی عوسمانییەکان لەشەڕی چالدێران١٥١٤ز بەسەر سەفەویەکاندا سەرکەوتن دەستیان گرت بەسەر ناوچەیەکی زۆری کوردستاندا، هەوڵیاندا دەسەڵاتیان لەسەر حسابی مەمالیك زیاتر فراوان بکەن. مەمالیکەکان ئەو کاتە حوکمڕانی میسرو شام و حیجاز و یەمەنیان دەکرد، عوسمانییەکان سەرەتای پەلامارەکانیان بۆ سەر مەمالیك لە شامەوە دەست پێکرد لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١- دەستگرتنیان بەسەر شامدا بەمانای دەستگرتنیان بوو بەسەر خۆرهەڵاتی دەریای ناوەڕاست دا.

٢-مسـۆگەرکردنی ڕێگـەی هاتوچـۆی بازرگـانی عوسمـانی ولـەدەریای سـووریش نزیـك دەبوونـەوە، کەدەچـێتەوە سـەر زەریـای هینـدی و پورتوگالییەکان تیادا بڵاوببوونەوە.

٣- زاڵبـوونی عوسمانییـەکان بەسـەر دەریـای ناوەڕاسـتدا یارمـەتی دەدان دەسەڵاتیان بگەیەننە خۆرئاوای عەرەبی.




سەرەتا پەیوەندی نێوان عوسمانییەکان و مەمالیك ئاسـایی بـوو، بـەڵام لەئەنجامی فراوانخـوازی عوسمانییـەکان بـۆ سـەر میرنشـینەکانی دراوسـێی وەك میرنشـینی(ذي القـدر) لەشـام، نـاکۆکی کەوتـە نێوانیانـەوە. بیـانووی عوسمانییـەکان بـۆ هێرشـکردنە سـەر ئـەم میرنشـینە ئـەوەبوو کـە ئـەم

میرنشینە وەك كۆسپ وایە لەبەردەم سوپای عوسمانی لەكاتێكدا هێرش دەكەنە سەر ئێران. بەمجۆرە جەنگ لەنێوان هەردوولادا هەڵگیرسا و سەرەنجام لەشكری عوسمانی و مەمالیك لە شەڕی(مەرج دابق) نزیك حەلەب لە ٢٢ / ئاب / ١٥١٦ز ڕووبەڕووی یەكتربوونەوەو لەئەنجامدا عوسمانییەكان سەركەوتن و دەسەڵاتیان بەسەر وڵاتی شامدا سەپاند.

پاش ئەم جەنگە سوڵتان سەلیمی یەكەم نامەیەكی بۆ(تۆمان بای) جێگری سوڵتانی مەمالیك لە میسر نارد و داوای لێكرد كە دان بەدەسەڵاتی عوسمانی دابنێ و بەناوی سوڵتانی عوسمانیەوە لەمیسر فەرمانڕەوایی بكات، بەڵام تۆمان ڕەتیكردەوەو سووربوو لەسەر بەرگریكردن ، هۆكاری ڕاستەقینەی ڕەتكردنەوەكەی بەهۆی هاندانی میرەكانی (میسر) بوو لەترسی ئەوەی نەوەكو (تۆمان بای) وەكو سوڵتانێك دەسەڵاتەكەی بەسەر (میسر)و میرەكانیدا بمێنێتەوە، وایان لێكرد كە ڕازی نەبێت بە دەسەڵاتی عوسمانی و دان بە عوسمانی یەكاندا لە میسردا نەنێت. بۆیە داواكەی سوڵتانی عوسمانی پەسەند نەكرد.لەبەرئەوە سوڵتان سەلیم بڕیاریدا پەلاماری میسر بدات، سەرەنجام لەشكری عوسمانی لەكانوونی دووەمی١٥١٧ز لەشەڕی(الریدانیە) سوپای تۆمان بای تێكشكاند و چوونە ناو شاری قاهیرەوە، ئەمەش بووە هۆی ڕووخان و نەمانی دەسەڵاتی مەمالیك لە میسرداو بەم شێوەیە میسر داگیركرا و بوو بە بەشێك لە دەوڵەتی عوسمانی.

كاتێك كە دەوڵەتی مەمالیك لەشام و میسر ڕووخا، ئیتر شتێكی ئاسایی بوو كە(حیجاز)یش بكەوێتە ژێردەستی دەوڵەتی عوسمانی، ئەوەبوو شەریف (بەرەكات) كە شەریفی مەككە بوو كوڕەكەی بە ناوی (ئەبونەمر)

نارد بۆ لای سوڵتان سەلیم لە قاهیرە بۆئەوەی  ملکەچی و گوێڕایەڵی خۆی بــۆ ســوڵتانی عوسمــانی ڕابگەیــەنێت ، ســوڵتان ســەلیمیش پێشــوازی لە(ئەبونەمر) کردو حـوکمڕانی حیجـازی بـە بـاوکی سپارد ئـەم پێسـپاردنە یارمەتی شەریف بەرەکاتی دا کەدەست ڕۆیشتنی شەریفەکان چۆن بـوو لـە کاتی مەمالیکدا بەم جۆرە بمێنێتەوە.

لە یەمەنیش سـوڵتان سـەلیم داوای لـە (ئەسـکەندەری چەرکەسـی)کـرد کــەوالی یەمــەن بــوو لــە ســەردەمی مەمالیکـدا ، کــە بــەناوی دەوڵــەتی عوسمانییەوە فەرمانڕەوایی لە یەمەندا بکات ، ئەسـکەندەری چەرکەسـیش ڕازی بوو ، وە دانی نا بە دەسەڵاتی عوسمانی لە یەمەن دا.

بــەڵام دەســەڵاتی عوسمانییــەکان لەیەمــەن جــێگیر نــەبوو، چــونکە یەمەنیەکان بەردەوام ڕووبەڕووی ئەو لەشکرانە دەبوونەوە کە سوڵتانەکانی عوسمـانی دەیاننـاردە سـەریان تاسـاڵی ١٥٣٨ز کـاتێ کـە عوسمانییـەکان عــەدەنیان داگیرکــردو دەرگــای گــەرووی (بــاب المنــدب)یــان بــەڕووی پورتوگالیەکانـدا داخسـت، بـەڵام عوسمانییـەکان نـەیانتوانی لـە ئاوەکـانی خۆرهەڵات (کەنداو) کارێکی لەو جۆرە بکەن، چونکە کەشـتیگەلەکانیان لـە بنکــە ســەرەکیەکانی خۆیــان لــەدەریای ناوەڕاســت دوورکەوتبوونــەوە، هــــەروەها بـــەهۆی ململانێیـــان لەگـــەڵ ئێرانیـــەکان کـــە هاوپـــەیمانی پورتوگالییــەکان بــوون، وێــڕای ئــەوەش عوسمانییــەکان ســاڵی ١٥٥٥ز دەسەڵاتیان گەیشتە بەحرەین.

## ٢ - داگیرکردنی عێراق لەلایەن دەوڵەتی عوسمانیەوە:

عێراق لەژێر دەسەلاتی سەفەوییەکاندا مابوەوە.بارودۆخی کۆمەلایـەتی و ئابووری و ڕۆشنبیری عێراق لەژێر دەسەلاتی سەفەویەکاندا ڕوو لـەخراپتر بوو، سولتان سلێمان قانونی ساڵی١٥٣٤ز بەبێ هیچ بەرەنگارییەك بەغدادی داگیر کرد و لەژێر دەسەلاتی سەفەویەکانی دەرهێنـا.هاوکـات(راشـد کـوڕی ئەلمەغامس)ی فەرمانڕەوای بەسرە ملکەچی خـۆی بـۆ سـولتانی عوسمـانی ڕاگەیانـد ، کەواتــە بەسـرەش بـە بـێ بـەرگریکردن چـووە ژێـر دەسـەلاتی دەوڵەتی عوسمانییەوە لەسـەردەمی سـولتان سـلێمانی قانوونیـداو بـوو بـە بەشێك لە دەوڵـەتی عوسمـانی و لەسـاڵی (١٥٤٦ز) بـەڕەسمی داگیرکردنـی بەسرە لە لایەن عوسمانییەکانـەوە ڕاگەیـەنرا. سـاڵی ١٦٢٣ز ، شاعەباسـی سـەفەوی تـوانی جـارێکی تـر بەغـدا داگیربکاتـەوە تاسـاڵی ١٦٣٨ز، بـەلام عوسمانییەکان بەسەرکردایەتی سولتان موڕادی چوارەم دەسـتیان گرتـەوە بەسەر بەغداد.

## ٣- داگیرکردنی ولاتانی خۆرئاوای عەرەبی لەلایەن عوسمانییەکانەوە:

بەشی خۆرئاوای عەرەبی هەر لەزووەوە ڕووبەڕووی هێرش و داگیرکاری ئەوروپاییـەکان ببـووەوە. هەرچـەندە هەنـدێك لەسـەرکردە دەریاییـەکانی عــەرەب وەك(عــروج) و (خــەیرەددین) ی بــرای بەربــەرەکانێی ئــەو داگیرکاریەیان کرد، بەلام نەیانتوانی ناوچەکە لە ئەوروپاییەکان ڕزگار بکەن، ئـەوە بـوو(عـروج) کـوژراو (خـەیرەدین)یـش داوای لـە عوسمانییـەکان کـرد هاوکاری بکەن. عوسمانییەکانیش بەهاوکاری گەلانی ناوچەکە توانیان یـەك لەدوای یـەك هەرێمـەکانی خۆرئـاوای عـەرەبی لەدەسـەلاتی ئەوروپاییـەکان

ڕزگاربکەن و دوای ڕزگارکردنی ناوچەکانیش دەسەڵاتی عوسمانییەکانی تێدا جێگیر دەبوو.




ساڵی١٥٥١ دوای دەرکردنی هێزەکانی(قەدیس یوحەننا) لەلایەن هێزی دەریایی عوسمانی ، لیبیا بوو بە بەشێك لەدەوڵەتی عوسمانی. ساڵی ١٥٧٤زیش تونس کەوتە ژێر دەستی عوسمانییەکان پاشانیش جەزائیر تا گەیشتنە سنووری مەراکیش (مەغریب). بەڵام دەسەڵاتی عوسمانییەکان لەهەردوو سەدەی هەژدەو نۆزدەدا لەخۆرئاوای عەرەبی بەرەو لاوازی دەچوو، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ویلایەتەکانی خۆرئاوای عەرەبی لە یەکترییەوەو لەپایتەختی دەوڵەتیشەوە دووربوون ، وێڕای لاوازیی ئەو ئامرازەی کە پێویستە بۆ دەوڵەتێك بیەوێ زاڵ بێت بەسەر ئەو ویلایەتانە ئەویش هێزی دەریاییە.

## * ڕەتکردنەوەی دەسەڵاتی عوسمانی لەلایەن عەرەبەکانەوە:

لەئەنجامی سیاسەتی خراپی عوسمانییەکان لەنیشتمانی عەرەبی دا لە نیوەی دووەمی سەدەی شازدەوە عەرەبەکان دەستیانکرد بە ڕاپەڕین و بەرگری لەبەرامبەر خراپەکارییەکانی عوسمانیدا. ئەم ڕاپەڕینانە لەسەدەی هەژدەدا گەیشتە ئاستێکی بالاتر و ڕووبەرێکی فراوانتری نیشتمانی عەرەبیشی گرتەوە.

عێراق یەکێك بوو لەبنکەکانی ئەم ڕاپەڕینانە، ڕاپەڕینەکەی عەبدولغەنی جەمیل موفتی کە لەبەغدا و دژی عوسمانییەکان سەریهەڵدا دیارترینی ئەو ڕاپەڕینانە بوو. خراپی باری ئابووری و سیاسی و کۆمەلایەتی لە عێراقدا لەدوای کەوتنی دەسەلاتی داود پاشاوە لەساڵی١٨٣١هۆکاری سەرەکی ڕاپەڕینەکە بوون.

لە ٢٨ئایاری ساڵی١٨٣٢خەڵکێکی زۆر لەدانیشتوانی بەغدا بەنیازی پەلاماردان ڕوویانکردە سەرا کەشوێنی نیشتەجێی والی عوسمانی بوو لە بەغدا، لەمەوە شەڕێکی گەرم لەنێوان خۆپیشاندەران و پاسەوانەکاندا ڕوویدا. والی عوسمانی توانی هێزەکانی خۆی کۆبکاتەوەو خۆپیشاندەران بلاوە پێبکات و زیانێکی زۆریشیان لەو گەڕەك و شوێنانەدا، کەخۆپیشاندەران و سەرکردەکانی ڕاپەڕین تێیدا کۆبوونەوە.

لە(لوبنان)یش چەند ڕاپەڕینێك ڕوویدا، گرنگترینیان ئەو ڕاپەڕینانە بوون کە لەسەدەی نۆزدەدا ڕوویداو بە(عامیات )ناسراوە.عامیات بەو بزووتنەوانە دەگوترا، کە گەل لەپێناو بەدیهێنانی مافەکانی دا لە دژی چەوسێنەران بەرپای دەکرد. یەکێك لەو ڕاپەڕینە گەلیانەش(عامیات ) بریتی بوو لەڕاپەڕینی گەلی ئەنتڵیاس بەهۆی ئەوەی کە والی عەککا عەبدوڵلا پاشا

داوای لەمیر بەشیری شەهابی کرد کە فەرمانڕەوای ناوچەی (جەبیل) بوو، تاپارەیەکی زۆری بۆ کۆبکاتەوە. لەئەنجامی ئەمەدا خەڵك پەیوەندیان بەدانیشتوانی گوندەکانەوە کرد، تا هەموو لەشاری ئەنتلیاس کۆببنەوە، لەکۆبوونەوەکەدا هەموو بەیەك دەنگ بڕیاریاندا، کە بەرەنگاری ئەم داواکارییە ببنەوە و ئامادەنەبوون ئەو بڕە پارەیە بدەن. ئەم ڕووبەڕووبونەوەیە لەساڵی١٨٥٠تا ١٨٥١ی خایاند. ساڵێك دوای ئەمە ڕاپەڕینێکی تر دژ بەمیر بەشیر و دەرەبەگەکان ڕوویدا، کە بە(عامیەی قین) ناسراوە. لە ساڵی ١٨٥٨یش دا لەناوچەی کەسرەوان جوتیاران دژی دەرەبەگەکان ڕاپەڕین، چونکە باجێکی زۆریان بەسەردا سەپاندبوون، ئەم ڕاپەڕینەش بە(عامیەی کەسرەوان) ناسراوە. لەسوریاش چەند ڕاپەڕینێك ڕوویدا لەوانە ڕاپەڕینەکانی ساڵی١٧٩٨لە دیمەشق و ساڵی١٨٨٦لە(جەبەل عەرەب)، هەروەها ڕاپەڕینی ساڵی١٨٩٩کە وەك نارەزایەتیەك لەبەرامبەر کاربەدەستانی عوسمانی سەری هەڵدا کاتێك دەیانویست چەند سەربازگەیەك لە(سوەیدا) دابمەزرێنن.

لەمیسریش یەکێك لەگەورە پیاوانی مەمالیك کە ناوی(عەلی بەگ) بوو توانی جاڕی سەربەخۆیی میسر بدات و دەوڵەتێکی بەهێز دروست بکات.

جگە لەمانە چەندین ڕاپەڕینی تریش لەتونس و لیبیا لەبەشی خۆرئاوای عەرەبیدا ڕوویدا.

# بەشی دووەم

## أ- پەیمانەکان و ڕێکەوتنەکانی عوسمانی - ئێرانی و پەیوەندییان بە گەلی کوردەوە:-

دەوڵەتی عوسمانی(تورکی ــ سوننە) و دەوڵەتی ئێرانی (فارسی ــ شیعە مەزهەب)، بە درێژایی مێژووی فەرمانڕەوایی یان بە تایبەتی لە سەدەی شانزەهەم داو بەهۆی فراوانبوونی دەسەڵاتیان لە ناوچەدا، بە بەردەوام کێشەو ناکۆکی گەورەو قوڵیان لە نێواندا هەبووە، ئەم کێشەو ناکۆکییانەش زۆربەی هەرە زۆری دەگەڕێتەوە بۆ چاوچنۆکی یان لەسەر ئەو خاکەی کە دەکەوێتە نێوان هەردوو کیانەوە، کە ئەوەش بریتی بوو لە کوردستان کە لە دوور و نزیکەوە هیچ پەیوەندییەکی بەسەر هیچ لایەکیانەوە نەبووە و نەتەوەیەکی خۆی تیا ژیاوە کە ئەویش (کوردە)، بەڵام ئەم دوو دەوڵەتە عوسمانی و سەفەوی بەهەر شێوەو نرخێك بووبێت ویستوویانە داگیری بکەن و ئەو سەربەخۆییەی کە لەو کاتەدا میرنشینە کوردییەکان هەیان بووە هەریەکەیان لە ناوچەی تایبەتی خۆی دا لەناوی ببەن و بیخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە. بۆیە زۆر جار ئەگەر میرنشینێك دەسەڵاتی بەرەو بەهێزی ڕۆیشتبێت مەترسی یان لێ نیشتووەو پیلانی تایبەتی یان بۆ دارشتووە بۆ لاوازکردن و لە ناوبردنی ئەو هێزو دەسەڵاتەی کە پەیدای کردووە، ئەگەر بە هاوکاریش نەبووبێت، یەك لە دوای یەك هێرشیان بۆ کردووەو لاوازیان کردووە، وەك ئەوەی کە کردیان بۆ سەر میرنشینی سۆران و بابان یەك لەدوای یەك بە مەبەستی لاواز بوونی سوپا بەهێزەکانیان.

لەبەر ئەوە زۆر جار دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی ویستوویانە قەڵەمڕەوی خۆیان زیاد بکەن لەسەر سنووری کوردستان، هەرچەندە زۆر جار ئەم ناکۆکییانەی نێوانیان بە شەڕ کۆتایی هاتووە، وەك شەڕی چاڵدێران، بەڵام هەندێك کاتیش بەهۆی ڕێکەوتننامە و دابەشکردنی کوردستان لە نێوانیان دا کۆتایی هاتووە.

بۆ ئەوەی زیاتر ئاشکرا بێت لامان وا لە خوارەوە چەند ڕێکەوتنێکی نێوان عوسمانی ـ ئێرانی دەخەینە ڕوو لەگەڵ ئەو کاریگەرییەی کە لەسەر کوردستان هەیان بووە لەو ڕێکەوتنامانەی نێوانیشیان وەك:-

## یەکەم:- ڕێکەوتنامەی ئەماسیەساڵی (١٥٥٥) ز:-

جەنگەکانی بیست ساڵەی نێوان سوڵتان سلێمانی قانوونی عوسمانی و شا تەهماسپی سەفەوی بە زنجیرەیەکی گرنگی شەڕەکانی ئەم دوو دەوڵەتە دادەنرێت کە زۆربەی لەسەر زەوی کوردستان ڕووی داو بەشێکی گەورەی قوربانییەکانیشی زۆر و گەورە بوون و ، کوڕی خێڵە کوردەکانی ژێردەستی هەردوو لایان بوون.

سوڵتان سلێمانی قانوونی ساڵی (١٥٥٤)ز هێرشی کردە سەر ئێران و توانی تەورێزو ئەسفەهانیش داگیر بکات.

ئینجا شا (تەهماسب)ی سەفەوی ناچار بوو پایتەختی سەفەوی لە تەورێزەوە بگوێزێتەوە بۆ قەزوین، تا لە دەست هەڕەشەی عوسمانی ڕزگاری بێت و پاشان وەفدێکی نارد بۆ لای سوڵتانی عوسمانی و داوای ئاشتی و ڕێکەوتنی کرد، سەرەنجام لە ٢٩/ مایس/١٥٥٥دا لە شاری ئەماسیە لە ناوەڕاستی ئەنادۆل یەکەمین ڕێکەوتنامەی ئاشتی نێوان

عوسمانی و سەفەوی مۆرکرا ناوی ڕێکەوتنامەی ئەماسیە لێ نرا کە تیایدا پێی لەسەر سێ خاڵی گرنگ دا گرت کە ئەمانە بوون:-

١- گێڕانەوەی ویلایەتی قارس و قەڵای قارس کە لە ژێر دەستی سەفەوی دا بوو، بۆ ژێر دەسەڵاتی عوسمانی.

٢- دیاریکردنی سنوری ویلایەتی شارەزوور کە کێشەو هەرایەکی زوری لەسەر بوو لە نێوان هەردوو دەوڵەتدا (عوسمانی و سەفەوی).

٣- دابینکردنی سەلامەتی حاجی و گەشتیارە ئێرانییەکان، لەلایەن عوسمانییەکانەوە. کە دەهاتن بۆ زیارەتی ئیمامەکانی شیعە لە عێراقدا.

## دووەم:- ڕێکەوتنامەی زەهاو ( پەیمانی ڕێکخستنی سنوور ) ( ١٦٣٩ ) ز:-

ئەم ڕێکەوتنامەیە لە ١٧/مایس/١٦٣٩ لە نێوان سوڵتان موورادی چوارەم و شا صفی ئێرانی دا لەشاری زەهاو(سەرپیل زەهاب) نزیك قەسری شیرین لە ڕۆژهەلاتی کوردستان بەستراو بە پێی ئەم ڕێکەوتنامەیە جەنگی درێژخایەنی نێوان عوسمانی و سەفەوی کۆتایی هات.

ئەگەر سەرنج بدەین لەم ڕێکەوتننامەیەی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی بۆمان دەردەکەوێت کە:

ئەم ڕێکەوتنامەیە لەناو خاکی کوردستاندا مۆر کراوەو لەلایەکی تریشەوە، یەکەمین دابەشکردنی خاکی کوردستان بوو بە ڕەسمی لە نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی داو، هەروەها تەواوی بەندەکانی ئەم ڕێکەوتننامەیەو نەهیچ ڕێکەوتننامەکانی تر، کە لە سەر چارەنووس و

دابەشکردنی خاکی کوردستان دەبەستران و مۆر دەکران، نە بە ئاگاداری کوردو نە هیچ نوێنەرێکی کوردی یان تێدا بەشدار نەبووە.

بە پێی بەندەکانی ئەم ڕێکەوتننامەیە کوردستان بەم شێوەیەی لێ دێت لە نێوانیاندا کە ئەم بەندانە لە گرنگترین بەندەکانی ئەم ڕێکەوتننامەیە بوون:-

١- ئەم ناوچانە دەکەونە نێو سنوری دەوڵەتی عوسمانی: (بەدرە، جەسان، مەندەلی، درنە، سەرپیل و، ئەو گوندانەی کە دەکەونە نێوان قەڵای زنجیر تا قەڵای زەڵم لە شارەزوورو هەموو شاخەکانی دەووروبەری ئەم قەڵایە تا ئەو دەروازەیەی بۆ شارەزوور دەڕواو خاڵی سنوری هەردوو دەوڵەت پێک دێنێ، سەرەڕای قەڵای قزڵجە و دەوروبەری).

٢- دەبێ حکومەتی ئێران دەست وەرنەدات و خۆی نەدا لە قەرەی هەموو ئەو قەڵاو زەوییانەی دەکەونە سنوری قارس و وان و شارەزوور و ئەو قەڵایانەی دیکە کە سنوری عوسمانی دەپارێزن.

٣- دەبێ حکومەتی ئێران دەست لە جنێودان بە خەلیفەکانی راشدین و ئەسحابەکان هەڵبگرێت.

٤- ئەو قەڵایانەی دەکەونە ئەو بەرەوە لە نێوان مەندەلی و دەرتنک و شوێنەکانی: بیرە، یەکە، زومرودهاوا،و گوندو قەڵاکانی رۆژهەڵاتی قەڵای زنجیر و مەریوان و دەوروبەریان بۆ ئێرانن و، نابێ دەوڵەتی عوسمانی دەست لە کاروباریان وەربدات.

٥- هەردوو تیرەی (پیرە)و (زەردووی) عەشیرەتی جاف سەر بە ئێران دەمێننەوە.

٦- ڕووخانـدنی قـەڵای زنجـیر و هـەردوو قـەڵای قوتـور و مـاکۆ دەکەونـە سەرووی (وان) و قەڵای (موغاز برد) دەکەوێتە ناوچەی قارس.

٧- هەردوو دەوڵەت دەست لە کاروباری یەکدی وەرنەدەن.


Source: d' apres HASSANPOUR, A., Nationalisme and Language in Kurdistan 1918- 1985, U. S. A, 1992, p. 54.
دابەشبوونی کوردستان بە گوێرەی پەیماننامەی زەهاوی ١٦٣٩.

ئەم پەیمانە توانی بۆ نزیکەی هەشتا ساڵ جەنگ و کوشتاری نێوان هەردوو دەوڵەتی (عوسمانی و ئێرانی) ڕابگرێت.

ئەگەر بە وردی سەرنج لەو ڕێکەوتننامەیە بدەین، بۆمان دەردەکەوێت کە کاریگەری لەسەر کوردستان زۆر هەبووە ئەویش سەرەڕای دابەشکردنی کوردستان لەنێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی دا، کە بە یەکەم دابەشکردنی ڕەسمی کوردستان دادەنرێت لە نێوانیاندا.

ئەم پەیمانە دیسانەوە هەر لە یەکەم ڕۆژی مۆرکردنەکەیەوە، هەردوو دەوڵەت هاریکاری دەکەن دژی هەموو جووڵانەوەیەکی ڕزگاریخوازی کورد لە کوردستاندا ئەگەر ڕووی دا لەپێناوی سەربەخۆیی دا.

له دوای ئەم رێکەوتنامەیە ئیتر عوسمانییەکان ترسیان لە سەفەوییەکان نەماو، و هەروەها ئیشـــــیان بە هەمان شێوەش بـە کـورد نـەما، کەوتنـە چەسپاندنی سیاسەتی مەرکەزی لە کوردستاندا و بە پێچەوانەی هەموو ئـەو بـەڵێن و گفتانـەی کـە دابوویـان بـە میرنشـینە کوردییـەکان و وردە وردە کەوتنـە لاوازکـردن و پاککردنـەوە و داگیرکردنـی کوردسـتان و نەهێشـتنی دەسەڵاتی میرنشینە کوردییەکان.

## سـێیەم :- رێکەوتننامـەی ئـەرزرۆمی یەکـەم ( ١٨٢٣ ) و کاریگـەری و پەیوەندی بە کوردەوە :-

کێشەو شەڕی لە مێژینـەی نێـوان عوسمـانی و ئێرانـی سـاڵانێکی زۆری خایاند، سەرەنجام هەردوو دەوڵەتەکەی بە قەناعەت گەیاند کـە واز لەشـەڕ بهێنن و پێکەوە رێك بکـەون، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش گفتوگۆیـەك لـە شـاری (ئەرزرۆم) لە باکووری کوردستان لە نێـوان نوێنـەرانی هـەردوو لادا دەسـتی پێکردو رێکەوتنێکی لێ کەوتەوە لە ٢٨/تەمموز/١٨٢٣داو ئیمزا کرا، کە بـە رێکەوتننامەی ئەرزرۆمی یەکەم ناودەبرێت، ئـەم رێکەوتنامەیـە بـووە هـۆی ئاشتی لە نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانیدا.

ناوەرۆکی ئـەم پەیمانـە دەریخسـت کـە کێشـەی نێوانیـان کوردسـتانە، چـونکە لـە گـرنگترین باسـەکانی ئـەو دوو دەوڵەتـە بـووە واتـە کوردسـتان مەسـەلەو باسـی گرنگـی رێکەوتننامەکـە بـوو لـە نێـوان هـەردوو دەوڵـەتی عوسمانی و ئێرانی.

بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییەش، ئەوە کە لە حەوت ماددەی ڕێکەوتنەکە سێ ماددەیان پەیوەندی بە کوردستانەوە هەبوو،کە ئەوانیش ماددەی یەکەم و ماددەی دووەم و ماددەی سێیەم بوو، کە بریتین لە:—

**ماددەی یەکەم:—** نابێ ئەم دوو دەوڵەتە دەست لە کاروباری یەکتر وەربدەن، ئێران نابێت دەست وەربداتە ناو کاروباری کوردەکانی ویلایەتی شارەزوور، کە دەوڵەتی عوسمانی بە بەشێك لە ویلایەتەکانی خۆی دەناسێ، لەوانە:—

ناوەندو سنجاقەکانی کوردستان کە کەوتوونەتە ناو سنوورەوە بە هیچ شێوەیەك و لەهەر ڕوویەکەوە، دەوڵەتی ئێرانی نابێ ڕێگە بە دەست تێوەردان بدات.

**ماددەی دووەم :—** هەردوولا (عوسمانی و ئێرانی) لەسەر ئەوە ڕێکەوتن کە ڕاکردووەکانی یەکتری پەنا نەدەن و پشتیوانییان لێ نەکەن و سەبارەت بە عەشیرەتەکانیش هەر بەو شێوەیە ڕەفتار بکەن.

**ماددەی سێیەم:—** پەیوەندی بە عەشایری کوردی (حەیدەرانلو) و (سیبیکی)یەوە هەیە، کە بوون بەهۆی سازدانی شەڕ لە نێوان هەردوو دەوڵەتداو ئیستا لە وڵاتی عوسمانی دا نیشتەجێبوون، دەوڵەتی عوسمانی بەپێی ئەم ڕێکەوتنامەیە بەڵێن دەدات پێش لە هێرشی ئەو عەشیرەتانە (حەیدەرانلو)و (سیبیکی) بۆ ناو خاکی ئێران بگرێت.

**مادەکانی تری ئەم ڕێکەوتنامەیە بە کورتی ئەمانەن:**

**ماددەی چوارەم:—** هیچ دەوڵەتێك باوەش بۆ هەڵاتووانی ئەوی دیکە ناکاتەوە.

**ماددەی پێنجەم:**- ڕێکەوتنامەکە کاروباری بازرگانیشی بەخۆ وەگرتووە.

**ماددەی شەشەم:**- سامانە بەجێ هێڵراوەکانی ئێرانییەکان لە دەوڵەتی عوسمانی دا بۆ خاوەن واریسە شەرعییەکان دەگەڕێتەوە.

**ماددەی حەوتەم:**- ڕێکەوتنی هەردوو لا (عوسمانی و ئێرانی) بۆ گۆڕینی باڵیوزەکانیان هەر سێ ساڵ جارێك.

ڕێکەوتنامەی ئەرزرۆمی یەکەم نەیتوانی وەکو پێویست چارەسەری کێشەکانی سنوری (عوسمانی و ئێرانی) بکات، چونکە کێشەکانی ئەم دوو دەوڵەتە پەیوەندیان بە سنووری وڵاتی سێیەمەوە هەیە کە هەردووکیان بەبێ هیچ لەبەرچاوگرتنی جوگرافی و تەکنیکی و ئەخلاقیش لە ناو خۆیاندا دابەشیان کردبوو کە ئەو وڵاتەش ((کوردستانە)).

هەر بۆیە لەناو کێشەی پەیوەندییەکانی سنووری هەردوو دەوڵەتدا(عوسمانی ــ ئێرانی) کێشەی سنووری وڵاتێکی بێ سنوور بەر چاو دەکەوێت کە لە ناو ئەم کێشەیەدا شاردراوەتەوە.

کێشەکانی سنووری عوسمانی ئێرانی و دواتر ئێرانی عێراقی و هەروا عێراقی تورکی ، هیچ ڕۆژێك ناتوانن ئارامی بە خۆیانەوە ببینن ، چونکە بە نارەوا بە ناو کوردستاندا ڕەتبوون و هیچ هەڵکەوتەیەکی نەتەوەیی کوردییان لەبەر چاو نەگرتووە.

هەردوو دەوڵەت بە پێی ڕێکەوتنامەکە باش لەوە حاڵی بووبوون کە کوردەکان کۆسپی سەرەکی سەر ڕێگای ئەو دوو دەوڵەتەن و دەبوایە کێشەی کوردەکان لەکۆڵ خۆیان بکەنەوە.بۆ ئەم مەبەستە دوو ڕێگایان لەبەردەم بوو:-

**یەکەمیان:-** بە گوێرەی ڕێکەوتنامەکە ڕێگری لە عەشیرەتە کوردەکانی سەر سنوور بکرێ بە هەموو توانایەکەوە بۆ سنووری ئەو دوو دەوڵەتە بپڕن، لە ناوبردنی هەرچەشنە بزووتنەوەو جووڵانەوەیەکی کوردەکان کە لەوانەیە سەرهەڵبدەن.

**دووەمیان:-** کۆتایی بە دەسەڵاتدارێتی میر و بەگە کوردەکان لە ناوخۆی وڵاتەکانیان بهێنن.

بڕیاری ڕێکەوتننامەی ئەرزرۆمی یەکەم سیاسەتێکی تازە دارێژراوی عوسمانی و ئێرانی بوو کە بە ڕەزامەندی دوو هێزی گەورەی جیهانی ڕووسیاو ئینگلیز دەرهەق بە کوردەکان بەڕێوە دەچوو، ئەو بڕیارە لە بنەڕەتدا دەست پێکردنی سەرکوتی نەتەوەیی کورد بوو، لە هەردوو پارچەی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی و ئێرانی دا بوو.

ئیتر پەیوەندی کوردەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر کەوتنە تەنگژەی ژیان و سەربەستی ناوچەیی یان لێ تێك چوو، قۆناغێکی تر کە بریتی بوو لە سەرەتای دەست پێکردنی ستەمی هەمە لایەنی نەتەوەیی ڕووی تێکردن و دەستی پێکرد.

## چوارەم - ڕێکەوتنامەی ئەرزرۆمی دووەم (١٨٤٧ز)و پەیوەندی بە گەلی کوردەوە:

ڕێکەوتننامەی ئەرزرۆمی یەکەم (١٨٢٣)ز دا گیانی گفتوگۆ و لە یەك گەیشتن و هاوکاری لە نێوان عوسمانی و ئێران دا دامەزراند بوو، ڕێگای بۆ هەردوولا خۆشکردبوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەو ناکۆکییەکانیان، کە ئیتر لەمەودوا پەنا بۆ شەڕ نەبەن و، ڕێگاچارەی سیاسیان بۆ بدۆزنەوە.

بەو حاڵەش زۆر کێشەی چارەسەر نەکراو مابوو کە ئاگری شەڕو کێشەی کۆن و درێژخایەن لەبن سەریاندا بوو کە هەمووی کۆبووبـووەوە. سـەرەڕای جاربەجارێ ئەو ناکۆکیانە دەبوونە هۆی پێکدادان و بەردەوام دەبوون وەك ئەوەی ساڵی (١٨٣٧)ز عەلی ڕەزا پاشای والی بەغـداد شـاری موحەممـەرە (خورەمشەهر)ی داگیر کرد و ، ئێرانییەکانیش لە سـاڵی (١٨٤٢)ز دا شـاری (کەربەلا)یان داگیر کرد.

ئەم شـەڕانەش لـەوەوە ڕوویـان دا کـە دیـاری نـەبوونی هێڵـی سـنووری نێوانیـان و سـكاڵای زیارەتكـەرانی كەربـەلاو نەجـەف كـە لـە لایـەن عوسمانییەکانەوە ئازاردرا بوون و سەرەڕای ناکۆکی لەسەر شـارو بەنـدەری (موحەممەرە) دەستی پێ کرد.

هەرچەند کات بەرەو پـێش دەڕۆیشـت و، دەسـت تێـوەردانی ڕووسـیا و ئینگلیز لەنێوان ئێران و عوسمانی زیـاتر دەبـوو، سـەرەڕای ئـەوەی ئەگـەر ئـەو دەوڵەتـە گەورانـەی ڕووسـیا و ئینگلیـز نەبوونایـە لـە سـاڵی (١٨٤٢)ز لەکاتی داگیرکردنەکەی کەربـەلا دا لەلایـەن ئێرانییەکانـەوە، ئـەوا شـەڕێکی زۆر گـەورەو خوێنـاوی لـە نێوانیـان دا (عوسمـانی و ئێرانـی) ڕووی دەداو، ڕووسـیا و بـەریتانیا لەبـەر پاراسـتنی بەرژەوەندییـەکانی خۆیـان لـە ڕووی ئابوورییەوە و هەریەکە لەڕووی فراوانبوونی دەسەڵاتی ئـەوی تـر، ناوبـژیان کردن.

گفتوگۆکردن جارێکی تر لە شاری ئەرزرۆم دەستی پێ کردەوە لە نێوان نوێنەرانی عوسمانی و ئێرانی بە چـاودێری ئینگلیـزو ڕووسـیا. لیژنەیـەکیان پێك هێنا کە لە نوێنەرانی ئەو چوار دەوڵەتە پێك هاتبوو کە بریتی بوون لـە

نوێنــەرانی عوسمــانی، ئێرانــی، ئینگلیـزو ڕووسـیا و ئــەم لیژنەیــە بــەناوی لیژنەی تێکەڵاو ناسرا.

دوای گفتوگۆی زۆر توانرا کـە ڕێکەوتننامەیـەك لـە شـاری ئـەرزڕۆم مـۆر بکەن بەناوی ڕێکەوتننامەی ئەرزڕۆمی دووەم لەساڵی (١٨٤٧ز) دا.

بەگوێرەی ئەم ڕێکەوتنامەیە هەردوو دەوڵەتی عوسمـانی و ئێرانـی سـاز شێکیان بە کوردسـتان کـردو جـارێکی تـریش کوردسـتان لـەنێوان خۆیانـدا دابەشیان کردەوە.

ئەم ڕێکەوتنامەیە لە ((نۆ)) ماددە پێکهاتووە،کە دیسانەوە زۆرترین لـە ماددەکانی پەیوەندییان بەکوردەوە هەیە کـە بـریتی بـوون لـە ماددەکـانی: دووەم، سێیەم، پێنجەم، هەشتەم کە تیایانـدا هەریەکـەیان لەسـەر جۆرێـك دەدوێت وەك:

**ماددەی دووەم**:- دەوڵەتی ئێرانی بەڵێن دەدات دەست لە دەشتەکانی بەشـی ڕۆژئـاوای زەهـاو هـەڵبگرێت بـۆ دەوڵـەتی عوسمـانی، وە دەوڵـەتی عوسمـانیش بەهــەمان شـێوە بــەڵێن دەدات دەسـت لەبەشــی ڕۆژهــەڵاتی ناوچەی زەهاو هەڵدەگرێت بـۆ ئێـران.واتـە:هـەموو زەوییـە شـاخاوییەکانی ناوچەی زەهاو لەگەڵ (دۆڵی کرند) بۆ دەوڵەتی ئێران.

هەروەها ئێران بەگەرمی پەیمان دەدات کەواز لـە هـەموو خواسـتەکانی خۆی بهێنێ لەبەرامبەر شـار و ناوچـەی سـلێمانی و هـیچ کاتێـك و بـە هـیچ شێوەیەك دەست نەخاتە ناو سـەروەرێتی دەوڵـەتی عوسمانییـەوە کـە لـەو ناوچانەدا هەیەتی.

**ماددەی سێیەم:**- هەردوو لا بە بێ پشت گوێخستن کەسانی تایبەت و پسپۆڕ لە ئەندازیاران دەست نیشان دەکەن بۆ ئەوەی بەپێی ماددەی دووەم سنووری هەردوولا دەست نیشان بکەن.

**ماددەی پێنجەم:**- هەردوو دەوڵەتی عوسمانی ئێرانی بەڵێن دەدەن کە بە پێی ڕێکەوتننامەی ئەرزرۆمی یەکەم گشت پەنابەرەکانیان بدەنەوە بە یەکتری.

**ماددەی هەشتەم:**- هەردوو دەوڵەت بەڵێنیان دا بۆ ڕێگرتن لە دزی و جەردەیی، بۆ ئەم مەبەستەش ڕێوشوێنی پێویست دابنرێت.




Source: d' apres: Robert Olson., The kurdish Question and Turkish- Iranian Relations From World War I to 1998, Mazda Publishers, U. S. A, 1998.

دابەشبوونی کوردستان لە نێوان ئیمپراتۆریای عوسمانی و فارسی
بەگوێرەی پەیماننامەکانی زەهاو ١٦٣٩، کوردان ١٧٤٦، ئەرزەرۆمی یەکەم
١٨٢٣ و ئەرزەرۆمی دووەم ١٨٤٧

سەرەڕای مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی ئەرزڕۆمی دووەم لە(١٨٤٧)ز دا شەڕو کێشەی سنوور هەر درێژەی هەبوو، تا دوا جار ئینگلیز و ڕووس هەڕەشەیان لەو دەوڵەتە دەکرد کە حورمەت و ڕێزی سنوور دەشکێنێ، بەشێوەیەك کە هەر لایەك ئەگەر ڕێزی سنووری لایەنەکەی (دەوڵەتەکەی) تر نەگرێت ئەوا ئینگلیز و ڕووس دەچنە پاڵ لایەنەکەی ترو، هەموو یارمەتییەکی پێشکەش دەکەن، دژی لایەنەکەی تر.

بەم شێوەیە ڕێکەوتنامەی ئەرزڕۆمی دووەم لەساڵی (١٨٤٧)ز کۆتایی بە فەرمانڕەوایی ناوخۆی کورد هێناو، لە ساڵی(١٨٤٩)ز بە دواوە، ناوچەی شارەزوور ڕاستەوخۆ بەسترایەوە بە ئەستەمبوڵ و، دوای جەنگی یەکەمی جیهانیش تا ئەمڕۆ وەکو میراتێکی ناڕەوا بۆ دەوڵەتی ناسیونالیستی عێراقی عەرەبی ماوەتەوە. لەدوای ڕێکەوتنامەی ئەرزڕۆمی دووەم دا، تا ڕادەیەکی باش ئاشتی لەنێوان عوسمانی و ئێرانی چەسپا و ناکۆکییەکانیان تاڕادەیەك کەم بوونەوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە ئەم ڕێکەوتننامەیەی بە چاودێری هەردوو دەوڵەتی ئینگلیز و ڕوسیا بوو کە تا ڕادەیەکی زۆر هەردوو لایان پابەند بوون پێوەی.

ئەمەش وایکرد کە عوسمانییەکان مەترسییەکانیان کەم بێتەوە لەو دەسەڵاتەی ئێران، وە هەروەها دەوڵەتی عوسمانیش ئیشی بە کورد نەما و لەو بەڵێنانەی دابووی پەشیمان بووەوە.

**ب- کوردستان لە ڕووی (کارگێڕی، ڕامیاری، کۆمەلایەتی، ئابووری) یەوە لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا:-**

*** کوردستان لە ڕووی کارگێڕییەوە :-**

دەوڵەتی عوسمانی لەڕووی کارگێڕی یەوە هەندێك گۆڕانکاری کردو بە تایبەتی لە دوای چاکسازییەکانی سوڵتان (مەحمودی دووەم)ناوچە کورد نشینەکان ڕاستەوخۆ خرانە ژێر دەسەڵاتی ناوەند و عوسمانییەکان خۆیان بەڕێوەیان دەبرد و والییان بۆ ناوچە کوردنشینەکان دادەنا.

یەکێك لە والی یە دڵسوزەکانی دەوڵەتی عوسمانی کە ئەویش مەدحەت پاشا بوو لە ساڵی (١٨٦٩ـــ١٨٧٢) هەوڵێکی باشی دا بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتی مەرکەزیەت وبەستنەوەی ویلایەتەکانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی بە ئەستامبوڵ (ناوەندەوە-پایتەخت)لە هەموو ناوچەکاندا بە کوردستانیشەوە لەبەر ئەوە هەموو هەوڵەکانی خۆی خستەگەڕ بۆ ئەم مەبەستەو چەند هەنگاوێکی بۆ نا، لەوانە:

هەولێدا دەرەبەگەگان و سەرکردەکان بە لای خۆی دا ڕابکێشێ، بۆ ئەم مەبەستەش هەندێك لە زەوی دەوڵەتی پێ فرۆشتن و چەندین چاکسازی لە بوارەکانی ئاودێری و ئاوەدانکردنەوە جێبەجێ کردو هەوڵی پەرەپێدانی پەروەردەیی بە کردنەوەی قوتابخانەو ئاسانکردنی ڕێگاو بانی هاتوچۆو، هەوڵی چاککردنی کۆمەلایەتی تاڕادەیەك بەئەنجام گەیاند.

دوا کاری مەدحەت پاشا ڕێکخستنی کارگێڕی بۆ ئەو ناوچەیەی ئەمڕۆ بە کوردستانی باشوور ناودەبرێت، ناونرا (ویلایەتی موسڵ) ئەم ویلایەتەش کرا بەسێ سەنجەقەوە کە بریتی بوون لە:

١- سەنجەقی ناوەند (موسڵ) کەبریتی بوو لە قەزاکانی:
(دهۆك، زاخۆ، ئامێدی، شەنگال، ئاکرێ)

٢- سەنجەقی کەرکووك کە بریتی بوو لە قەزاکانی:
(هەولێر، ڕانیە، ڕەواندز، کۆیە، کفری)

٣- سەنجەقی سلێمانی کە بریتی بوو لە قەزاکانی:
(بازیان، هەڵەبجە، شارەزوور، مەرگە)

پاش داگیرکردنی کوردستانی باشوور لەلایەن ئینگلیزەوە لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم، ویلایەتی موسڵ بەهەمان شێوەی ڕێکخستنی کارگێڕی پێشووەوە کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیز و، پاشان کەوتە ناو چوار چێوەی سنووری عێراقی عەرەبی لە ساڵی(١٩٢٢)ز دوا تریش سەنجەقەکان بوون بە لیواو، پاشان لیواکانیش بوون بە پارێزگا.

*** کوردستان لە ڕووی ڕامیارییەوە:-**

لە ڕووی پەیوەندی ڕامیاییەوە، بەشێکی زۆرو گەورەی هەرێمە ڕۆژهەڵاتییەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی، بەناو لەژێر دەسەڵاتی سوڵتانی عوسمانی دابوون.

لەئەنجامی ئەو بارودۆخەی کە لە کوردستان دروست بوو، میرەکوردەکان، ئەوانەی سەدەها ساڵ خاوەن میرنشین بوون، هەولیان دا جێ پێی خۆیان بچەسپێنن.

کاتێك سوڵتانی عوسمانی دانی نا بە مافی میرنشینە دەرەبەگی یە کوردیەکانداو بوونە لایەنگری سوڵتان، ئەو دانپێدانانە سروشتێکی دەرەبەگی هەبوو، کەم و زۆر دەستکاری مافی میری میرنشینە کوردییەکانی لە هەرێمەکانی ژێر دەستیاندا نەدەکرد.

له سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم دا چەند میرنشینێکی گەورەی کوردی لە کوردستاندا پەیدابوون، لە خوارەوە لە هەرێمی سلێمانی و شارەزوور میرنشینی بابان هەبوو.

لە باکووریشەوە میرنشینی سۆران کە ناوچەیەکی زۆر فراوان و گەورەی گرتبووەوە کە زیاتر پارێزگای هەولێری ئێستای دەگرتەوە.

لە رۆژئاوای سۆرانیشەوە میرنشینی بادینان هەبوو کە پایتەختەکەی ئامێدی بوو.

لە ژوورووی میرنشینی سۆرانەوە لە ناوچە شاخاوییەکاندا میرنشینی (هەکاری) هەبوو.

وە لە رۆژئاوای هەکاری و بادیناندا میرنشینی بۆتان هەبوو، کە پایتەختەکەی جزیرە بوو، کە لە زۆر کۆنەوە ناوی دەرکردبوو.

## * کوردستان لە رووی کۆمەڵایەتییەوە:-

ئەستەمبوڵ کاتێك هەوڵیدا سنووری هەرێمەکانی لە رووی بەڕێوەبردنەوە فراوانتر بکات، نیازی ئەوە بوو کاریگەری بەڕێوەبردن زیاتر بەسەریاندا بسەپێنێ، سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵ و کوششەی ئەستەمبوڵ لە و رووەوە دای، بەڵام سروشت و ناوەرۆکی رژێمی بەڕێوەبردن تا رادەیەکی زۆر بە دەست دەرەبەگەکانەوە بوو سەرەڕای ئەوەی کە لە ماوەی(تەنزیماتەکەدا) واتە رێکخستنەکەدا چەند چاکسازیەکی بەڕێوبەرایەتی(کارگێری)کرا،دوایساڵی(١٨٦٤)ز شتێکی نوێ یاخود یەکێتییەکی کارگێری گەورەتر لە شوێنی ئەیالەت دانرا کە ئەویش (ویلایەت)بوو، ئەویش لە چەند ئەیالەتێك پێك هاتبوو.

لە دۆخێکی وەهادا هەر جۆرە چاکسازییەك بارودۆخەکەی هێندەی تر دەشێواند و شپرزە تری دەکرد، چونکە هێنانەدی ئەو چاکسازییانە بەدەست ئەو کاربەدەستانەوە بوو، کەهەر ئەوەندەی کاریان دەگرتە دەست وایان دەکرد سنووری یەکە کارگێڕییەکان گۆڕانیان بەسەردا بێت، هەمیشە یەکە کارگێڕییەکان لە گەڵ هاتنی هەموو پاشایەکی نوێ دا لەگۆڕان دا بوو، ئەم گۆڕانەش کەم و زۆر لەسەر ڕادەی پشت ئەستووری و نزیکی پاشاکە لە کۆشکی سوڵتانەوە وەستابوو.

لەناوچە دوورە پەرێزو شوێنە گۆشەگیرەکاندا، وەك نوێنەرانی کاربەدەستانی مەرکەزی دەسەلاتیان بەدەستەوە بوو، وەهاش دەرەبەگە کوردەکان خاوەن دەسەڵات بوون، ئەم جووتە بارە لەو ڕۆژەدا کە لە دۆخێکی پڕ ئاژاوە و پاشاگەردانی و بێ یاسایی دا، تەواو پەرەی سەندبوو، لە دۆخێکی وادا هەموو شتێك بەدەست دەرەبەگە کوردەکانەوە بوو، بوو بووە ئەرك و بارێکی تەواو قورس و گران بەسەر جوتیارە هەژارەکانەوە.

لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا ئەو جۆری خاوەن موڵکایەتییە دەرەبەگییەی جاران نەما، واتە ئەو دەرەبەگانەی لە ئەنجامی خزمەتی بەشداری شەڕی یان زەوی یان پێ دەبەخشرا، لە جێگەی ئەوان خاوەن زەوی و زارە نیوە دەرەبەگییەکان هاتە کایەوە، لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم دا بەشێوەیەکی ڕەسمی و یاسایی ڕژێمی زەوی و زار بەخشینی جەنگی کۆتایی پێ هات و خاوەن موڵکە نوێیەکان جێیان گرتنەوە.

ئەو میرە کوردانەی سوودیان لە مافی دەرەبەگایەتی وەرگرتبوو دەستیان بەسەر زەوی و زارێکی بەر فراوان داگرت، ئەو زەوی و زارانەی

سولّتان پیّی بەخشیبوون ئەو مافانەیان بۆ نەوەکانی خۆیان بەجیّ هیّشت و چەسپاندیان.

لەم بارودۆخەدا ئەو میرانـە هـەولّیان دا سـنووری مولّکـەکانیان فـراوانتر بکەن و خۆشیان زیاتر سەربەخۆ بنوێنن.

دەســـەلاّتی ســـولّتان گەیشـــتە ئـــەوەی هـــەر بەســـەر زاری بیّـــت و دەسەلاّتەکەی هاتە سەر ئەوەی بریتی بیّت لەوەی مـیرە کوردەکـان دیـاری بۆ بنیّرن و جار و باریش بە ڕەزامەندی خۆیان هیّزیّکی  چەکدار بۆ ئەم یان بۆ ئەو سوپای تورك بنیّرن.

شەڕو هەراو دووبەرەکی و دەستدریّژی کردنە سـەر یـەکتری کوردەکـانی زیاتر لەیەك ئـەکرد و دوور دەخسـتەوە.دام و دەزگـای سـولّتانی عوسمـانی سوودی لەم دووبەرەکی یە دەدی و ئەوەندەی تر ئـاگری دووبەرەکییەکـەی نێـوان عەشـیرەتە کوردەکـانی خـۆش دەکـرد، هـەر لـەڕێی ئەمەشـەوە ئەستەمبولّ دەیتوانی دەسەلاّت و فەرمانڕەواییـە سـەرزارەکییەکەی خـۆی زیاتر بپاریّزیّت و فراوانتری بکات.

## * کوردستان لە ڕووی ئابوورییەوە:-

زۆرداری و ڕووتاندنـــەوە و خـــوێن مـــژینی ڕژێمـــی دەرەبەگایـــەتی لـــە کوردســـتان دا سروشـتێکی تایبـەتی سـەبارەت بـە میللەتـەوە هـەبوو، ئـەو میللەتەی پێك هاتبوو لە هەمە جۆری دانیشـتوان، واتـە ئەوانـەی بـە زەوی چاندنەوە خەریك بوون و لەتـەك ئەوانیشـدا نیـوە کۆچـەرو هـەروەها ژیـانی عەشیرەتیش هەبوون.

کورده نیوه کۆچەرەکان ئەوانەی بە بەخێوکردنی مەڕو ماڵاتەوە خەریك بوون کە هاتنە سەر ئەوەی دابمەزرێن و بکەونە زەوی چاندن، ئەم کردەوەیە شێوەو ڕووخسارێکی ئاڵۆز و تایبەتی خۆی وەرگرت.

کورده نیمچە کۆچەرییەکان، ئەوانەی خەریکی زەوی چاندنو بەخێوکردنی مەڕو ماڵات بوون، زۆر توند بەو جۆرە ئابوورییەوە بەسترابوون باشترین نموونەش عەشیرەتی جافە لە ئەیالەتی(شارەزوور)، هەموو تایەفەکانی ئەم عەشیرەتە گەورەیە بەسێ بەش و جۆری زەوی یان هەبوو:

**١- زەوی و زاری زستانە، لە قەزای سلێمانی.**

**٢- لە وەرگا لە کوردستانی رۆژهەلات لە ناوچەی سنە.**

**٣- پارچەیەك زەوی لە دەشتی شارەزوور.**

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە لە پێشتر باسمان کرد کە کوردستان لە ماوەی دەسەڵاتی عوسمانی دا بەسەر چەندین میرنشینی جیا جیا دا دابەش بوو بوو، هەریەك لەو میرنشینانە جۆرێك سەربەخۆیی هەبوو، دانیشتوانی ئەم میرنشینانە لە شار و گوند و هۆزی کورد پێکهاتبوو.سەرۆکی گوند خاوەنی گوندو زەوی و زاری کشتوکاڵی بوو، وەرزێرو جوتیاری کورد لە خزمەتی ئەوان دابوون و کاریان دەکرد، سەرۆکە گەورەکان بەرپرسی سەرۆکە بچووکترەکان بوون، واتە شێوازی ئەم هۆزانە شێوازی دەرەبەگایەتی بوو. لەو سەردەمەشدا سیستەمی دەرەبەگایەتی لە کوردستاندا باو بوو، وەکوردستانیش وەکو باسمان کرد ناوچەیەکی بە پیتو بەرەکەت بوو بۆ کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵ، وەك

ئەوەی زۆربەی هۆزەکان لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستاندا پێوەی خەریك بوون وەکو عەشیرەتی جاف کە لە پێشەوە باسمان کرد.

هەروەك لەو کاتەشدا هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی کوردستانیان داگیر کرد بوو لەنێوان هەردوو کیشیاندا بەشیان کردبوو.کەواتە کوردستان خۆی نەك هەر خاوەنی زەمینەکی باش نەبوو لە ڕووی ئابوورییەوە، بەڵکو تاڕادەیەکی زۆریش بووبوون بە مایەی دواکەوتنی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری بۆ گەلی کورد.

کوردستان لە ڕووی سامانی سروشتی وکەرەستەی خاوی پیشەسازییەوە وڵاتێکی دەوڵەمەند بوو، بەڵام کاربەدەستانی عوسمانی وەکو پێویست ئاوڕیان لەو سەرچاوانە نەدەدایەوە، و ناوچە دووردەستەکان لە ڕووی خراپی باری ئابووری یەوە گەیشتبوونە ئاستێکی زۆر مەترسی دار کە لە کشتوکاڵ کردندا ئامێری هەرە کۆن بەکاردەهێنرا.

سەرەڕای کشتوکاڵکردن لە کوردستان دا، بەخێوکردنی مەڕ و ماڵات بە هەمان شێوەی کشتوکاڵ پایەیەکی تری ئابووری کوردستان بوو، چونکە خاوەنی لەوەڕگایەکی زوری سروشتی بوو لە قەدپاڵ و شاخ و دۆڵەکانی دا، ئەمەش وای لێ کرد بوو کە سنووری بەخێوکردنی مەڕو ماڵات زۆر فراوان بێت.

کوردستان سامانی سروشتی زوری هەبوو، بەو سامانەی خۆی دەیتوانی پیشەسازی خۆماڵی پێش بخات و گەشەی پێ بدات، بەڵام وەك باسمان کرد دەوڵەتی عوسمانی وەك پێوست ئاوڕی لێ نەدەدایەوە ، سەرەڕای بوونی کانی زۆر لە ژێر زەوی دا کە جۆرەها کانزای بە نرخی تیا بوو، ئەمە بێجگە لەوەی ئەو کانزایانە لەسەر ڕووی زەوییەوە ئەوەندە نزیك بوون کە

لە ڕووی دەرهێنانەوە پارەی زۆریان نەدەویست، هەتا ئەمانەش واتە ئەو کانزایانەش لە لایەن بازرگانە بچوکەکانەوە لە سنوری پێویستی ناوچەیەکدا بەکاردەهێنران سوودیان لێ وەردەگیرا.

لە ناوچەی (خانەقین ـ مەندەلی) نەوت لە زەوی یەکە دەهاتە دەرێ و دەڕژایە ڕووبارەکانەوە، هەتا یەکێك لەو جۆگانەی نزیك مەندەلی ناوی (نەوت ـ چای) لێ نرابوو. ئەم زەوییە بە پیت و بەرەکەتانە درابوون بەکرێ و نەوتیان بە خەڵکی دەفروشت.

بەرهەمی پیشەسازی خوری و کاغەز لە شاری دیار بەکر هەموو ساڵێك (٦٠٠) هەزار (( ڕوبڵ)) بوو، ئەو بەرهەمانە دەنێران بۆ موسڵ و بەغداد و ناوچەکانی تری کوردستان و دەوڵەتی عوسمانی.

کوردستان بەرهەمێکی زۆری ڕۆنی زەیتون و کونجی هەبوو، ئەو بەرهەمەش بە زۆری بۆ دەرەوە دەنێران. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە کوردستان سەرچاوەیەکی گەورەی بەروبوومی مەڕ و مالات بەخێوکردن بوو.

لەشارەکانی حەڵەب و دیمەشق و شارەکانی تری ڕۆژهەلاتی نزیکەوە، زستان و بەهار ژمارەیەکی زۆر لەوانەی مەڕومالاتیان دەکڕی و دەڕژانە کوردستانەوە، ئەمانە هەموو جارێك نزیکەی (٤٠) هەزار سەریان دەکڕی، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کوردەکان خۆشیان ژمارەیەکی زۆری مەڕو مالاتیان دەنارده دەرەوە، نەك هەر بۆ ناوچە نزیکەکان، بەڵکو هەتا بۆ ئەستەمبول و میسریان دەنارد.

بەلام لە ڕووی سەپاندنی باجەوە لەلایەن دەوڵەتەوە ئەوا ئەرکێکی قورسی خستبووە سەر هاوولاتیانی کورد، لەو شوێنانەدا هەژاری و بێ

دەرامەتی پەرەی سەندبوو. یەکێك لەو باجانە کە زۆر قورس بوو کەوتبووە سەر شانیان بریتی بوو لە باجی (خانە) واتە باجی (خانووبەرە).

بـۆ کۆکردنـەوەو وەرگـرتنی بـاجی خانـە، پیـاوانی ناسـراو دادەنـران، ئەمانەش سوودیان لەو هەلە وەردەگرت و بەشێکی باجەکانیان بۆ خۆیان دەبرد.

سەرۆکەکانی قەزاو ناحیەکان، ئەوانە خۆیـان بەتاکـە خـاوەن دەسـەلآت دادەنا، بە ئارەزووی خۆیان باج و سەرانەیان دادەنا و لە دوایشدا بەهـەموو جۆرێك دەیان سەندوو، ئەوە دەردەخات، کە تا چ ڕادەیـەك قـورس و گـران بـــوون بەســـەر میللەتـــەوەو، تـــا چ ڕادەیـــەکیش مووچـــەخۆرەکان و دەرەبەگەگان دلڕەق و بێ ویژدان بوون.

میللـەتی کـورد لـە کوردسـتانی خـۆی دا چـەندەها جـار لـەم زۆرداری و دلڕەقـی و چەوسـاندنەوانە ڕاسـتبووەتەوە دژی ئەوانـەی کـە بـەزەیی یـان بەخەلکەکـەدا نەدەهاتـەوەو، دوا دلـۆپی خوێنیـان دەمـژین و ڕووتیـان دەکردنـەوەو ناچـاریان دەکـردن ڕاسـت ببنـەوە و ڕاپـەڕن دژی یـان، کاربەدەسـتانیش بـە جـۆرێکی خوێنـاوی لـەو ڕاپەڕینانـەیان دەدا دایـان دەمرکاندەوە.

# بەشی سێهەم

## ئیستعماری ئەوروپی و فراوانخوازی لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا لەسەدەی شانزەهەم تا کۆتایی هەژدەهەم

لە کۆتایی سەدەی پازدەوە گەلی عەرەب لە خۆرهەڵاتی نیشتمانی عەرەبیەوە تا بەشی خۆرئاوا ڕووبەڕووی شاڵاوی داگیرکارانەی ئیستعماری ئەوروپی بۆوە. ئەوروپیەکان لەم هێرش و پەلامارانەیاندا چەندین بیانووی جیاجیایان هەبوو، لەوانە:

١- **بیانووی ئایینی:** بەم بیانووەوە دەسەڵاتی موسلمانەکانیان لەساڵی ١٤٩٢ لە ئەندەلوس(غەرناتە) کۆتایی پێهێناو وڵاتەکەیان ڕزگارکرد.

٢- **بیانووی ئابووری:** ئەوروپاییەکان مەبەستیان بوو چالاکی بازرگانی موسڵمانان لە دەریای ناوەڕاست و زەریای ئەتلەسی و کەنداو تێکبشکێنن.

٣- **بیانووی رامیاری (سیاسی):** ئەوروپاییەکان بۆ فراوانترکردنی ڕووبەری دەسەڵاتیان دەیانویست دەست بەسەر نیشتمانی عەرەبیدا بگرن.

### * قۆناغەکانی داگیرکردن:

پورتوگالیەکان و ئیسپانیەکان پێشەنگی وڵاتانی دنیا بوون لە پرۆسەی دۆزینەوە جوگرافیاییەکاندا و پێش وڵاتانی تری دنیاش ڕوویانکردە نیشتمانی عەرەب و لەگەڵ عەرەبە موسڵمانەکاندا ڕووبەڕووبوونەوە.

## ١- داگیرکردنی خۆرئاوای دوور لەلایەن پورتوگالیەکانەوە:

ئەو کاتەی خۆر ئاوای عەرەبی خاوەنی یەکێتیەکی سیاسی بوون، وڵاتەکانیان ڕوو لە گەشەکردن و بووژاندنەوە بوو، بەڵام سەرهەڵدانی ناکۆکی لەنێوانیاندا ڕێگای بۆ پورتوگالیەکان ئاسانتر کرد، تا ڕوو بکەنە ئەو ناوچانەو داگیریان بکەن. لێرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە یەکێتی و تەبایی سیاسی و کۆمەڵایەتی چەند بنچینەیەکی گرنگی پاراستنی گەل و نیشتمانە لە داگیرکەران.

لەماوەی نێوان سەدەی یازدە بۆ سەدەی سێزدەی زاینی دوو دەوڵەتی عەرەبی بەشی خۆرئاوای نیشتمانی عەرەبیان بەڕێوە دەبرد:

**أ- دەوڵەتی مرابتین:** مرابتین لەسەدەی یازدەدا پەیدابووە، یەکێك لەو بزووتنەوە ئیسلامیانە بوو کە بەشێکی گەورەی کیشوەری ئەفریقیای گرتەوە. ئەمانە توانیان لەبەشی خۆرئاوای عەرەبیدا دەوڵەتێك بۆ خۆیان دابمەزرێنن. لەسەردەمی ئەم دەوڵەتەدا خۆرئاوای عەرەبی لەڕووی ئابووری و ڕۆشنبیرییەوەلە بووژاندنەوە دابوو.

**ب- دەوڵەتی موەحدین:** دوای لەناوچوونی دەوڵەتی مرابتین، دەوڵەتی موەحدین دامەزرێندرا، لەسەردەمی دەسەڵاتی موەحدینەکاندا خۆرئاوای عەرەبی یەکێتی سیاسی و بووژاندنەوەی ئابووری بەخۆیەوە بینی. بەڵام ئەم باری گەشەکردن و بووژاندنەوەیە زۆری نەخایاند، چونکە ناکۆکی و دووبەرەکی ناوخۆ لەنێوانیاندا سەریهەڵدا و وڵاتەکەی بەرەو

لاوازی و پارچــە پارچــەیی بــردو ڕێگایشــی بــۆ دەوڵەتــە داگیرکــەرەکان خۆشکرد تادەست بخەنە نێو کاروباری ناوخۆی دەوڵەتەکەیانەوە.

پورتوگالییەکان بەهۆی نزیکیانەوە لـەخۆرئاوای عـەرەبی پـێش وڵاتـانی تـری ئـەورووپا بـە مەبەسـتی داگیرکـردن ڕوویـانکردە ناوچـەکە، ئـەوەبوو توانیـان لەسـاڵی١٤١٥ز شـاری(سـەبتە) لەکـەنارەکانی بـاکووری مـەغریبی عەرەبی داگیر بکەن، وێڕای بـەرگری عـەرەب پورتوگالییـەکان توانیـان زۆر ناوچـە و شـاری تـر داگیر بکـەن لەوانـەش شـارەکانی(ئـەزمور و ئەسـیلا و تەنجە) بوون.

گەلی مەغریب بەردەوام بوو لەبەرگریکردن و بەربـەرەکانێی داگیرکـاران بەسەرکردایەتی(عەلی کوڕی راشـد و مەنـدەری) پـەلاماری چـەندین بنکـەی ســـەربازی پورتوگالییـــەکانیان دا. هـــەردوو بنەماڵـــەی(ســـەعدییەکان و عەلەوییەکان)یـش بـۆ ماوەیـەك ئـەرکی بەربـەرەکانێی داگیرکارانیـان گرتـە ئەسـتۆ. پورتوگالییـەکان تاکـە هێـزی ئـەورووپی نـەبوون کـە چـاویان لـە خۆرئاوای دوور بڕیبوو، بەڵکو ئیسپانیەکانیش لەم چاوتێبڕین و پەلامارانەدا بەشـداربوون و شـارەکانی(تـەتوان و مەلیلـە)یـان خسـتە ژێـر دەسـەڵاتی خۆیانەوە.

## ٢- داگیرکردنی جەزائیرساڵی ١٤٣٦، تەرابلوس لە ساڵی١٥١٠، تونس لەساڵی ١٥٣٥، لەلایەن ئیسپانیەکانەوە:

هەوڵدانی ئیسپانییەکان بۆ دەست بەسەرداگرتنی نیشتمانی عەرەبی بـۆ پـێش رزگـارکردنی ئەنـدەلوس دەگەڕێتـەوە، لەسـاڵی ١٤٩٢ز لەدەسـت موسـڵمانەکان. لـەم سـاڵەدا(١٤٩٢ز) دەوڵـەتی ئـەراگۆنی ئیسـپانی هـەوڵی

ئەوەیدا بکاتە دەریای ناوەڕاست و هێزە دەریاییەکانیان بۆ داگیرکردنی کەنارەکانی میسر و شام نارد و،هەوڵیشیاندا لەگەڵ حەبەشیەکاندا ببنە هاوپەیمان.

دوای یەکگرتنی هەردوو شانشینی قشتالەو ئەراگۆن و ڕووخاندنی غەرناتە چالاکی ئیستعماری زیاتر بوو. ئیسپانیەکان دەیانویست دەست بەسەر سەرچاوە سەرەکیەکانی سامانی عەرەب دا بگرن و ڕێگای هاتووچۆی بازرگانی نێوان خۆرهەڵاتی دوورو ئەوروپاش کەماوەیەك بەدەست موسڵمانانەوە بوو، بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە.

شێوازی پەلاماری ئیسپانیەکان بۆ خۆرئاوای عەرەبی ڕوخسارێکی ئایینی و ئیستعماری بەخۆوە گرتبوو، چونکە کەنیسە دەستی هەبوو لەهاندان و گوشار خستنە سەر ئیسپانیەکان تا سوپا و کەشتیگەلیەکانیان بۆ داگیرکردنی خۆرئاوای عەرەبی ئامادەبکەن، (پاپا)ش فرمانێکی دەرکرد، کەتیایدا مافی ئەوەیدا بەپادشای ئیسپانیا(فردیناند)و(ئیزابیلا)ی ژنی، کەدەست بەسەر هەموو ئەو زەویانە دابگرن کە داگیری دەکەن، هەروەها بەیاننامەیەکی دەرکرد تیایدا داوای خێر و خۆشی بۆ ئیسپانیەکان کرد لە هەوڵ و تەقەلادانیاندا بۆ داگیرکردنی باکووری ئەفریقیا.

## ٣- هاتنەناوەوەی پورتوگالیەکان بۆ دەریای عەرەب، دەریای سوور، کەنداو:

سەرەتای چاخە تازەکان جموجۆڵێکی بەرفراوانی ئەوروپاییەکانی لەپێناو داگیرکردندا بەخۆیەوە بینی. چونکە ئەوکاتە چالاکییە ئابوورییەکان زۆر دەروازەی بازرگانی و خۆشگوزەرانە بۆ ئەوروپاییەکان

کردبـووەوە، بۆیـە ئەوروپاییـەکان بەوپـەڕی گـەرمو گوڕیـەوە بـەدەریا و زەریاکاندا دەگەڕان بـۆ دۆزینـەوەی ڕێگایـەك تـا بیانگەیەنێتـە خۆرهـەڵات، لێرەوە بایەخی ئەو ڕێگا بازرگانیەیان بۆ دەرکەوت کە بەدەریای ناوەڕاست و دەریای سـوورو دەریـای عەرەبیدا تێپـەڕ دەبێت، چـونکە ڕێگایـەك بـوو خۆرهەڵات و خۆرئاوای بەیەکەوە دەبەست، دوای ئـەوەی پورتوگالییـەکان ساڵی١٤٩٨ڕێگای (رأس الرجاء الصالح) یـان دۆزیـەوە، توانیـان بەئاسـانی بگەنــە کەنـداو و دوورگــەو بەنـدەرە گرنگــەکانی داگیربکــەن و زۆر قــەڵای سەختیان لە(هورمز، قەتیف، مەسقەت، سەحار و بەحرین) دا دروستکرد.

پورتوگالییــەکان بــەم هــەنگاوەیان زەبرێکـی کوشـندەیان لــەبازرگانی عەرەبیـدا، چـونکە پورتوگالییـەکان ئـەم بازرگانیـەیان بەتاییـەت لەگـەڵ هیندسـتان بـۆ خۆیـان قـۆرخکرد، مەمالیکـەکانی میسـر هەوڵیانـدا هێرشـی پورتوگالییـەکان بوەسـتێنن، چـونکە بـوونی پورتوگالییـەکان لـەئاوەکانی عـەرەبی خـواروودا بێبەشـی دەکـردن لەگـەلێك داهـات و سـامانی ئـابووری گــەورە، بەتاییــەتی لەوباجانــەی دەیانخســتە ســەرئەو کەلوپەلانــەی لــە خۆرهەڵاتــەوە دەهــات و بەمیســردا تێدەپــەڕی. لەبەرئــەوە هاوکــاری بوندوقیـەکانیان کـرد کـە کەلوپـەلیان دەگواسـتەوە، بـەم هەنگاوەیشـیان زیانیـان بـە بەرژەوەنـدی پورتوگالییـەکان گەیانـد، مەمالیکـەکان ویسـتیان لەڕێی داگیرکردنـی یەمـەن و عەدەنـەوە دەرگـای خـوارووی دەریـای سـوور بەهێز بکەن، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون. جگە لەمەش کەشـتیگەلی مـەمالیك لــە سـاڵی ١٥٠٩ لــە شــەڕی (دیـو)دا لەلایـەن پورتوگالییەکانـەوە گـورزێکی قورسـی بەرکـەوت. هــەوڵێکی تـری مـەمالیك بـریتی بـوو لەنزیکبوونـەوە و ڕێکەوتن لەگەڵ ئێرانیەکان، بەڵام پێش ئەم هەوڵدانە پورتوگالیەکان لەگـەڵ

ئێرانیەکان ڕێککەوتبوون. شکستی مەمالیکەکان لەهەوڵەکانیاندا دژی پورتوگالییەکان دەرفەتی بۆ عوسمانییەکان ڕەخساند وەك هێزێکی نویێ دژ بەپورتوگالییەکان بوەستنەوە.هەرچەندە عوسمانییەکان ئەو کاتە بەهێزترین هێزبوون لەناوچەکەدا لەوەستانەوە دژ بە پورتوگالییەکان، بەڵام نەیانتوانی لەکەنداودا ململانێکە یەکلایی بکەنەوە وەك چۆن لەدەریای سووردا کردیان و توانیان شوێنی مەمالیك لەمیسردا بگرنەوە.

لەبەر ئەوە عەرەبەکان خۆیان کەوتنە بەربەرەکانێکردنی پورتوگالییەکان. ملکەچکردنی پۆرتوگالییەکان بۆ پادشانشینی ئیسپانیا و دەرکەوتنی ئینگلیز و هۆڵەندییەکان لەکەنداو، ڕۆڵێکی گرنگی بینی لەبێهێزکردنی دەسەڵاتی پورتوگالییەکان لە کەنداودا وێڕای ئەمانەش عەرەبەکان خۆیان دەستیان هەبوو لەدەرکردنی پورتوگالییەکان لەناوچەکەدا. لەساڵی١٦٢٤ز ئیمام ناسر کوڕی مورشیدی یەعروبی توانی عومان یەکبخات و دەوڵەتی(یەعاربە) دابمەزرێنێت. ئاڵای ڕزگاری دژ بە پورتوگالییەکان بەرزکردەو توانی زۆر شوێنی وەك(سەحار و مەسقەت)لەدەسەڵاتی داگیرکاران ڕزگار بکات.

### ٤ - (هێرشی ناپلیۆن بۆ سەر میسر ١٧٩٨):

فەرەنسا لەداگیرکردنی میسردا چەند مەبەستێکی هەبوو لەوانە:

١- داگیرکردنی میسر بەمانای دەستگرتن بوو بەسەر ڕێگای هاتوچۆی هیندستان، بەمەش بەرژەوەندییەکانی بەریتانیای دەخستە مەترسیەوە.

٢- شوێنی جوگرافی میسر کە کەوتبووە ناوەڕاستی هەرسێ کیشوەری ئاسیا و ئەفریقیا و ئەوروپا.

٣- دەست بەسەرداگرتنی میسر ڕێگای خۆش دەکرد بۆ داگیرکردنی ناوچەکانی تری خۆرهەڵات و دامەزراندنی ئیمپراتۆریەکی گەورە.

٤- دەست بەسەرداگرتنی خێر و سامانی میسر.

هێزەکانی ناپلیۆن لەبەندەری (تۆلۆن) لە باشووری فەرەنسا بەرەو میسر کەوتنە پێشڕەوی کردن دوای داگیرکردنی شاری ئەسکەندەرییە لەکەنارەکانی میسر بەرەو قاهیرە بەرێکەوتن ، بەڵام ئەم هێزانە لەرێگایان بەرەو قاهیرە تووشی زۆر سەغڵەتی بوون لەوانە: بەرزی پلەی گەرما وکەمی ئاو و خۆراك ،و بەربەرەکانێی خێڵە عەرەبییەکان. لە ساڵی ١٧٩٨ ز لەنزیك هەرەمەکانی جیزە هەردوو سوپای ناپلیۆن و مەمالیك ڕووبەڕووی یەکتری بوونەوە و جەنگی (ئەمبابە) لەنێوانیاندا ڕوویداو ئەنجامەکەی بە تێکشکانی سوپای مەمالیك و داگیرکردنی قاهیرە لەلایەن ناپلیۆنەوە کۆتایی هات.

ناپلیۆن ڕایگەیاند کە هاتووە بۆ ڕزگارکردنی گەلی میسر، نەك بۆ داگیرکردنی ، ئاشتی و برایەتی و یەکسانی لەنێو گەلی میسردا بڵاودەکاتەوە ڕێز لە ئاینی ئیسلام دەگرێت، لەهەمانکاتدا هەڕەشەی لەهەموو ئەوانە کرد، کە بەربەرەکانێی دەکەن.

دوای تێپەڕبوونی چەند ڕۆژێك بەسەر داگیرکردنی میسر، هێزەدەریاییەکانی بەریتانیا بە سەرکردایەتی(نلسون) لەشەڕی ئەبی قیر نزیك ئەسکەندەرییە پەلاماری هێزەکانی فەرەنسای داو زیانێکی زۆری پێگەیاند. ئەم شکستە کاری زۆری کردە سەر ئامانجەکانی ناپلیۆن

لەهێرشەکەی بۆ سەر میسر، وەك لەناوبردنی ئامانجی سەرەکی هێرشەکە کە بریتی بوو لە مەترسی خستنە سەر هیندو دەرکرنی هێزەکانی بەریتانیا تیایدا، وێڕای بڕینی ڕێگای پەیوەندی نێوان فەرەنسا و ناپلیۆن کە ئیتر ناپلیۆن ناچار بوو بۆ ئازووقەی سوپاکەی پشت بە میسر ببەستێت ، هەروەها ئەم سەرکەوتنەی بەریتانیا وایکرد سوڵتانی عوسمانی لەرووسیاو بەریتانیا کە دوو دەوڵەتی نەیاری فەرەنسا بوون نزیك ببێتەوە، ئەنجامێکی تری ئەم تێکشکانەی فەرەنسا بریتی بوو لەپەرەسەندنی بەربەرەکانێی گەلی میسر و شۆڕشی قاهیرەی یەکەم نموونەی ئەم پەرەسەندنە بوو.

شۆڕشی یەکەمی قاهیرە چەند ئەنجامێکی لێکەوتەوە لەوانە: ناپلیۆن بۆی دەرکەوت لەخاکێکدا دەژی خەڵکەکەی بەدەسەلاتەکەی ڕازی نییە، چونکە وەك داگیرکەر سەیری دەسەلاتەکەیان دەکرد، نەك وەك ڕزگارکەر. جگە لەوە بڕواو متمانەی نێوان گەلی میسر و سوپای فەرەنساش لەمیسر نەما.

دوای ئەوەی ناپلیۆن لە داگیرکردنی شام سەرکەوتوو نەبوو لەبەردەم گوشارو بەرهەڵستی خەڵکەکەیدا گەڕایەوە بۆ میسر، ئینجا بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ فەرەنسا، چونکە بارودۆخی ناوخۆی فەرەنسا تێکچووبوو، ئەمە لە لایەك، لەلایەکی تریشەوە دەوڵەتە ئەوروپاییەکان کەوتبوونە گەلە کۆمەکی لە فەرەنسا.

ناپلیۆن بە نهێنی میسری جێهێشت و گەڕایەوە بۆ فەرەنسا و(جەنراڵ کلیبەر)ی لەجێی خۆی دانا. گەلی میسر ڕاپەڕینێکی تریان بەرپاکرد، هەرچەندە فەرەنسیەکان توانیان دایبمرکێننەوە، بەلام بۆ کلیبەر دەرکەوت، کە مانەوەیان لە میسر. بێ سوودە، بۆیە لەگەڵ عوسمانییەکان

دەستیکرد بە گفتوگۆو ئەنجامەکەی مۆرکردنی پەیماننامەی(عەریش)بوو لەنێوانیاندا لەساڵی ١٨٠١ز، کە تیایدا بڕیاردرا بە کشانەوەی هێزەکانی فەرەنسا لەمیسر بەهەموو کەلوپەلێکیانەوە. لە سەرەتادا ئەم پەیمانە جێبەجێنەکرا ،چونکە بەریتانیا لەبەرامبەریدا وەستایەوەو پێی وابوو کە دەبێت سوپای فەرەنسا لە میسر خۆی بدات بەدەستەوە، بەڵام دواتر هەردوولا(فەرەنسا و بەریتانیا) لە یەکتری نزیکبوونەوەو ئیتر فەرەنسا سوپاکەی بەهەموو کەلوپەلێکەوە لە میسر کێشایەوە.

## * ئەنجامەکانی هێرشی ناپلیۆن بۆ سەر میسر:-

هێرشەکەی فەرەنسا بۆ سەر میسر لەدوای خۆیەوە گەلێ ئەنجامی گرنگی بۆ سەر میسر بەتایبەتی و ناوچەکە بەگشتی جێهێشت، کە دەکرێت گرنگترینیان بەمجۆرە دەست نیشان بکەین:

پەلامارەکەی سەر میسر بوو بە مایەی وریاکردنەوەی گەلانی ناوچەکە بەگشتی و گەلی میسر بە تایبەتی بۆ ڕزگاربوون لەدەسەڵاتی بێگانەو بەدیهێنانی قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆ. فەرەنسا شانبەشانی سوپاکەی ژمارەیەك زانا و پسپۆریان لەگەڵخۆیان هێنابوو بۆ میسر ئەمانە دەستیانکرد بە لێکۆڵینەوە لەهەموو بارێکی وڵاتەکە و ئەنجامەکەی هاتنە کایەی پرۆژەی نۆکەندی سویس بوو کە لەساڵی١٨٦٩زدا تەواو بوو، وێڕای ئەوەی هێرشەکە دەزگای چاپی لەگەڵ خۆیدا هێنایە میسر و چاپخانەیەکیان لەقاهیرە دامەزراند.

**٥ – دەرکەوتنی محەمەد عەلی لەمیسر ١٨٠٥ ز:**

دوابـــەدوای کشـــانەوەی فەرەنســـیەکان لـــە میســـردا عوسمانییـــەکان دەسەڵاتیان بە سەر میسردا سـەپاندەوە ، بـەڵام زۆری نـەبرد میسـریەکان شۆڕشیان لەدژیان بەرپاکرد ، ئەوەبوو محەمەد عەلی لە ساڵی ١٨٠٥ بوو بـە والی میسر. پاشان بـانگی سـەربەخۆیی دا،و دەســـتیکرد بـــە ئەنجامـــدانی چـــەندین چاکسازی بەتایبەتی لە بوارەکانی سـوپایی و ســـەربازی و خوێنـــدن و فێرکـــردن وچـاپەمەنی و رێگـاو هۆیـەکانی هاتوچـۆو رژێمی زەوی و زارو کشـتوکاڵ و بازرگـانی و پیشەسـازی، تـا میسـر وای لێهـات بـووە ولاتێکی پێشکەوتوو .



محەمەد عەلی سنوری دەوڵەتەکەی فراوان کـرد ئـەوەبوو لـە سـەر داوای سولْتان مەحمودی دووەم ، لەشکرێکی لەژێر فەرمانـدەیی ئیـبراهیم پاشـای کوڕیدا لە ساڵی (١٨١٨ ز) ناردە سـەر نیمچـە دوورگـەی عـەرەب و داگـیری کرد.

دواتر لـە سـاڵی (١٨٢٠ز) لەشـکرێکی تـری بەسـەرکردایەتی ئیسـماعیل پاشای کوڕی ناردە سەر سۆدان و داگیری کرد.

هـەروەها هێزەکـانی میسـر لـەژێر فەرمانـدەیی ئیبراهیمـی کوڕیـدا لەساڵی(١٨٣١ز) دەستیان بەسەر شامدا گرت.

ئـەم پێشـكەوتن و فراوانبوونـەی دەوڵـەتی میسـر وای لـە هەریەكـە لـە دەوڵـەتانی( عوسمـانی و ئەوروپیـەكان بـە تایبـەتی بـەریتانیا و رووسـیاو نەمسا و پرۆسیا و فەرەنسا) و تەنانەت ئێرانیش كرد كە دژایەتی بكەن .

ئەوەبوو بەریتانیا عەدەنی داگیركرد و جەنگی نێوان هێزەكـانی میسـرو هێزەكـانی عوسمـانی دەسـتی پێكـرد، (شـەڕی نەسـیبین) لـە ڕۆژئـاوای كوردسـتان سـاڵی ١٨٣٩ز ڕوویـدا و هێزەكـانی میسـر بـە سـەركردایەتی ئیبراهیم پاشا تیایدا سەركەوتن ، دوای ئەم سەركەوتنانە بـەریتانیا بڕیـاری دا بە توندی لە رووی محەمەد عەلیدا بووەستێ ، ئەوەبوو لـە سـاڵی (١٨٤٠ ز ) دا دەوڵەتی عوسمانی و بەریتانیا و رووسیاو نەمساو پرۆسـیا( پـەیمانی لەندەن )یان بەسەردا سەپاندو بە پێی ئەم پەیمانەش چارەنووسی محەمەد عەلی دیاری كرا ، محەمەد عەلی پـەیمانەكەی ئیمزا كرد كە دەبێت دەسەلاتی لـەناو سـنوری میسـردا بمێنێتـەوەو فـەرمانڕەوایی لـە بنەماڵەكەیدا پشـتاو پشت بێت.

# بەشی چوارەم

## میرنشین و حکومەتە کوردییەکان

### * پێناسەی میرنشین:

میرنشین جۆرە ڕێکخستنێکی (ڕامیاری، کۆمەلایەتی، ئابووری، کارگێڕی ناوچەیی) بوو، نەیتوانی سەرتاسەری کوردستان بە تەواوەتی بگرێتەوە، ڕادەی دەسەلاتی میرەکانیش لەگەلّ یەکتریدا جیاواز بوون وەك یەك نەبوون. واتە ئەم میرنشینانە لەبەڕێوەبردنی کاروباری خۆیاندا سەربەخۆ بوون و لە کاروباری دەرەوە وەك (ئاشتی و شەڕ) سەربەخۆ نەبوون.

پێکهاتەی ڕژێمی کارگێڕی هەر میرنشینێك جیاواز بوو لەوی تریان و بەپێی کات و شوێن و سەردەمیش گۆڕانکاریان بەسەردا هاتووە.

لە بەناوبانگترین ئەو میرنشینە کوردییانەی کە شوێنیان لە ناوچەکەداو لە سەردەمی خۆیاندا و هەتا ئێستاش دیار بووە و لە لایەن دەولّەتانی ئەو کاتەوە کە بریتی بوون لە هەردوو دەولّەتی عوسمانی و ئێرانی حسابی تایبەتییان بۆ کراوەو، بوونەتە مەترسی بۆ بەرژەوەندی و فراوانخوازییەکانیان و، هەولّ و تەقەلاو پیلانی زۆریان بۆ داڕشتن و پەیمان و ڕێکەوتننامەی ژێر بە ژێریان لەدژیان مۆر کردووە، دژی دەسەلاتەکانی ئەو میرنشینە کوردییانە و هەولّی لەناوبردنیان کراوە، ئەو میرنشینانەش کە لەم قۆناغەی خوێندنی ئەمسالّدا پێویستە بیانناسین و لەبارەیانەوە شارەزابین بریتی بوون لە:-

*** یەکەم:- میرنشینی ئەردەڵان (حکومەتی ئەردەڵان):**

میرنشـــینی ئـــەردەڵان ســـەرەتا لەناوچـــەی شـــارەزووردا پەیـــدابووە، دامەزرێنەری ئەم میرنشینە(بابائـەردەڵان) یـاخود(بەبـە) بـوو کـە ماوەیـەك لەناو هۆزەکانی گۆران دا ژیاوە.

دوای دەســـەڵاتی جـــەنگیز خـــان، واتـــە لـــە دەوروبـــەری ســـاڵی (٦١٧کۆچـــی/١٢٢٠ز)دا توانیویـــەتی دەســـت بەســـەر ناوچـــەی شارەزوور(بەکەرکووکیشەوە) دا بگرێت و میرنشینەکەی تیادا دابمەزرێنێ.

بابا ئەردەڵان پیاوێکی وردو لێهاتوو بووە، و ئازاو بەجـەرگ و نـەترس و بە دەست و برد بووە و لەماوەیەکی کەمدا میرنشـینەکەی فـراوان کـردووەو بـەردەوام بـرەوی بـە قەڵـەمڕەوی خـۆی داوەو هـەتا لەژیانـدا بـووە بـە سەربەستی و بە سەربەخۆیی و سەرداری ژیاوە.

ئەم میرنشینە بـە بـەناوبانگترین میرنشـینی کـوردی دادەنرێـت لـە ڕووی فراوانی و ڕووبەری زەوی و دەسەڵاتییەوە لە مێژوودا.

لـەم میرنشـینەدا نزیکـەی (٤٤) مـیر فـەرمان ڕەواییـان کـردووە، کـە بەناوبانگەکـەیان (کلـۆڵ بـەگ) بـووە کـە کـوڕی بابـا ئەردەڵانـە و لـە دوای باوکی لە جێگەی دانیشتووەو فەرمانڕەوایی میرنشینی ئـەردەڵانی کـردووە، لەسەر هەمان شێوەو دەستووری باوکی، وە بەهەمان شێوە لێهاتوو زیـرەك و ئـازاو نـەترس بـووەو، هەمیشـە خـەریکی ئیشـی چـاکەو خزمـەتکردنی میرنشینەکەی بووە، لـە سـەردەمی (کلـۆڵ بـەگ)دا میرنشـینەکە زۆر زیـاتر فراوان بووەو هەتا هەولێری گرتووەتەوە.

ئەم میرنشینە ئەوەندە بە دەسەڵات و بەرفراوان بووە، لەبەر ئەوە جەلاییرییە مەغۆلەکان زۆر ناحەزیان بوون و بۆ لە ناوبردنیان هەمیشە لە هەوڵدا بوون دژیان.

هەر کاتێك ئەم میرنشینە کە زیاتر پەرەی سەند بێت و گەشەی کردبێت، جەلاییرییەکانی مەغۆل زیاتر ترسیان لێ نیشتووەو زیاتر کەوتوونەتە پیلان و دوژمنایەتیکردنی.

هەر چەندە جەلاییرییەکانی مەغۆل لەسەردەمی (حسن بگ کوڕی خدر بگ) کە یەکێك بووە لە میرە بەناوبانگ و بەجەرگەکانی میرنشینی ئەردەڵان، سەرەڕای ئەو هەموو پیلان و ناحەزی یانەی کە جەلاییرییەکانی مەغۆل هەوڵیان بۆ دەدا بۆ لەناوبردنی ئەم میرنشینە ی ،بەڵام لە سەردەمی(حسن بەگ)دا هەرچەندە ویستی بە هێرشی سەربازی بەهۆی لەشکرکێشییەوە بۆ سەر میرنشینەکەی، توانیویەتی کە بەرەنگاری لەشکری مەغۆلەکان بکات و بیان شکێنێت و نەی هێشتووە لە میرنشینەکەی نزیك ببنەوە.

یەکێکی تر لە میرە بەناوبانگەکانی ئەم حکومەتە (میرنشینە) (مەئمون بەگ) بوو کە لەسەردەمی دا میرنشینەکە سەقام گیر و هێمن و ئارام بووە، ئەم میرە لەدوای مردنی باوکی فەرمانڕەوایی میرنشینەکەی کردووە، ئەم میرە بەشەش پشت دەچێتەوە سەر دامەزرێنەری میرنشینەکە (بابا ئەردەڵان).

لە سەردەمی مەئمون بەگ دا میرنشینەکە سەربەخۆ بووەو ماوەیەکی زۆر بەباڵا دەستی و سەربەستی ژیاوەو، ئەمیش لەدوای خۆی سێ کوڕی لە پاش بەجێ ماوە کە ئەمانەن:—

((بێـــگە بەگ ، ســـورخاب بەگ ، مـحـــەمـەد بەگ)) بوون .

لە سەردەمی ئەم میرەدا (مەئمون بەگ) لە شکری حکومـەتی ئـەردەڵان لە باکوورەوە گەیشتووەتە زێیی گەورەو، تەنانەت لە ڕەوانـدزدا میرنشـینی ئەردەڵان سوپای داناوە.

لــە ســەدەی ســیانزەهەم هــەتا ســەدەی چـواردەهەمی زایـنی هــەموو ناوچەکانی ئامێدی و زاخۆ و هەریری گرتووەتەوەو، جۆرە فیدراڵییـەکی لـە ژێر سایەی خۆی دا بەو ناوچـانەی بەخشـیوەو خۆشـی وەکـو حکومـەتێکی سەربەخۆ ڕەفتاری کردووە.

لەو میرە بە توانایانەی تری حکومەتی ئەردەڵان(هەڵۆخان)ە کەپیاوێکی زۆر بەجەرگ و لێهاتوو کارامـە بـووە، وڵاتـی خـۆی ئـاوەدان کردووەتـەوە. جگە لە قەڵای (زەڵم) کـە پایتـەختی هـەڵۆخان بـووە، سـێ قـەڵای تریشـی دروست کردووە، کە ئەوانەش قەڵای (حەسەن ئاوا) کە لەسەر کەژێکی بەرز دروسـتی کـردووە، وە قـەڵای (پاڵنگـان) لـە ناوجەرگـەی وڵاتـی گـۆران دا دروسـتی کـردووە، قـەڵای(مـەریوان) بـوون، کـە بەشـێوەیەکی ڕێـك و پێـك دروستی کردووە لە میرنشینەکەی دا.

لەســەردەمی هــەڵۆخان دا گەنجینــەی حکومەتەکــەی (میرنشــینەکەی) هەمیشە پڕ لە زێڕ و زیو بووەو، زۆریش بەخشندەو خێرەومەند بووە.

زۆر بایەخی بە ئاوەدانکردنەوە داوەو گەلێك مزگەوت و تـەکیـە و خانـەقا و فێرگەی ئایینی دروست کردووە.

لەســەردەمی فەرمانڕەواییەکەیـدا میرنشــینەکەی ئــارامی و هــێمنی و خۆشی و هەرزانی باڵی بەسەر خاکی قەڵەمڕەوی داکێشابوو.

ئـەم مـیرە(هـەڵۆخان)سـەری بـۆ کـەس دانەنوانـدووە، نـە بـۆ سـوڵتانی عوسمانی نە بۆ شای سەفەوی ئێران.

هەر لەبەر ئەم ئازایەتی و نەبەردی سەر شۆڕ نەکردنەی بووە کە هەردوو دەوڵەتەکە (عوسمانی و سەفەوی) بە جووتە لێی ترساون و بـە بـەردەوامی بە مەترسییان داناوە بۆ سەر فەرمانڕەوایی و بەرژەوەندییەکانیان.

شا عەباسی سەفەوی بـە نیـازی داگیرکردنـی حکومەتەکـەی(میرنشـینی ئەردەڵان) بە لەشکرێکی ئێجگار گەورەو بەرفراوانەوە هاتووەتـە سـەری لـە نزیـك (هەمـەدان) لـە گونـدی (سـەهیم)، بـەڵام هـەڵۆخان توانیویـەتی ئـەم لەشـکرە گەورەیـەی شـا عەباسـی ئێـران بشـکێنێ و میرنشـینەکەی لـە داگیرکاری شا عەباسی ئێرانی بپارێزێت.

لە مـیرە بەناوبانگـەکانی تـری میرنشـینی ئـەردەڵان مـیر(خـان ئەحمـەد خان)، کە (سنە)ی کردە پایتەختی خۆی و لەوێوە پەلی هاویشت و دەستی کرد بەبەرفراوانکردنی میرنشینەکەی و توانی هۆزەکانی (بلباس و موکریان) و شـارەکانی (سـابلاغ و ئورمیـە و مەراغـە) داگـیر بکـات و بیانخاتـە سـەر میرنشینەکەی و فەرمانڕەوایی بکات.

بە کورتی حکومەتی ئەردەڵان یەکێك بووە لـە حکومەتـە بـە هێزەکـانی کـورد کـە دەسـەڵاتێکی فراوانـی هـەبووە. ئـەم میرنشـینە(میرنشـینی ئەردەڵان) سکەی خۆیان هەبووەو، سەردەمێك بە تەواوی سەربەخۆ بووەو، لە وتارەکانیاندا، تاماوەیەکی زۆر بەهیچ شێوەیەك باسـی هـیچ کەسێکیان تێدا نەکردووەو، بەناوی خۆیانەوە وتاریان خوێندووەتـەوە، واتـە نەبـەناوی سوڵتانی عوسمانییەوە، نەبە ناوی شای ئێرانەوە، وتاریان خوێندووەتـەوە، واتە تا ڕادەیەکی زۆر سەربەست و سەربەخۆ بوون.

بەڵام بەهۆی هاتنی هەندێك میری لاوازو بێ توانا و ناكۆكی ناوخۆ بەرەو لاوازی چوون و،لەدوای ئەوە هەندێك جار بەو هۆیەوە سەر بە دەوڵەتی ئێران بوون و تاساڵی (١٨٦٧ز) بە تەواوی لەناوچووە.

لە دوای ساڵی (١٦٣٩ز) رێكەوتنی زەهاو ئیتر كوردستان بە تەواوی بوو بە دوو بەشەوە، بەشێكی لە ژێر دەستی رژێمی شیعەی ئێران و بەشەكەی تریشی لە ژێر دەستی رژێمی سوننی عوسمانی مایەوەو، هۆزەكانی كەلهورو ئەردەڵانیش بوونە بەشێك لە ئێران و تەنها ناوچەی ئامێدی و جزیرە،بۆ ماوەیەكی باش بە نیمچە سەربەخۆیی مابوونەوە.

*** دووەم: میرنشینی بادینان:-**

ئەم میرنشینە كوردییە لە ساڵی(١٢٦٢)ز لە شاری ئامێدی لە لایەن (شێخ بەهادین شێخ شەمسەدین) دامەزراوەو، هەر بەناوی خۆیەوە(بادینان)كە كورتكراوەی(بەهادین)ە ناونراوەو ناوبانگی دەركردووە.

بنەماڵەی شێخ بەهادین لە پێشدا لە قەڵای(تارون)بوون و ئەم قەڵایەیان بە دەستەوە بووە كە سەر بە شەمزینانە.

كەواتە ئەم میرە(شێخ بەهادین) لە بنەچەدا خەڵكی قەڵای(تارون)ی وڵاتی شەمزینانە و لەوێوە، بەرەو ئامێدی هاتوون.

شێخ بەهادین پیاوێكی زیرەك و داناو ئازاو لێهاتوو بووە، زۆر حەز و ئارەزووی لەئاوەدانكردنەوەو، رازاندنەوەو، جوانكردنی میرنشینەكە بووە.

لەسەردەمی شێخ بەهادین دا لە ئامێدی گەلێك مزگەوت و شوێنی خوێندنی درووست كردووەو مەلا و زانای بەناوبانگی بەسەرەوە داناون كە

ئامۆژگاری و ڕابەری زۆریان بۆ خەڵك كردووە لەم سەردەمەدا، واتە لەكاتی فەرمانڕەوایی شێخ بەهادین دا، شارەكە زۆر لە خۆشی و ئاسایش و هێمنی دابووەو هەمیشە بە ڕاپرسی كاری فەرمانڕەوایی بەجێ هێناوە.

لەسەردەمی میرنشینی بادینانـدا زاخـۆش كـە لـەوەو پـێش سـەربەخۆ بـووە، خراوەتـە سـەر ئامێـدی و لـە لایـەن مـیری میرنشـینی بادینانـەوە فەرمانڕەوایی كراوە و بووە بە بەشێك لە میرنشینی بادینان.

ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەی كـە جوولەكـەو ئەرمـەن و ئاشـووری و یەزیـدی لەپەنایاندا ژیاون بەشێوەیەكی ئاشتی.

لـە مێـژووی ئـەم میرنشـینەدا، بەتایبـەتی لـە دوای ئـەم مـیرە گـەورەو بەناوبانگەدا (شێخ بەهادین) گەلێك میری دیكەیـەك لـەدوای یـەك هـاتوون و فـەرمانڕەوایی میرنشـینەكەیان كـردووە كـە ژمارەیـان لـە(٢٥) مـیر تێپـەڕ دەكات، كە لە ناو ئەوانەدا هەندێك مـیری بـە توانـا هـەبوون كـە توانیویانـە وڵاتەكەیان گـەورەو فراوانـی بكـەن و ئاسـایش و هـێمنی و خۆشـگوزەرانی وڵاتەكـەیان بپـارێزن و ئاوەدانكردنەوەشـی تیایـدا بـەردەوام بكـەن و لـە ناوچەكەیاندا جێ دەستیان دیار بێت.

لە میرە بەناوبانگەكانی ئەم میرنشینە كوردییە میر(زەین الدین)ە كە لـە سەردەمی دا ئامێدی واتە(میرنشینی بادینان) بە سـەربەرزی و شـانازیكردن بە خۆیان و كامەرانی و خۆشگوزەرانی ژیاوە.

لەدوای ئەمیش میر(سیف الدین) كوڕی(زەین الـدین)كـە لـە دوای بـاوكی فەرمانڕەوا بووەو هەرچی ناخۆشـی و ژان و ئـازار هـەبووە، بـەهۆی سـۆز و بەزەیی و دلۆڤانی خۆیەوە لە بیر هەژارانی میرنشینەكەی بردۆتەوە.

یەکێکی تر لە میرە بەناوبانگەکانی ئەم میرنشینە(میرنشینی بادینان) میر(حسن کوڕی سیف الدین) بووە کە سەرەڕای ئەوەی لەسەردەمی فەرمانڕەوایی دا میرنشینەکە لەو پەڕی ئاشتی و هێمنی و ئاسایش دا ژیاوە و خەڵکەکەی خۆشگوزەران بوون، ئەم میرە توانیویەتی لەشکری(ئاق قۆینلو)کە بە سەرکردایەتی(سلێمان بەگ بێژەن ئوغلو) بوو هێرشی کردووەتە سەر میرنشینەکەی و ویستوویەتی قەڵای ئامێدی داگیر بکات ، بەڵام نەی توانی ئەم قەڵایە داگیر بکات شکاندویەتی و ناچاری کردووە کە بەنائومێدی لەشکری (ئاق قۆینلو) بگەڕێتەوە بە شکاوی.

ئەم میرە توانی دەست بگرێت بەسەر قەڵای دهۆك داو، تەواوی پارێزگای ئێستای دهۆکیش بخاتە ژێر دەستی خۆیەوە.

هەروەها لە میرە بەناوبانگەکانی تری میرنشینی بادینان میر(مرادخان)ە کە پیاوێکی زۆر ئازاو بەجەرگ و خۆڕاگر بووە، لەگەڵ ئەوەی حەزی بە شەڕو ناکۆکی و دووبەرەکی نەکردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی زۆر لە سوپا و سەربازی هەبووە، سەرەڕای ئەوەی میرنشینەکەی ئاشتی و ئاسایش و هێمنی ژیاوە، بەڵام ژمارەی سەربازەکانی بیست هەزار سەربازی پڕ چەك و جبەخانەی هەبووەو،کە هەموو کاتێك ئامادەبوون بۆ هەر هێرشێکی بێگانە کە بکرێتە سەریان و میرنشینەکەیان بپارێزن.

ئەم میرە (مرادخان) لە هەموو کردارێکی دا سەربەخۆ و سەربەست بووە، پەیوەندی بە ئەستەمبوڵەوە نەبووە، تەنها ئەوەندە نەبێت لە مزگەوتەکاندا ناوی سوڵتان هاتووە.

خێزانەکەی خوشکی میری سۆران بووە، بۆیە لە کاتی فەرمانڕەوایی ئەو میرەدا، پەیوەندییەکی زۆر باش و بەهێز لە نێوان(میرنشینی بادینان و سۆران) دا هەبووە.

ئـــەم مـــیرە زۆر حـــەزی لـــە دۆســـتایەتی کـــردووە لەگـــەڵ میرنشـــینە کوردییەکاندا، زۆربە خزمەت بووە بۆ میرنشینەکەی خۆی هەوڵی زۆری داوە لـــەڕووی ئاوەدانکردنـــەوە و دروســـتکردنی بینـــای گـــەورەو قوتابخانـــە بۆگەشەدان بە خوێندەواری لەناو میرنشینەکەی دا.

لەو بینا گەورانەی کە لـەکاتی فەرمانڕەواییەکـەی دا دروسـتی کـردووە، بینای قوتابخانەی(مرادخان) ە لە ئامێدی کـە هـەتا ئێسـتا شـوێنەواری لـە نزیك دەرگای ڕۆژهەڵاتی شارەکەوە ماوەتەوە.

*** سێیەم: میرنشینی سۆران:-**

ئەم میرنشینە لە لایەن میر(عیسا کوڕی کەلوس بـەگ) ەوە لـە ناوچـەی ڕەواندز دامەزراوە، لەسەرەتاکانی سەدەی پازدەهەمی زایینی.

لـەم میرنشـینەدا نزیکـەی(٢٤)مـیر فـەرمانڕەواییان کـردووە، کـە لەوانـە یەکێکیان ئافرەت بووە، بەناوی(خانزاد).

ئەم میرنشینە بەهۆی بـارودۆخی جیـاوازی جیـا جیـا و سـەربازی چـەند پایتەختێکی لە کاتی جیا جیا دا هـەبووە، وەك (هاودیـان، دویـن، هـەولێر، شەقڵاوە، هەریر، خەلیفان) پاشان بۆ دواجار شاری ڕەوانـدز دوا پایتـەختی ئەم میرنشینە بووە.

لە میرە هەرە بەناوبانگەکانی ئەم میرنشـینە مـیر(محمـد کـوڕی مسـتەفا بەگ)بوو کە لە بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردا دەورێکـی گـرنگ و کاریگـەری هەبووە، میر محمـد بـە مـیری گـەورەی ڕەوانـدز یـاخود بـە پاشـای گـەورە یاخود کۆرە ناسراوە، کە لـە سـاڵی(١٨٢٦)ز دا بـووە بـە مـیری میرنشـینی

سۆران و پایتەختەکەی ڕەواندز بووە کە تا سەردەمی میر محمد پاشای وا بەهێزی خۆیەوە نەدیوە.

ئەم میرە هەر زوو خولیای سەربەخۆیی میرنشینەکەی کەوتووەتە مێشکەوە، ویستوویەتی لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی دەری بکات و سەربەخۆ ببێت.

هەر لەگەڵ دەستبەکاربوونی لە فەرمانڕەوایی دا ناوچە کوردنشینەکانی دەوروبەری خستە سەر میرنشینەکەیەوە. گرنگترین کارە ئیدارییەکانی میر محمد بریتی بوون لە دامەزراندنی چەند لیژنەیەك بۆ سەرپەرشتی کاروباری ئیداری میرنشینەکە، وەکو دامەزراندنی ئەنجومەنی سەروەری، کە پاشای گەورە خۆی سەرۆکی بوو، هەروەها لیژنەی سەربازی کە(ئەحمەد بەگ)ی برای سەرۆکایەتی دەکردو، پێکهێنانی لیژنەی زانایان بۆ دانانی یاسا مەدەنییەکان و ئاینییەکان و سەرپەرشتیکردنی حوکمەکانی شەریعەت و، لیژنەی بنیاتنان و دروستکردن بۆ سەرپەرشتی دروستکردنی قەڵاو، شوورەو، سەنگەرو، پردو، لیژنەی بازرگانی دامەزراند بۆ سەرپەرشتیکردنی بەڕێوەچوونی کاروباری بازرگانی و بازاڕ.

هەروەها یەکێکی تر لە ئیشە گرنگەکانی کە لە دەوڵەتی سەربەخۆ چووەو ئەی سەلمێنێت کە ئەم میرە چەند بە تەنگ سەربەخۆیی و سەربەستی میرنشینەکەیەوە بووە بریتی بووە لە لێدانی (سکە) واتە پارەی تایبەت بە میرنشینەکەی دەرکردووەو کە لەیەکێك لە ڕووەکانی پارەکە مۆری میری سەرکەوتوو(محمدبەگ)ی لێ دراوەو، لەدیوەکەی تری نووسراوە (لەڕەواندز لێ دراوە)کە ئەمەش وەکو گوتمان بەڵگەیەکی ڕوونەو دەیسەلمێنێ کە میرنشینەکەی پاشای گەورەی ڕەواندز میر محمد سەربەخۆ بووەو، میر بەمەشەوە نەوەستاوە و لایەنی سەربازیشی پشتگوێ

نەخستووە، بەڵکو توانیویەتی سوپایەکی بەهێز دابمەزرێنێ کە پیادەو سوارەو تۆبخانەی هەبووەو، کارگەیەکی بۆ دروستکردنی تۆپ و دەمانچەو تفەنگ و خەنجەرو بارووت دامەزراندووە.

هەروەها سنوورێکی بۆ دزی و ڕاو ڕووت و تاڵانکردن داناو سزای بۆ تاوانباران و ئەنجامدەرانی دیاری کرد.

میری سۆران توانیویەتی پەیوەندی دروست بکات لەنێوان خۆی و ئیبراهیم پاشای کوڕی محەمەد عەلی پاشای میسر بۆ یەکخستنی هەوڵەکانیان دژی دەوڵەتی عوسمانی.

میری سۆران میر محمد بەهۆی بەهێزی سوپاکەی کە ژمارەی لە پەنجا هەزار زیاتر دەبوو توانیویەتی جووڵانەوەیەکی سەربەخۆخوازی لە ساڵی (١٨٢٦) دا بە دەست بهێنێ و بڕیار لەسەر ڕزگاربوونی کوردستان بدات، ئەویش دوای یەکخستنی میرنشینەکانی دراوسێی وەك شێروان و برادۆست و ئینجا دەستی بە جووڵانەوە ڕزگاریخوازییەکەی کرد.

هێزەکانی میر محمد پاشا واتە میری میرنشینی سۆران ناوچەکانی شێروان و برادۆست ، سورچی، خۆشناوەتی، هەریر، هەولێر، پردێ، کۆیە و ڕانیەیان ڕزگار کردو، پاشان ناوچەی بادینان و شەنگال و دەوروبەری موسڵ و جزیرەی خستە سەر میرنشینەکەی.

لەو کاتە دەوڵەتی عوسمانی بەرامبەر بەو کردەوانەی میری سۆران و پەلهاویشتنی بێتۆمان نیگەران بوو، بۆیە سوپایەکی گەورەی ئامادەکرد بۆ بەربەرەکانێ کردنی میری سۆران بەسەرکردایەتی ڕەشید پاشا (سەدری ئەعزەمی) پێشووی عوسمانی، پاشان لە دوو لاوە پەلاماری میرنشینی سۆران درا، یەکێکیان لە موسڵەوەو ئەویتریشیان لە بەغدادەوە، سەرەڕای

ئەوەی کە دەوڵـەتی عوسمـانی واتــە سـوڵتان بـە والـی موسـڵ و بەغـدادی ڕاگەیاندبوو کە دەبێ ملکەچی ڕەشید پاشـا بـن و هەرچییەکی دەوێ بـۆی دابین بکەن.

دوای چەند شەڕێکی خوێناوی هێزەکانی عوسمانی و میرنشینی سـۆران، لەم کاتەش دا ئێرانیش هێزەکانی خۆی کۆکردەوە بۆگەمارۆدانی میرنشینی سۆران لەدیوەکەی دیکەدا.

هێزەکانی عوسمانی گەیشتنە دەشتی هەریر و نامەیان بۆ مـیری سـۆران نارد تا ڕازی بکەن بەرگری نـەکات و، گوایـە لـە پێنـاوی پاراسـتنی خـوێنی موسـڵمانان دا، خـۆی بداتــە دەسـتەوە، بـەڵام مـیر خـۆی ئامـادەکرد بـۆ بەرگریکردن لە میرنشینەکەی و پایتەختەکەی، پاشان شەڕ بـەردەوام بـوو، بـەڵام بـەهۆی چـەند هۆکارێکەوە،ناچـار مـیر خـۆی دابەدەسـتەوە ، بـەم شێوەیە میر نێردرا بۆ ئەستەمبوڵ و ساڵی ١٨٣٧ز لـە سـیواس لـە سـێدارە درا.

بەڵام ئەگەر سەرنج بدەین لەسەر ئەو سەرکەوتنانەی کە پاشـای گـەورە لـە سـەرەتادا بـە شـێوەیەکی خێـرا بـە دەسـتی هێنـا لـە فراوانخـوازی و بەهێزبوونی دەسەڵاتەکەیدا، دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك لەوانە:-

١- ناوچـەی ڕەوانـدز شـوێنێکی سـەختەو ناوچـەیەکی شـاخاوی بـەرزە و دوژمن بە ئاسانی نەیدەتوانی بەرەو پیری بچێت و داگیری بکات.

٢- ڕێگایەکی سەرەکی کاروانچی بەسەرەوە بوو، کە هەمیشە بۆ میرنشینی سۆران ببووە مایـەی خێـر و خۆشـی، چـونکە لەسـەرێکەوە دەسـەڵاتی سیاسـی دەدایـەو لەسـەرێکی تریشـەوە، بـەهۆی بـاج و سـەرانەوە سامانێکی زۆری دەست دەکەوت.

٣- لاوازی ئەو کاتەی دەوڵەتی عوسمانی کە هۆیەکی سەرەکی بوو، کە میری سۆران بە تەواوی و بەبێ خەم پەل بهاوێت و ئەو هەموو ناوچانە بخاتە سەر میرنشینەکەی بەبێ ئەوەی هیچ حسابێك بۆ دەوڵەتی عوسمانی بکات.

٤- لاوازی میرنشینی بابان لەو سەردەمەدا دەورێکی زۆری هەبوو، چونکە عوسمانییەکان حەزیان دەکرد کە هێزێکی تر هەبێت لەناوچەکەدا شوێنی میرنشینی بابان پڕ بکاتەوە، بۆ ئەوەی وەك دیوارێك بوەستێ لەرووی ئێران دا.

٥- کەسێتی پاشای گەورە خۆیشی کارێکی گەورەی هەبوو لەسەر میرنشینەکەو پەرەسەندن و پێشکەوتنی لەبەر تواناو لێهاتوویی و ئەو رێزە زۆرەی کە لە ناوچەکەدا هەی بوو.

٦- ئەو هێزە سوپاییەی کە دروستی کردبوو لەوەنە نەدەچوو کە هی میرنشینێکی بچووك بێت، بەڵکو زیاتر لە هی دەوڵەتێك دەچوو، ئەمە یەکەم جار بوو سوپای کورد ئەوەندە چەکی قورس و جبەخانەی هەبێت، هەر ژمارەی یاساوڵی تایبەتی پاشای گەورە خۆی لە سێ هەزار کەس زیاتر دەبوو.

لەگەڵ ئەم هەموو خاڵە باشانەی کە میرنشینەکەیان بەو شێوەیە فراوان و پێش خست لەماوەیەکی کەم و دیاریکراوی وا کەمدا، کەچی لەبارودۆخێکی زۆر نائاسایی داو لەپڕ لە دوای ئەو هەموو سەرکەوتنانەکە میری سۆران بەدەستی هێنا میرنشینەکە هەرەسی هێناو زۆر بە خێرایی لەناوچوو بووە هۆی خۆبەدەستەوەدانی میر و رووخاندنی میرنشینەکە. ئەم هۆکارانەش کە بوونە لاوازی و لەدەستدانی میر و میرنشینەکەشی دەتوانین بەم شێوەی خوارەوە دەست نیشانی بکەین:-

## أ- هۆكاره ناوخۆييه‌كان:-

١- نـاكۆكی و دووبـه‌ره‌كی نێـوان ئه‌نـدامانی بنه‌ماڵـه‌ی مـیری سـۆران خۆیان له‌لایه‌ك و، نـاكۆكی و شـه‌ڕی نێـوان میرنشـینی سـۆران و میرنشـینه كوردییه‌كانی تر له لایه‌كی تره‌وه.

٢- زه‌بر و زه‌نگ و توندو تیژی زۆری پاشای گه‌وره،وایكرد كه ناحـه‌زی لـه‌ناوخۆی دا زیـاتر بێـت، به‌تایبـه‌تی لـه‌و ناوچـانه‌ی كـه مـیری سـۆران خستبوونییه سه‌ر میرنشینه‌كه‌ی وه‌ك شه‌نگال و ئامێدی.

٣- هه‌ژاری و ره‌ش و رووتی خه‌ڵكی میرنشینی سۆران، بـه‌هۆی شـه‌ڕه زۆره‌كانی پاشای گـه‌وره، سـه‌ره‌ڕای بـه‌خێوكردنی سـوپا گه‌وره‌كه‌شـی كـه له‌سه‌ر شانی خه‌ڵكی میرنشینه‌كه بوو. كه ئه‌مه‌ش باری سه‌ر شانی خـه‌ڵكی میرنشینه‌كه‌ی گرانتر كردبوو.

## ب- هۆكاره ده‌ره‌كییه‌كان:-

١- ده‌وڵه‌تی عوسمانی كاتێك هه‌ستی بـه هـه‌وڵ و په‌لهاویشـتنه‌كانی مـیری سۆران كرد، كه‌وته پیلاندانان بۆ له ناوبردنی میرنشینه‌كه.

٢- میری سۆران هوشیاری زۆری له سیاسه‌تدا نه‌بوو له‌و كاته‌دا، چونكه له كاتێكدا كه‌هێزه‌كانی عوسمـانی خۆیـان بـۆ هێرشـكردنه سـه‌ر میرنشـینی سۆران ئاماده ده‌كرد كه‌چی پاشای گـه‌وره پـه‌لاماری چـه‌ند ناوچـه‌یه‌كی ئێرانیدا، به‌مه‌ش ئێرانی كرده دوژمنی خۆی.

٣- میری سۆران به ئاسانی بڕوای به به‌ڵێنه‌كانی ئینگلیز و عوسمانی كـردو خۆی دابه‌ده‌سته‌وه.

٤- ئینگلیز ئەو کاتە لە بەرژەوەندی نەبوو کە عوسمانییەکان لەوە زیاتر لاواز بن، بۆیە وەك چۆن دژی دەسەلاتەکەی محمد علی لە میسردا وەستا، ئاواش دژی میرنشینی سۆران وەستا، سەرەڕای ئەوەی کە هانی عوسمانی و ئێرانی دەدا کەتا بەیەکەوە پەلاماری میرنشینی سۆران بدەن.

٥- سەرەڕای ڕووسیای قەیسەریش بۆ لەناوبردنی ئەم میرنشینە کوردییە لەهەوڵداندا بوو، بەوەی لە لایەکەوە یارمەتی عوسمانی و ئینگلیزی دەداو، لەلایەکی تریشەوە یارمەتی ئێرانی دەدا.

بەم شێوەیە میرنشینی سۆران لاواز بوو بە تایبەتی وەك باسمان کرد دوای خۆبەدەستەوەدانی میری سۆران سالّی (١٨٣٦)ز و پاشان لەسالّی (١٨٤٧)ز دابە یەکجاری کۆتایی بە دەسەلاتی میرنشینی سۆران هات، بەتایبەتی دوای مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی ئەرزرۆمی دووەم کە لەسالّی (١٨٤٧ز) مۆرکرا لە نێوان دەولەتی عوسمانی و ئێرانی.

### * چوارەم: میرنشینی بابان (١٦٥٠-١٨٥٠ز):-

ناوچەی سلێمانی لە پێشدا لەژێر دەسەلاتی میرنشینی ئەردەلان بوو، مێژوونووسەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە میر(میربۆداغ بەگ بەبە) کوڕی (ئەبدالّ بەگ)ی موکریان دامەزرێنەری ئەو میرنشینەیەو، هەر بەناوی ئەویشەوە ناونراوە (بابان) یاخود (بەبە)، بە واتای (باوك)، وە بەهەموو خێزانەکەشیان وتراوە(بابان).

میر(بۆداغ بەگ بەبە)دا، توانیویەتی ناوچەی لاجان لە خێلاّتی زەرزا، وناوچەی سیوەیل لە میرنشینی سۆران و (سەلدۆز) لە قزلّباشەکان

وشارباژێڕ لە میرنشینی ئەردەڵان سەندووەتەوەو، کەرکووکیشی خستۆتە سەر میرنشینەکە.




لە دوای کۆچی دوایی میر بۆداغ بەگ برازاکەی فەرمانڕەوایی میرنشینی بابانی بردووە بەڕێوە.

مێژووی ئەم میرنشنینە (میرنشینی بابان) لە ساڵی (١٦٨٦ز)ەوە زیاتر ڕوون و دیارە، بەتایبەتی لە سەردەمی(فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە)، کە نازناوی(بەبە)ی بۆخۆی هەڵبژاردووەو، بەدامەزرێنەری دوا بنەماڵەی میرنشینەکە دادەنرێت و یەکێکە لەسەرۆک عەشیرەتەکانی ناوچەی(پشدەر و مەرگە).

ئەم میرنشینە چەند پایتەختێکی هەبووە، کە بەپێی بارودۆخی سیاسی بۆ هەر یەکێکیان گواستویەتییەوە لەوانە:(دارەشمانە،ماوەت، قەڵای بەکراوا، قەڵاچۆلان، سلێمانی کە لەساڵی ١٧٨٤ دا دروست کراوە).

فراوانبوونی ئەم میرنشینە هەر لەسەرەتاوە هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی لێی ترساون و مەترسیان لێ نیشتووە بەرامبەری. زۆربەی کات ئەم میرنشینە سەربەست و سەربەخۆ بووەو ژیاوەو هیچ پەیوەندیەکی بە عوسمانی و ئێرانییەوە نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك جار سەر بەیەکێك لەو دوو دەوڵەتە بووە.

لەم میرنشینەدا ژمارەیەکی زۆر فەرمانڕەواییان کردووە کە هەندێکیان زۆر بە تواناو لێهاتوو بوون توانیان لە ڕۆژئاواوەوە میرنشینەکە بگەیەننە ئەودیوی شاری کفری و سەنگاو و شوان و کەرکوك، و لە ڕۆژهەڵاتیشەوە تا ئەو دیوی ڕووباری سیروانی بەرن و، لە باشووریشەوە هەموو ناوچەکانی بەدرەو جەسان بگرێتەوە، لە باکووریشەوە ناوچەی هەولێر و زێی بچوك داپۆشێت ، هەر بۆیەشە مێژوونوسێکی وەك لۆنگریك میرنشینی بابان بە ئیمپراتۆریەتی بابان ناودەبات.

میرنشینی بابان پتر لە دووسەد ساڵ مایەوەو فەرمانڕەوایی یان کردووەو دەورێکی گرنگ و ئاشکرای هەبووە، لەناوچەکەداو هەندێك بەتایبەتی لەکاتی بەهێزبوونی دا، کە دەسەڵات و توانایان پەرەی دەسەند، شەڕیان لەگەڵ ئێرانیەکان و مەمالیکەکانی ژێردەستی عوسمانییەکان دەکرد، هەندێك جاریش ئەو شەڕانە ئەوەندە گەرم دەبوون و تەشەنەیان دەکردو مەسەلەی کوردیان دەبزواندو دەیان خستە بەر چاو و دەم و

لەچوار چێوەی شەڕی ناوخۆیی ناوچەکە دەردەچوو، دەبووە کێشەی جیهانی.

شوێنی ستراتیژی ئەم میرنشینە کە لە نێوان دوو هێزی گەورەی وەك دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی بوو، هەمیشە بووەتە هۆی چاوتێبڕینی تەماحکاری و حساب بۆ کردنی بە تایبەتی کە هەندێك لە پاشاکانی ئەم میرنشینەش خاوەنی ئامانج و هیواو هەستی نەتەوایەتی خۆیان بوون و هەمیشە چاویان لەوە بووە کە میرنشینەکە بکەنە بەردی بناغەی دامەزراندنی دام و دەزگایەکی گەورەی سەربەخۆ.

نموونەی ئەم هەوڵە سەربەخۆییەش، ئەو هەوڵ و تەقەلایەی میری بەناوبانگی ئەم میرنشینە میر (سلێمان بەبەی گەورە) یەکە لەورووەوە باشترین نموونەیە کە دەیویست بگاتە دام و دەزگایەکی کوردی سەربەخۆ.


ئاورەحمان پاشای بابان

ئەم میرە بەناوبانگەی میرنشینی بابان دەسەڵاتی بەرفراوانی بووەو، دەسەڵاتەکەی گەیشتووەتە ڕادەیەکی وا، کە دەوڵەتی عوسمانی مەترسی لێ نیشتووە وە لێی ترساوەو بە تەنها نەیتوانیوە پەلاماری بدات، لەبەر ئەوە لەگەڵ ئێرانییەکاندا یەك لەدوای یەك هێرشیان کردووەتە سەرو پەلاماریان داوەو تاساڵی (١٦٩٩) زدا بەسەریان دا زاڵ بوون.

یەکێکی تر لەمیرە بەناوبانگەکانی تری ئەم میرنشینە کوردییە (ئیبراهیم پاشای بابان)ە کە بەیەکێك لە میرە لێهاتووەکانی ئەم میرنشینە دادەنرێت.

ئیبراهیم پاشای بابان لەساڵی (١٧٨٤)ز دانزیك دێی (مەڵکەندی) نزیك سەرای (مەحمود پاشای مامی) بناغەی شاری سلێمانی داناوە و هەر لەو ساڵەدا واتە(١٧٨٤ز)دا، دام و دەزگای ئیداری و فەرمانڕەوایی تیایدا دروست کراوەو، هەموو دام و دەزگاکانی گواستووەتەوە ئەو شارە نوێیە واتە (سلێمانی) لە قەڵاچوالانەوە.

هەر ئەم میرە توانیویەتی مزگەوت و گەرماو و بازاڕ و سەراو چەند خانوویەك بۆ ئیش و کاری کاربەدەستان و لێپرسراوانی حکومەتەکەی (میرنشینی بابان) دروست بکات.

یەکێکی تر لەو میرە بەناوبانگانەی میرنشینی بابان میر(عبدالرحمن پاشای بابان)ە، ئەمیش نمونەیەکی تری ئاشکرای ئەوە کە ویستوویەتی میرنشینەکەی بەرەو سەربەخۆیی بەرێت، یەکێك بووە لەو میرانەی کە ناوی بە زیرەکی و ژیری دەرکردووەو خواست و خەونی نەتەوایەتی ئاشکرای هەبووەو وەك وتمان بە ئاواتی دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوایەتی بوو، بەڵام ململانێی نێو بنەماڵەکە هەلی جێبەجێکردنی بۆ نەڕەخساند.

هەوڵەکانی ئەم میرە لە ئاوەدانکردنەوەو خۆئامادەکردن بۆ سەربەخۆبوون وای لە دەوڵەتی عوسمانی کردووە، کە مەترسی لێ پەیدا بکات و عوسمانییەکانی هێناوەتە لەرزە، لەسەردەمی ئەم میرەدا میرنشینی بابان ئەو پەری دەسەڵات و بەهێزبوون و سەربەخۆیی تەواو، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە کاربەدەستانی عوسمانی بە درێژایی بیست و سێ ساڵ لە فەرمانڕەوایی ئەم میرنشینەدا، وازیان لێ نەهێناوەو هەمیشە لە

پیلانگێڕان و نەخشەدانان بوون بۆ لەناوبردنی و هەموو هەوڵ و کۆششیان داوە بۆ بەگژاچوونی و هەرچی هەوڵیان دا هیچیان لەگەڵ ئەو میرەدا پێ نەکراو، چ بە کڕینی ئەم و ئەو، یاخود سوپا ناردن و دەسیسە و جاسوسیکردن بێت هەمووی وەك بلقی سەر ئاو دەتەقی بەرامبەر زیرەکی و خۆڕاگری میر(عبدالرحمن پاشای بابان).

لە میرە بەناوبانگەکانی تری میرنشینی بابان(سلێمان پاشای بابان) کە لە دوای عبدالرحمن پاشای بابان فەرمانڕەوایی میرنشینی بابانی کردووە، ئەم میرە بەپێچەوانەی زۆربەی میرەکانی دیکەی پێش خۆی کە شەڕو شۆڕی دژی عوسمانی و ئێرانی تیادا ڕووی نەداوە، هێمنی و ئاسایشی گەورەو زۆر باڵی کێشا بوو بەسەر میرنشینەکەی ، ئەم شێوە فەرمانڕەوایی یە لە هێمنی و ئاسایش بووە هۆی پێشکەوتنی ڕواڵەتە شارستانێتییەکان لەو چەند ساڵەی فەرمانڕەوایی یەی دا کە لەساڵانی(١٨٣١–١٨٣٨ن)بوو.

کە دەتوانین پێشکەوتنەکانی ڕەواڵەتە شارستانێتییەکان لە سەردەمی (سلێمان پاشا)دا بەم شێوەیە ڕیزبەند بکەین:

١– گەشەکردنی باری ئابووری.

٢– گەشەکردنی بواری فێرکردن و خوێندن لە حوجرەی مزگەوتەکاندا.

٣– دەرکەوتنی هونەری کوردی و گەشەسەندنی.

٤– دەرکەوتنی ڕێبازی ئایینی وەك ڕێبازی نەقشبەندی و قادری.

٥– دامەزراندنی ڕێبازی ئەدەبی کلاسیکی کوردی لەسەر دیالێکی کرمانجی ناوەڕاست و ئەدەبی یەکگرتووی کوردی کە گەورەترین دەستکەوتی میرنشینی بابانە.

له میره بەناوبانگەکانی تری میرنشینی بابان کە دوا میری میرنشینی بابانە ئەویش میر (ئەحمەد پاشا)یە کە بە یەکێك لە میرە سەربەخۆکانی ئەم میرنشینە دادەنرێت، هەمیشە لەهەوڵی سەربەخۆیی میرنشینەکەیدا بووە.

ئەم میرە سوارچاك و لێهاتوو و زیرەك و رۆشنبیر بووە و ئاواتی سەربەخۆیی وڵاتەکەی بووە و هەوڵ و تێکۆشانی لە پێناوی دا کردووە.

ئەم میرە (ئەحمەد پاشا) پەیوەندی لەگەڵ ئێران و عوسمانییەکاندا باش نەبووە، چونکە ئەم میرە هەوڵەکانی لەسەربەخۆیی بوونی وڵاتەکەیدا بەردەوام بووە، لەبەر ئەوە ئێرانیش بە بەردەوامی لە هەوڵ و پیلانگێڕاندا بووە دژی ئەم میرە.

وە هەروەها دەوڵەتی عوسمانیش بەهەمان شێوە دژایەتی یان کردووە، چونکە عوسمانییەکان هەموو کوردستانیان بە موڵك و سنووری دەوڵەتی خۆیان زانیوە، لەبەر ئەوە عوسمانییەکان دەیانویست میرنشینی بابان دەبێت ملکەچیان بێت و گوێڕایەڵی سوڵتانی عوسمانی بێت.

ئەم بۆچوونانەی عوسمانی و ئێرانی بەرامبەر ئەم میرە زۆر پێچەوانەبوو، چونکە ئەم میرە(ئەحمەدپاشای بابان) هیچ گوێڕایەڵییەکی نە بۆ عوسمانییەکان نە بۆ ئێرانییەکان پیشان نەداوە، لەبەر ئەوە ئەو دوو دەوڵەتەش دژایەتیان دەکرد، تاوای لێهات عوسمانییەکان سوپایان هێنایە سەری.

ئەوەی ئەم میرەی زیاتر بەو ئاڕاستە سەربەخۆییەدا دەبرد، ئەو هەستە نەتەوایەتییەو رۆشنبیرییە پێشکەوتوانەی ئەورووپا بوو کە لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا سەری هەڵدا بوو، ئینجا لەبەر ئەوەی (ئەحمەد پاشای بابان)

خۆشی ڕۆشنبیر و هۆشیار بوو، سەرەڕای ئەوەی کە (ئەحمەد پاشا) بێ ئاگا نەبوو لەم مەسەلانەدا، بەڵکو بە پەرۆشەوە هەوڵی بۆ دەدا کە سەربەخۆ بێت.

لە سەردەمی (ئەحمەد پاشای بابان)دا شارستانی بابان زۆر گەشەی بەخۆیەوەدی،چونکە لە هەوڵدانی ڕۆشنبیریکردنی خەڵکەکەی دابوو، بەوەی کە ژمارەیەکی زۆر مزگەوتی دروستکرد و لەناو مزگەوتەکانیشدا حوجرەی بۆ خوێندن دروست کردو بایەخێکی تایبەتی بەم حوجرانەدەدا. وە لەناو مزگەوتی گەورەدا کتێبخانەیەکی دروستکرد کە بە کتێبخانەی بابان ناسراوە، خۆی واتە میر(ئەحمەد پاشا)گەلێك ناوچە گەڕاوە بۆ پەیداکردنی کتێب، وەك چووە بۆ بەغداد و ئەستەمبوڵ و خۆشی ئاشنا کردووە بە کتێبە ئەوروپییەکان و ژمارەیەکیشی لەگەڵ خۆیدا هێناوەتەوە بۆ سلێمانی و لەو کتێبخانەیەدا دای ناون.

ئەمە سەرەڕای گەشەکردنی باری ئابووری میرنشینەکەی کە لە گەشەکردنێکی بەرچاودا بووە.

بەڵام سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵ و تێکۆشانەی میرانی میرنشینی بابان دەیان دا بۆ ئەوەی سەربەخۆ بن و بەسەربەستی بژین و، دووربن لە ئاژاوە و ئاژاوەگێڕی، کەچی دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی و کاربەدەستانیان لە پیلان گێڕان و ئاژاوە نانەوەو دووبەرەکی دروستکردن دژی ئەم میرنشینە دەستیان هەڵنەدەگرت و بەردەوام بوون لە دژایەتیکردنی.

لەبەر ئەو هەموو هەولانەی دوژمنانی دەیان دا بۆ لاوازکردنی میرنشینی بابان، (ئەحمەد پاشا) کەدوا میری ئەم میرنشینە بوو هەستی پێ کردبوون، لەبەر ئەوە هەوڵی سەربەخۆیی میرنشینەکەی دەداو لەبەرئەوە،سوپایەکی

تـری دامەزرانـد لەسـەر شـێوەی تـازە، کـە ئـەم سـوپا نوێیـە بـە چـەك و جبەخانە و تۆپ پڕ چەك کران، تەنانەت جلو بەرگی تایبەتی یـان بـۆ دابـین کرا، لەسەر شێوەی نوێی ئەوروپی و بەهەمان شێوە مەشـقیان پـێ دەکـرا. ئەمە بێجگە لەو ژمارەیەی کە یاساوڵی خۆی بوون کـە نزیکـەی (٢٥) هـەزار سەرباز دەبوون و، سەرەڕای سوپا کۆنەکەی میرنشینی بابان.

ئەم خۆ پڕ چەك کـردن و زیـادکردنی ژمارەیـە لـە سـەرباز، بەڵگەیـە بـۆ ئەوەی کە میرەکانی میرنشینی بابان، بەتایبەتی (ئەحمەد پاشا) هەسـتیان بە مەترسی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانـی کـردووە، بـۆ هێرشـکردنە سەری، سەرەڕای ئەوەی ئەو دوو دەوڵەتەش پڕ بە دڵ لەو هەنگاوانەی ئەم میرنشینە ترساون کە بەرەو پێش دەچوو، ئـەم میرنشـنینە وای لـێ هـاتوو لـەڕووی چـەکدار و هێزەکانییـەوە کـە ئـەو دوو دەوڵەتـە نـەیان دەتـوانی بەتـەنها هێرشـی بکەنـە سـەر. دەسـت تێـوەردانی بـەردەوامی دەوڵـەتی عوسمانی و ئێرانی لەکاروباری نـاوخۆی میرنشـینەکەداو، هـەروەها نـاکۆکی ناوخۆی نێوان خودی ئەندامانی بنەماڵەی بابانیش هۆیەکی تری لاوازبوون و ڕووخانی میرنشینەکەیە، ئەوەتا(ئەحمەد پاشا)ی بابان ئاماژە بەوە دەکات و دان بەو ڕاستییە تاڵەدا دەنێت وە بەگەڕیدەیەکی وەك (کلۆدیۆس جێمس ریـچ) دەڵێـت: ((ئـەنجامی دووبـەرەکی میرەکانمـان تێداچـوونی خۆمانـە، ئـــەگینا عوسمـــانی و ئێرانییـــەکان دەرەقـــەتمان نـــەهاتن گـــەر ئـــەم دووبەرەکییانەیان نەکردایەتە هەل و داردەست بە دەستیانەوە).

هەروەها بەهۆی شەڕ و ئاژاوەی نێوان میرنشینی بابان و میرنشینەکانی دراوسێی بەتایبەتی میرنشینی سۆران و ئەردەڵان، کە ئەمەش کۆسپێك بوو

لە بەردەم سەربەخۆ بوون و یەکگرتنی میرنشینەکان دژی هێزە بێگانەکانی عوسمانی و ئێرانی.

بێتۆمان شتێکی ئاشکرایە کە لەو کاتەدا ڕژێمی میرنشینەکانیش ڕژێمی چینایەتی دەرەبەگایەتی بووە، ئەمەش دۆخی ئابووری بەرەو وەستان و پەشێوان برد، لەبەر ئەوە ئابووری میرنشینەکە وای لێ دەهات کەبەرەو لاوازی بڕوات، ئەمەش دۆخێکی وا دواکەوتوویی دەرەخسان کە کاریگەری خراپی دروست کرد لەسەر باری کۆمەڵایەتی و ئابووری و بەرەو دواوەی برد، جا لەبەر ئەوەی ئەو ناوچانە میرنشینەکان لەبارودۆخێکی دواکەوتویی وادا دەژیان کە پڕ بوو لەشەڕ و هەراو ناکۆکی لەبەر ئەوە سەرمایە ڕووی تێ نەدەکردن تا ئابوورییەکان ببوژێتەوە.

بەڵام جگە لەم هۆکارانە بەمەرکەزیەت کردنی دەوڵەتی عوسمانی کە لە سەردەمی سوڵتان مەحمودی دووەمەوە دەستی پێکرد، هۆیەکی تری سەرەکی ڕووخانی ئەم میرنشینەیە بەتایبەتی دوای ڕێکەوتنامەی ئەرزرۆمی دووەم١٨٤٧ز.

*** پێنجەم: میرنشینی بۆتان:-**

میر (عبدالعزیز) بە دامەزرێنەری ئەم میرنشینە دادەنرێت، بۆیە زۆر جار بەم میرنشینە وتراوە میرنشینی (ئازیزان) یاخود (عەزیزان) لە ناوچەی (جزیرە) و دەوروبەری دروست بووە.

ئەو هۆزەی لەم ناوچەیەدا جێگیر بووە، هۆزی (بۆتی) یاخود (بوختی) بووە کە هۆزێکی گەورەو کۆنی کوردە، وە بۆ نەترسی و ئازایی و نەبەردی و مەردی و داکۆکیکردن لەسەربەستی بەناوبانگ بوون و لە مەیدانی سوار چاکی و خۆڕاگری دا سەروەر بوون، لەکاتی شەڕو تەنگانەدا هەموو بەیەك

دەنگ و بەیەك گیان و دڵ و، بۆ یەك ئامانج تێ کۆشاون و لەکوردستاندا ناویان لەگەڵ سەروەراندایە. لەم میرنشینەدا زۆر لە میری بە تواناو بەهێزو لێهاتوو فەرمانڕەواییان کردووەو توانیویانە میرنشینەکەیان بپارێزن و فراوانی بکەن و لەدەستی دوژمنان دووری بخەنەوە، بە تایبەتی دوژمنانی دەوروبەر.

لەو میرە بەتواناو لێهاتوانەی کە لە بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد دا دەورێکی گرنگ و کاریگەری لەبەر چاوی هەبووە میر (بەدرخان)ە کە بە (بەدرخان پاشا) ناوبانگی دەرکردووەو ناسراوە.

ئەم میرە لەساڵی (١٨٢١ز) دا لەتەمەنی (١٨) ساڵی دا فەرمانڕەوایی میرنشینەکەی گرتووەتە دەست و بووە بەفەرمانڕەوای میرنشینی(بۆتان).

لەساڵی (١٨٢٨ز) سوڵتان (مەحموودی دووەم)ی سوڵتانی عوسمانی ویستی دەوڵەتی عوسمانی جارێکی تر زیندوو بکاتەوەو بەرگێکی نوێی بەبەردا بکات و (مەرکەزیەت) لەفەرمانڕەوایی دا بچەسپێنێ، لەم کاتەداو لە ئەنجامی ئەم سیاسەتەی سوڵتانی عوسمانی بەرامبەر میرنشینە کوردییەکان، بەکاری دەهێنا وای کرد کە ژمارەی میرنشینە کوردییەکان، تەواو کەم بکاتەوەو، تەنها چەند میرنشینێکی کەم مابوونەوە کە هەرە گەورەیان و دەسەڵاتداریان (میرنشینی بابان و سۆران، بادینان، هەکاری و بۆتان) بوو بەسەرکردایەتی میر (بەدرخان پاشا).

لەبەر ئەوەی کە سوڵتان (مەحموودی دووەم)ی سوڵتانی عوسمانی بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی لە چەسپاندنی (مەرکەزیەت) و دەسەڵاتی عوسمانی لە میرنشینە کوردی یەکاندا دەستی پێ کرد، بەڵام دەست پێ کردنەکە بە پەلاماردانی میرنشنەکان و میرە کوردەکان و سەرۆکە

کوردەکــان دەســتی پــێ کــرد بــەلابردنیان لــەدەزگاو فەرمانڕەواییــە جیاجیاکانــدا لــە میرنشــینەکانی خۆیانــدا، تــورکی لــە جێیــان دەکــرد بــە دەسەڵاتدار لە میرنشینە کوردییەکانـدا، ئەمـەش بـووە هـۆی نـاڕەزایی لای دانیشتوانی میرنشینە کوردەییەکان و مـیر و دەرەبەگـەکانیش، بـووە هـۆی ورووژاندنی ناوچە کوردییەکان بەتایبەتی میرنشینی (بۆتان).

نــاڕەزایی و دەربــڕینی مــیر و دەرەبەگــەکانی میرنشــینە کوردییــەکان بەرامبــەر بــە(مەرکەزیــەت)ی عوسمــانی لەســەردەمی ســوڵتان(مــەحموودی دووەم)دا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کـە میرەکـان ئـەو مافـەیان نـەماو لێیـان سەندرایەوە کە میرایەتی لە ناو بنەماڵەکەی دا بە پشتاو پشت بێت، واتە لە باوکەوە بۆ کوڕەکەی بێت.واتە بـە (مەرکەزیـەت) لـە بەرژەوەنـدییان دراو، میللـەتیش لـە ئـەنجامی ئـەم کـارەدا (مەرکەزیـەت) ڕاسـتەوخۆ کەوتـە ژێـر دەستی بێگانەوە، ئەمەش بـاری سـەر شـانی میللـەتی هێنـدەی تـر گـرانتر کرد، چونکە جاران لـە ژێـر دەسـتی میرەکـانی خۆیـان بـوو کـە پەیوەنـدی هۆزایـەتی بەیەکـەوەی دەبەسـتن و بەیـەك زمـانیش دەدوان، بـەڵام ئێسـتا کەوتونەتــە ژێــر دەســتی بێگانــەی تــورکی دڕو، دڵڕەقانــە دەیــان چەوسـاندنەوەو، بـاج و سـەرانەیەکی زۆریشـیان خسـتبووە سـەر شـانیان. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە کێشەکە زیاتر ئاڵۆزتر بکـات و بەرژەوەنـدیان زیـاتر مەترسـیدارتر بێـت، وایکـرد کـە هەسـتی نەتەوایـەتی یـان زیـاتر بورووژێنێ.

ســوڵتان مــەحموودی دووەمــی عوسمــانی تــەنها بــە مەرکەزیەتــەوە نەوەستا، بەڵکو زیاتر پێی لێ هەڵبڕی و دەیویست سوپایەکی گەورەش لە کوردەکان دروسـت بکـات و سـوودیان لێ وەربگرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش

کەوتــە ســەربازگرتن لــە کوردەکــان، ئــەم کردەوانــەی ســوڵتان مــەحمودی دووەم زیاتر دۆخەکەی نالـەبارتر کـردوو، ئەوەنـدەی تـر کێشـەکانی بـەرەو تەقاندنەوە برد.

هۆی سـەرەکی سـوڵتان (مـەحموودی دوووەم) لـەم کردەوانـەی کـە لـە کوردستاندا دەی کرد، بۆ چەسپاندنی (مەرکەزیـەت) دەسـتی پـێ کـرد بـۆ ئەوەنە بوو کە دەوڵەتی عوسمانی زیندووبکاتەوە بەشێوەیەکی سـەرەکی، بەڵکو لەوە گرنگتر لای عوسمـانی یـەکان لـەناوبردنی دەسـەڵاتی میرنشـینە کوردییەکان بوو.

هەر لەبەر ئەمەش بوو کە ئەم سیاسەتەی سوڵتان مەحموودی دووەم بۆ میرە کوردییەکان ناوەڕۆکێکی نەتەوایەتی وەرگرت، لەبەر ئـەوە ڕوخسـاری کوردایەتی و نەتەوایەتی لەو میرنشینە کوردییانەدا کۆبووەوەو، بوونە هۆی دەرکەوتنی هەستی نەتەوایەتی و نیشتمان پەروەری و جموجۆڵی زۆر لەناو هێزە کوردییەکانداو دەستەی هوشیارانە تیایاندا گەشەی کرد.

ئەو هەموو ڕق و قینـەی نـاودڵی چـینی جوتیـار و زەحمەتکێشـی کـورد دژی دەوڵەتی عوسمانی ڕەگـی داکوتـابوو، ئەمانـە هـەمووی هەڕەشـەیەکی گەورە بوو بۆ دەوڵەتی عوسمانی، چونکە لابردن و نەمانی ئەو میرنشینانەو ملکەچ کردنی کوردیان کردبووە کارێکی پێویست، هەربۆیە لە یەکـەم ڕۆژی دەسـتبەکاربوونی مـیر (بـەدرخان پاشـا) هەسـتی بـەو سیاسـەتە خراپـەی سوڵتانی عوسمانی سوڵتان مەحمودی دووەم کردبـوو، هۆیـەکی گـرنگ بـوو بۆ ڕاپەڕینەکەی میر (بەدرخان پاشا).

میر(بەدرخان پاشـا)هـەر لـە یەکـەم ڕۆژی فەرمانڕەواییەکەیـدا بـیری لـە ڕزگـارکردنی کوردسـتان لـە سـتەمی عوسمانییـەکان دەکـردەوە، بـۆ ئـەم

مەبەستەش ویستی هەموو میرنشینەکانی کورد یەك بخات و دەسەڵاتێکی سەربەخۆ بۆ کورد پێکەوە بنێ.

بۆ جێبەجێکردنی ئەم نەخشەیە، دەبوایە تواناو وزەی کورد لەژێر ئاڵای کوردایەتی دا جۆش بدرێت، هەروەها بۆ خۆپاراستن و تێکشاندنی هێرشی داگیرکەران دەبوایە کارخانەی چەك و کەرەستەی جەنگی لەکوردستاندا دابمەزرێنێ و کەسانی شارەزای بۆ دابین بکرێت، لەبەر ئەوە بۆ یەکخستنی میرنشینە کوردییەکان، میر دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی داواکەی گەیشتە لای هەموو سەردارەکانی کوردو داوای لە هەموویان کرد کە ڕیزەکانیان یەك بخەن و لە پێناوی ڕزگاری و سەربەخۆیی کوردستاندا بکەونە کارو، هەموو ڕابەران و سەرانی خێڵەکانی کورد تێکڕای پیاوانی ئایین و بەشێکی زۆری کۆمەڵانی خەڵکی (وان، هەکاری، موش، خێزان، سەعرەد، قارس، موسڵ، ومیرنشینی ئەردەڵان لە ئێران). هاتن بە دەنگ بانگەوازو داواکەی میر بەدرخانەوەو هەموویان پەیمانیان دا کە درێغی نەکەن لە هەوڵەکانیان بۆ ڕزگاری کوردستان و چوونە ڕیزی ئەو پەیمانەوە کە بە پەیمانی (پیرۆز) ناسرا.

میر (بەدرخان پاشا) لەهەمان کاتدا دەستی بەخۆ ئامادەکردن کرد لە رووی سوپایی یەوە بە تایبەتی، بۆ نموونە: لە جزیرە دوو کارخانەی دامەزراند، یەکێکیان بۆ دروستکردنی چەك و ئەوی تریان بۆ دروستکردنی باروت، لەسەرێکی ترەوە، بۆ پشتبەستن بەخۆی دەستی کرد بە ئامادەکردنی کەسانی شارەزاو کارامە کە بتوانێت لە مەسەلەی چەکسازی و هێنانە بەرهەمی کەرەستەی جەنگی دا پشتیان پێ ببەسترێت و کۆمسیۆنێکی چەند کەسی نارد بۆ ئەوروپا بۆ ئەم مەبەستە.

چالاکی و کردەوەکانی میر (بەدرخان پاشا) ئەژنۆی سوڵتانی عوسمانی شکاند، لەسەرەتادا سوڵتانی عوسمانی ویستی بە بەڵێنی درۆ گوایە نیازی وایە سنوری میرنشینی بۆتانی بۆ فراوان دەکات بەمە ویستی میری بۆتان بخەڵەتێنێ و، بەم جۆرە هەموو نەخشەکانی سەبارەت بە ڕزگاری و سەربەخۆیی کوردستانی پێ لەباربەرێت، بەڵام (میر بەدرخان) بڕوای پێ نەکردو سوڵتانی عوسمانیش کە بۆی دەرکەوت لەم بارەیەوە هیچی پێ ناکرێت، بۆیە پەنای بردەبەر سازدانی پیلانی ترو بەفیتی سوڵتان لەناوخۆی کوردستاندا ئاژاوەو پشێوی و پاشاگەردانی سازکرا، بۆ ئەوەی میر نەپەرژێتە سەر جێبەجێکردنی نەخشەکانی کە بریتی بوو لە هەوڵدان بۆ ڕزگارکردنی کوردستان و دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی لە کوردستاندا.

سەرەڕای پیلان و دروستکردنی ناکۆکی لەنێوان سەرکردە کوردەکان و دژایەتی دروستکردن لەلایەن عوسمانییەکانەوە، بۆ ئەوەی نەخشەو پیلانەکانی بە درخان پاشا سەرنەگرێت لە ڕزگاری کوردستان، ئینگلیز و فەرەنسییەکان بەبیانووی جیا جیا بۆ دەستکەوتە ئابووری و سیاسیەکانی خۆیان پشتی دەوڵەتی عوسمانی یان گرت و یارمەتی عوسمانییەکانیان دەدا، بە چەك، دوای گەیشتنی یارمەتییەکانی ئینگلیز و فەرەنسا دەستی کرد بە لەشکرکێشی سوپایی دژی بەدرخان پاشای میرنشینی بۆتان.

سەرەڕای یارمەتییە دەرەکیەکان کە بە سوپای عوسمانی دەگەیشت، لەشکری عوسمانی نەیتوانی سەر بە گەلی کورد (میرنشینی بۆتان) دابنەوێنێ و ناچار بوو کە دوای چەند شەڕێك بەسەر شۆڕی بگەڕێتەوەو کوردستان بەجێ بهێڵێت.

سەرکەوتنەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و ژێر کەوتنی سوپای عوسمانی دەرفەتێکی باش و لەباری بۆ(میر بەدرخان پاشا)رەخسان کە لە ساڵی(١٨٤٢ز)سەربەخۆیی کوردستان ڕابگەیەنێت و پاشان دەستی کرد بەدەرکردنی(پارە)بەناوی خۆیەوە کە لەروویەکی دا نووسرابوو(میر بەدرخان بۆتان)وە لەڕووەکەی تری دا نوسرابوو(ساڵی١٢٥٨ی کۆچی).

سنووری دەوڵەتی بە ئەندازەیەك فراوان کرد کە لە ناوچەی (وان) ـەوە هەتا (مهاباد) و (رەواندز) لەلایەك و، لە(موسڵ) ـەوە هەتا (دیاربەکر) لەلایەکی ترەوەلەژێر دەسەڵاتی خۆی دابوو، پاشان میر(بەدرخان پاشا)توانی شنگال و سیرەت و وێران شار و سوێرەك و دیاربەکر و شنۆو ئورمیە بکاتە بەشێکی دەوڵەتەکەی.

سەرەڕای خراپی دەوڵەتی عوسمانی و هەوڵەکانی بۆ لەناوبردنی ئەم دەوڵەتە ئینگلیز و فەرەنسییەکانیش لەسەر دامرکاندنەوەی جولانەوەی رزگاریخوازی کوردستان پێیان داگرت و ژێر بەژێر دەولەتی عوسمانییان لەکورد هان دەدا و لەشکرێکی نوێی تریان بۆ دامرکاندنەوەی جولانەوەی ڕزگاریخوازی کورد پێك هێنا، سەرکردایەتی ئەو لەشکرەش بە عوسمان پاشاو عمر پاشاو سەبری پاشا سپێرا.

یەکەم پێکدادانی چەکدارانەی نێوان عوسمانی و پێشمەرگەکانی کوردستان لەنزیك ئورمیە ڕووی دا، لەئەنجامدا سوپای عوسمانی شکا. لە کاتێکدا میر (بەدرخان پاشا) خەریکی دەرپەڕاندنی دوژمن بوو، هەواڵێکی وا بڵاوبووەوە کە گوایە دەستی چەپی لەشکری کوردستان بەسەرکردایەتی (یەزدان شێر) ئامۆزای میر (بەدرخان پاشا) سەنگەری پێشمەرگایەتی چۆڵ کردووەو چووەتە ریزی دوژمنانەوە، یەزدان شێر بەهۆی ئەوەی کە لەگەڵ

(بەدرخان پاشا) ناکۆك بوو، عوسمانییەکان ئـەم ناکۆکییـەیان بەهـەلزانی و توانیان (یەزدان شـێر) فریـو بـدەن و، یـەزدان شـێریش ویسـتی بـەو لادانـە تۆڵەی خۆی لەمیر بەدرخان پاشا بکاتەوە، لە ئەنجامـدا عوسمانییـەکان بـە پشـتیوانی یـەزدان شـێر ناوچـەی جزیرەیـان داگـیر کـرد، بـەلام هێـزی پێشمەرگە دوای چەند شەڕێکی خوێناوی ناوچەی (جزیرە) یان جارێکی تـر ڕزگار کردەوە، لەدەستی عوسمانییەکان و پاکیان کردەوە.

بەلام جیابوونەوەی یەزدان شێر میر بەدرخانی شپرزەکردو ناچاری کـرد بـەرەو قـەلای (ئـارۆخ) بکشـێتەوە، پاشـان عوسمانییـەکان کەسـەر لـەنوێ خۆیان یەکخستەوەو هێزی تریان بۆ هات و لەهەر چوارلاوە گەمارۆی قـەلای (ئارۆخ)یان دا.

میر بەدرخان و پێشمەرگەکانی ماوەی هەشت مانگ داکۆکیـان لەقەلاکـە کـرد، پاشـان ئازووقـەو کەرەسـتەی جـەنگیان لـێ بـڕا، ناچـار بـوون بێنـە دەرەوەو هێرشێکی بەربلاویان کردە سەر سوپای عوسمانی و شەڕی مان و نـەمانیان کـرد،دوای پێکـدادانێکی قارەمانانـەی پێشـمەرگەکان. شـەڕێکی خوێناوی و زیـانێکی زۆر، مـیرو پاشمـاوەی هێزەکـەی دەسـتگیرکران، بـەم شـێوەیە کۆتـایی بـەو جولانـەوە ڕزگـاریخوازەی کوردهـات و مـیر ڕەوانـەی ئەستەمبولّ کرا.

پاشـان ئەگـەر چـی نـەوەکانی بـەدرخان پاشـا گـەلێك شۆڕشـیان دژی عوسمانییەکان بەرپاکردەوە، بەلام مەخابن سەرنەکەوتن و تیشـکی زێـڕینی ئەو میرنشینەش کـە زۆر بـەهێز بـوو کوژایـەوەو، بـەلام لەمێـژووی خـەباتی نەتەوایەتیمان دا هەرگیز ناکوژێتـەوەو، بەلاپەڕەیـەکی پرشـنگداری زێـڕینی هەمیشە درەوشاوەی ژیانی کوردایەتی دادەنرێت.

هۆكارەكانی تەقینەوەی بزووتنەوەی رزگاریخوازی كورد ساڵی ١٨٤٢ز لە میرنشینی بۆتان:

١- لەو كاتەدا میرنشینی بۆتان بەهێزترین دەسەڵاتی كورد بووە.

٢- بوونی سەرۆكێكی ئازاو هۆشیاری لێهاتووی نەتەوایەتی و خاوەن بیری رزگاریخوازی كورد وەك میر (بەدرخان پاشا).

٣- لەناوچوونی میرنشینی سۆران بە دەستی دەوڵەتی عوسمانی كە ماوەیەك لەوەو پێشتر تیاچوو بوو.

٤- لاوازكردنی میرنشینی بابان هەر بەدەستی عوسمانییەكان.

٥- بوونی دەستەیەكی هوشیار و رۆشنبیری كورد و گەڵاڵەبوونی هەستی نەتەوایەتی كوردی لایان و كاریگەرییان لەسەر زۆربەی چین و توێژەكانی كۆمەڵی كوردی.

## شەشەم : حكومەتی زەند لە ئێران ١٧٥٣ – ١٧٩٤ ز

### أ- باری ئێران پێش دامەزراندنی حكومەتی زەند:

دوای كوژرانی نادر شای ئەفشار لە ٢٠ی حوزەیرانی ١٧٤٧ز دا، جارێكی تر بارودۆخی رامیاری ئێران تێكچوو، چونكە هەر میرو سەرۆكێك لە هەر هەرێم و ناوچەیەكدا هەوڵیاندەدا دەسەڵاتێكی سەربەخۆو تایبەت بە خۆیان دابمەزرێنن و سنووری دەسەڵاتیشیان لەسەر حیسابی دەسەڵاتی هەرێمەكانی تر فراوان بكەن، ئەمەش بوو بەهۆی سەرهەڵدانی ئاژاوە و پاشاگەردانی و دزی و رێگری لە وڵاتی ئێراندا.

یەکێك لە بەهێزترین ئەو کەسایەتیانەی لەو ماوەیەدا لەسەر شانۆی سیاسی رووداوەکانی ئێراندا دەرکەوت (کەریم خانی زەند ) سەرۆکی عەشیرەتی (زەند)ی کوردی بوو، کە لە خۆرئاوا و باشووری خۆرئاوای ئێراندا نیشتەجێ بوون. سەرەتا کەریم خان توانی بناغەی حکومەتێکی میللی لە باشوری ئێران بەتایبەتی لە ناوچەکانی (شیراز و ئەسفەهان) دابمەزرێنێت.

دواتر سنوری دەسەلاتی کەریم خان هەموو ئێرانی گرتەوە. لە سەرەتای دامەزراندنی دەسەلاتی زەندییەکاندا، (ئەسەدخانی ئەفغانی) بناغەی حکومەتێکی تری لە هەرێمی ئازەربایجانی ئێران (تەبرێز و ئەردەبیل) دامەزران بوو، هەروەها (محەمەد حەسەن خانی قاجار) بناغەی حکومەتێکی تری لە باکووری ئێران (مازەندەران) و دەورو پشتی دا دامەزراند بوو.

سەرەتا کەریم خان لای قەزوین رووبەرووی (ئەسەدخان) بۆوە، بەلام زەندییەکان شکستیان خوارد و بەرەو چیاکانی دەوروپشتیشیراز پاشەکشیان کرد. هۆز و تیرە کوردییەکانی دەوروبەری شیراز چوونە پال هێزەکانی کەریم خان و دوای دوو شەڕی یەك لە دوای یەك زەندییەکان توانیان (ئەسەد خان) تێکبشکێنن. دواتریش (ئەسەدخان) لەبەرامبەر هێزەکانی (محمەد حەسەن خانی قاجار) دا شکست دەخوات، بۆیە بە ناچاری روو دەکاتە بەغداد بۆ لای عوسمانییەکان، بەلام عوسمانییەکان پەنایان نەدا، بۆیە دووبارە گەڕایەوە بۆ ئێران و خۆی دایە دەست (کەریم خان) ئەویش رێزی زۆری لێگرت و وەك کەسی خۆی پەسەندنی کرد.

یەکێك لە دوژمنە بە هێزەکانی تری کەریم خان (محەمەد حەسەن خانی قاجار) بوو.تا ئاستێکی زۆر سەرکەوتنی یەکجارەکی کەریم خان بە لە ناوبردنی (محەمەد حەسەن خانی قاجار)ەوە بەسترا بۆوە.دوای تێکشکاندنی (ئەسەدخان)، (محەمەد حەسەن خانی قاجار) بە لەشکرێکی ئێجگار گەورەوە پەلاماری کەریم خانی داوە، زەندییەکان لە شەڕەکەدا تێکشکاون و بەرەو شیراز پاشەکشەیان کردووە. لەشکری قاجار گەمارۆیەکی توندیان خستە سەر شیراز. لەم کاتەدا کەریم خان هێزێکی بە سەرکردایەتی (شێخ عەلی خانی زەند) لە دواوە ناردە سەر لەشکری قاجار، دوای شەڕێکی قورس زەندییەکان سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەستهێنا. بەمەش هێزەکانی قاجار شیرازەیان تێکچوو و پەرش و بڵاوبونەوە. محەمەد حەسەن خانیش خۆی گەیاندۆتەوە مازندەران. دوای ئەم سەرکەوتنە ( ١٧٥٦ ز) کەریم خان گەڕایەوە بۆ ئەسفەهان و لەوێش خەڵك بە خۆشیەوە پێشوازیان کردووە. بەمجۆرە زۆری نەبردووە تا هەموو وڵاتی ئێران کەتۆتە ژێر دەسەڵاتی کوردانی زەند. بەمجۆرە کەرم خان بە ئامانجی خۆی گەیشت کە بریتی بوو لە دامەزراندنی حکومەتێکی سەربەخۆ.

## * کارەکانی کەریم خان :

کەریم خانی زەند دوای سەرکەوتن بەسەر دوژمنەکانی و دامەزراندنی حکومەتی سەربەخۆ. گەلێك کاری گرنگی لە ئێراندا ئەنجامدا، لەوانە:

١ – بەمەبەستی نەهێشتنی مەترسی قاجارەکان ، هێرشی کردە سەر ناوچەی (مازەندەران) و پاش شەڕێکی خوێناوی لەشکری قاجارەکانی

شـكاند و (محەمـەد حەسـەن خـانی) بـە دیـل گـرت و لـە (شـیراز) خسـتیە بەندیخانەوە.

٢- دوای مازەنـدەران دەسـتی گـرت بەسـەر (گـەیلان ، ئازەربایجـان ،خوراسـان) و تـەواوی ئێـران و حکومـەتێکی میللـی دادپـەروەری تێـدا دامەزرانـد. دوای ئـەوەش کەوتـە هەڵـدان بـۆ نەهێشـتنی زوڵـم و زۆرداری و ستەم و بڵاوکردنەوەی دادپەروەری. تەنانەت کەریم خان بە دادپەروەرترین فەرمانڕەوا دادەنرێت لـە مێـژووی نـوێی ئێرانـدا و ئەوروپیـەکان ناویاننـاوە (پادشای باش — الملك الصالح). د. عبدالرحمن قاسملۆی شـەهید لـەبارەی ماوەی حوکمڕانی کەریم خانەوە دەڵێ: (( سەردەمی دەسەڵاتی کەریم خان ١٧٥٣ — ١٧٧٩ جـوانترین فەسـڵی مێـژووی گـەلی کـورد بـوو لـە ئێـران)). کۆنسوڵی فەرەنساش لە بەغدا لە نامەیەکیدا کەساڵی ١٧٦٣ بۆ (پاریس) ی ناردووە لە بارەی (کەریم خان) و دەڵێت : (( لە ژێر رابەرایەتی کەریم خاندا کە خـاوەن دەسـەڵات و کەسـایەتی و ئاکارێکی زانایانەیـە ، وا دیـارە وڵات (ئێران) کەوتۆتە گەشەکردن و بـارودۆخ جـێگیر بـووە و هێمنـی و ئاسـایش جێگای ئاژاوە و شێوی گرتۆتەوە)).

٣- کەریم خان پیاوێکی رەفتار جـوان بـووە، لـە ئـیش و کاریـدا لێبـووردە بووە، پشتگیری زانست و زانیاری و خوێنـدەواری دەکـرد، هەمیشـە کـۆڕی دانیشتنەکانی بە شاعیران و خوێندەواران و رۆشـنبیران گـەرم وگـوڕ بـووە. لەماوە حوکمڕانی ئەودا گڵکۆی (حافزی شیرازی) و (سەعدی شیرازی) سـەر لەنوێ هەڵبەستراونەتەوە و نۆژەن کراونەتەوە.

٤- بایـەخی زۆری بەمەسـەلەی ئاوەدانکردنـەوەی وڵات داوە، لـەماوەی دەسـەڵاتیدا بازرگـانی گەشـاوەتەوە، کشـتوکاڵ پەرەیسـەندووە، مێـژوو

نووسێکی ئێرانی لەمبارەیەوە دەڵێت: (( ڕەنگی ئاوەدانی هەموو ئێرانی گرتبۆوە بەڵام ڕۆشنایی ئەم روناکیە لە هەموویان زیاتر بەر شیراز کەوتبوو، لە کاتی حوکمڕانی کەریم خاندا شاری شیراز زۆر لە پەرەسەندندا بووە، خەڵکەکەی دەوڵەمەند بوون، شارەکە پڕبووە لە باغ و بێستان و کۆشك و تەلار، وەك بەهەشتی لێهاتووە، سەیرانگای هەموو ئێرانییەکان بووە)).

٥- لە ساڵی ١٧٧٦ دا لەشکری کەریم خان پەلاماری شاری (بەسرە)ی داوە لە باشووری عێراق ، کە ئەوکاتە لەژێر دەستی عوسمانییەکاندا بووە، دوای دەست بەسەرداگرتنی بۆ ماوەی (٣) سێ ساڵ لەژێر دەسەڵاتی زەندییەکاندا ماوەتەوە.

دوای مردنی کەریم خان ساڵی ١٧٧٩ باری وڵات تێکچووە و بەهۆی ئاژاوەی نێو بنەماڵەی کریم خان و شەڕی ناوخۆ و بێتوانایی کوڕانی کەریم خان، کە نزیکەی (١٥) ساڵ لەدوای مردنی کەریم خانەوە حوکمیان کرد، دەرفەت ڕەخساوە لەلایەن بنەماڵەی قاجارییەکانەوە . بۆ لەناوبردنی حکومەتی زەند لەساڵی ١٧٩٤ ز دا.

## * حکومەتی زەند لە دوای مردنی کەریم خانەوە تا ڕووخانی :

دوای مردنی کەریم خان ئاژاوە لەسەر کورسی دەسەڵات کەوتۆتە نێو بنەماڵەی کەریم خانەوە. شەڕو هەرای زۆر کەوتۆتە نێو کوڕ و برا و برازاکانیەوە و جارێکی تر حکومەتی زەند هێمنی و ئارامی بەخۆوە نەبینیوەتەوە.

کەریم خان چوار کوڕی جێهێشتبوو ، ئەمانە هیچیان کەڵکی فەرمانڕەواییان نەبووە. لەگەڵ یەکتری ناکۆك بوون و یەکتریان

لەناوبردووە، دوای کریم خان (فەتح عەلی خان) بووەتە حاکمی ئێران. (سادق خان) ی برای کە مردنی کەریم خانی بیست لە بەسرەوە گەڕاوەتەوە بۆ شیراز و ویستوویەتی شارەکە بگرێت، بەڵام بۆی نەچۆتە سەرو رایکردووە بۆ ناوچەی (کرمان).

لەوکاتانەدا بوو کە (ئاغا محەمەد خانی قاجار) لە بەندیخانەی شیراز ڕادەکات و خۆی دەگەیەنێتەوە (مازەندەران) و دواتریش حکومەتی زەندی لەناوبرد. پاش ئەوەی سادق خان برای کەریم خان بە مەرامی خۆی گەیشت و (فەتح عەلی خان) ی لە دەسەڵات دابەزاند و خۆی کرد بە شای ئێران، ئینجا (عەلی مرادخان) لە تاران خۆی بەشای ئێران راگەیاند و بە سوپایەکی زۆرەوە روویکردە ئەسفەهان. لەلای هەمەدان لەشکری (سادق خان) ی مامی تێکشکاند و چووە سەر شیراز و گەمارۆی شارەکەیدا.سەرەنجام (سادق خان) و سێ کوڕی لە ساڵی (١٧٨١ز) دا کوشت. بەمجۆرە (عەلی مراد خان) بوو بە شای ئێران و (ئەسفەهان) ی کردە پایتەخت. بەڵام هێمنی و ئارامی زۆر درێژەی نەکێشا، کاتێك (جەعفەر خان) ی کوڕی سادق خان یاخیبوو و چۆتە سەر ئەسفەهان ، دوای مردنی عەلی مرادخان لە (١٧٨٥ز) (جەعفەر خان) گەیشتە ئەسفەهان و خۆی بە شای ئێران راگەیاند.

حکومەتەکەی جەعفەر خان بەردەوام روو لە بێهێزی بوو ئاژاوەی ناوخۆ تەواو لاوازی کردبوو. تا کار گەیشتە ئەوەی پیاوماقوڵانی خۆی لە ساڵی ١٧٨٩ لە پیلانێکدا کوشتیان.

دوای (جەعفەر خان) ئاژاوەیەکی قورستر کەوتۆتە نێو حکومەتی زەندەوە، کاربەدەست و پیاوماقوڵان بۆ ئاگربڕ و گەڕاندنەوەی ئاسایش و هێمنی (لوتف عەلی خان) ی کوڕی (جەعفەر خان)یان کرد بە شای ئێران.

لوتف عەلی خان کە هاتۆتە سەر کورسی دەسەڵات لە تەمەنی (٢٠) ساڵیدا بووە ، لوتف عەلی خان دوای هاتنە سەرکار لەگەڵ (ئاغا محەمەد خانی قاجار) دا کەوتۆتە شەڕەوە سوپای قاجار پەلاماری شیرازی داوە بەڵام سەرکەوتوو نەبووە. بەهۆی ناکۆکی نێوان لوتف عەلی خان و یەکێك لە کاربەدەستە بەرزەکانی ، هەروەها ئەو شەڕ و ئاژاوە ناوخۆییەی کە کەوتبووە نێو بنەماڵەی زەندییەکانەوە، ئەمانە هەموو دەرفەتیان بۆ (ئاغا محەمەد خانی قاجار ) رەخساند، تا بکەوێتە هەوڵدان بۆ لەناوبردنی حکومەتی زەند. ئەوەبوو سەرەنجام بە دەستگیرکردنی (لوتف عەلی خان) دوا پادشای زەند و ئینجا کوشتنی ،حکومەتی زەند لە ساڵی ١٧٩٤ز کۆتایی بە تەمەنی هات.

بەمجۆرە کۆتایی بە دەسەڵاتی زەندییەکان هات و دەسەڵاتێکی نوێ لە ئێران لە سەردەستی (ئاغا محەمەد خانی قاجار) دامەزرێندرا، کە زۆر درندانە لەگەڵ کورد رەفتایان کردووە. ژمارەیەکی زۆری کوردیان لە مەڵبەندەکانی خۆیان راگواستووە، کوشتاریی زۆریی لێکردوون و بە زۆریش مەزهەبی شیعەی بەسەردا سەپاندوون.

# بەشی پێنجەم

## بزووتنەوەی چاکسازی عوسمانی و
## کاردانەوەی لەسەر وڵاتانی عەرەب و کوردستان

### ١ - بزووتنەوەی چاکسازی عوسمانی:

لــە ئــەنجامی تێکچــوونی دام و دەزگاکــانی عوسمــانی و دەرکــەوتنی ســەرەتای هەڵوەشــان و پەککــەوتنی دامــەزراوەکانی دەوڵــەت بەتایبــەتی هێزەکــانی ســوپا، هەڵگیرســانی شــۆڕش و ڕاپــەڕین لــە بەشــێکی زۆری هەرێمەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی و تێکشـاندنی سـوپاکەی لەبـەرەکانی جەنگـداو بـوونی کۆمەڵـە کەسـانێك کـە شارسـتانێتی ئـەوروپا کاریگـەری لەسەریان هەبوو، هەموو ئەمانە بەسەر یەکـەوە هۆکـاری گـرنگ بـوون کـە دەوڵەتی عوسمانیان بەوە ناچار کرد، بڕیاری چاکسازی هەمە لایەنە بدات.

لایـەنگرانی چاکسـازی عوسمـانی دوو گـروپ بـوون: گروپێکیـان پێـان باشبوو چاککردنی دەزگاکانی دەوڵەت لەڕێگەی پشت بەسـتن بەشـەریعەتی ئیسلامی و نەریتی ڕەسەنی دەوڵەتی عوسمانی بێت.

گروپــی دووەم پێیــان باشــبوو چاکســازی لەســەر شــێوازی دەوڵەتــە ئەوروپییــەکان و بەپشــت بەســتن بــە دەوڵــەتانی ئــەوروپی ئــەنجام بــدرێت، چــونکە ئەوروپییــەکان لــە بوارەکــانی ســەربازی و ئــابووری و سیاســی و ڕۆشنبیریدا توانیوویانە سەرکەوتن بەدەست بهێنن.دواجار بۆ چوونی گروپی دووەم سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

سەرەتا چاکسازی لەسوپادا کرا، چونکە دەوڵەت پێویستی بەسوپایەکی بەهێز هەبوو بۆ بەرگریکردن لەسنوورەکانی، دواتریش لایەنەکانی کارگێڕی و فێرکردنی گرتەوە.

سوڵتان سەلیمی سێیەم (١٧٨٩ ـ ١٨٠٧)ز کۆبوونەوەی بە بیرمەندان و سیاسەت کرد، تا دەربارەی کێشەی لاوازیەکانی دەوڵەت بیروڕایان بزانێت. لەئەنجامدا هەموو ڕایان وابوو، کە دەوڵەت پێویستی بە چاکسازی هەیە و لەساڵی(١٧٩٢ز) ئەمانە کۆمەڵە پەیڕەو و ئامۆژگارییەکیان بە ناوی (ڕژێمی نوێ)وە دەرکرد.

لەڕژێمی نوێدا چەندین هەنگاوی بۆ چاکسازی تێدابوو لەباری کارگێڕی و دارایی و لە هەموویشیان گرنگتر پێکهێنانی سوپایەکی نوێ بوو لە پیادەو هێزی دەریایی بە تازەترین جۆری مەشق و لەسەر شێوازی ئەوروپی، بۆیە خوێندنگای سەربازی و دەریایی کرانەوەو شارەزایانی فەرەنسی وانەیان تیا دەگووتنەوە. کاتێکیش سوڵتان سەلیمی سێیەم بڕیاری کردنەوەی باڵوێز خانەی عوسمانی دا لە وڵاتە ئەوروپیەکان، بەم کارەی دەرفەتی بۆ ژمارەیەك لە لاوە تورکەکان ڕەخساند بۆ تێکەڵبوون بە شارستانیەتی ئەورووپاو فێربوونی زمانەکانیان و ئاشنابوون بەبیر و باوەڕیان ، چاوەڕوانیش دەکرا ئەم لاوانە ڕۆڵی گرنگ لەبزووتنەوەی چاکسازی عوسمانیدا ببینن.

لەئەنجامی پیلانی ناحەزانی چاکسازی، بزووتنەوەی چاکسازی زۆر جار تووشی کۆسپی گەورە دەبوو.کاتێك سوڵتان مەحموودی دووەم (١٨٠٨ ـ ١٨٣٩) دەسەڵاتی گرتە دەست بۆی دەرکەوت، تا سوپایەکی تازەو بەهێز

دانەمەزرێت بۆ لەناوبردنی هێزەکانی ئینکیشاری کە دوژمنی سەر سەختی چاکسازی بوون ، بزووتنەوەی چاکسازی سەرناگرێت.

سولتان مەحموود وێڕای تەواوکردنی کارەکانی سولتانەکانی پێش خۆی، لەمەیدانی خوێندن و خوێندەواریدا چەند قوتابخانەیەکی کردەوە و ژمارەیەك خوێندکاری نارده ئەوروپا و ڕۆژنامەیەکیشی بەناوی (هەڵسەنگاندنی ڕووداوەکان – تقويم الوقائع)ەوە دەرکرد لەبواری کارگێڕیشدا وەزارەتەکانی (ئەوقاف و ناوەوە و دەرەوە) و، ئەنجوومەنی وەزیرانی لەسەر شێوازی ئەوروپا دامەزراند، لەکارە گرنگەکانی تری مەحموودی دووەم دامەزراندنی یەکەم پۆستە خانە بوو لەنێوان ئەسکدار و ئەزمیردا، یاسای سزادان و ئەنجوومەنی حوکمی دادگەری دامەزراند و جلوبەرگ و شێوازی ئەورووپی خستە نێو سوپای عوسمانیەوە.

دوای مەحموودی دووەم، سولتان عەبدولمەجیدی یەکەم هاتە سەرکارو قۆناغێکی نوێ لەبزوتنەوەی چاکسازی عوسمانی دەستی پێکرد، سولتان عەبدولمەجید بەیاننامەیەکی دەرکرد بەناوی(خەتی شەریفی گوڵخانە). ئامانجی ئەم بەیاننامەیە دابینکردنی مافی یەکسانی هەموو ئەندامێکی ناو دەوڵەتی عوسمانی بوو بەبێ لەبەرچاو گرتنی جیاوازی بیروباوەڕی ئایینی و نەتەوەیی. لەڕووی باجیشەوە بەیاننامەکە دەڵێت: دەبێت باج بەشێوەیەکی دادپەروەرانە بەسەر هەموو چینەکانی کۆمەڵدا دابەش بکرێت و ڕێگەی



کۆکردنەوەیشـیان چـاك بکرێـت و بەیانەکـە مـاوەی سەربازیشـی دیـاری کردبوو.

هـەر لـە سـەردەمی ئـەم سـوڵتانەدا بەیاننامەیـەکی تـر بـەناوی (خـەتی هەمایون)دەرکرا ناوەڕۆکی ئەم بەیانەش بریتی بوو لە:دابینکردنی یەکسانی لەنێو خەڵکدا، جێبەجێکردنی یاسا لەسەر هەموو ئەوانەی جیاوازی دەکەن بەهۆی جیاوازی ئایین، زمان، ڕەگەز، هەنگاونان بۆ ڕێکخستنەوەی پـۆلیس و دادگاگان و دارایی و دامەزراندنی بانك،ودانی نا بە پێویسـتی دەوڵـەت بـۆ ئەنجامدانی چاکسازی گشتی. بـەڵام ئەمانـە تـەنها مەرەکـەبی سـەر کاغـەز بوون وهیچی جێ بەجێنەکرا.

دوای عەبدولمەجیـدی یەکـەم، سـوڵتان عەبدولعـەزیزی بـرای جێگـەی گرتەوە. گرنگترین یاسا کـە لـەم سـەردەمەدا دەرکـرا بـریتی بـوو لەیاسـای ویلایاتـی نوێی عوسمـانی سـاڵی(١٨٦٤ز) و بـەپێ ی ئـەم یاسـایە دەوڵـەت بەسەر(٣٠) سی ویلایەتدا دابەشکرا، هەر ویلایەتێك کرا بەچەند لیوایەکـەوە کەهەریەکەیان موتەسەڕیف سەرۆکی بوو، هـەر لیوایـەکیش دەکـرا بەچـەند قەزایەکەوە کە قائیمقام سەرۆکی بوو، هەر قەزایەك بە چەند ناحیەیەکـەوە کەمـدیر ناحیـە سـەرۆکی بـوو.هـەروەها لـەم یاسـایەدا ڕێگـەدراوە چـەند ئەنجومەنێکی خۆجێیی دروست بکرێ، واتە بەپێی ئەمە لە هەر ویلایەتێکدا ئەنجومەنێك و لە هەر لیوایەکدا ئەنجومەنێك هەبێت، هەروەها لەهـەر قـەزاو ناحیەیەکیشـدا.بـەپێی ئـەو یاسـایە خـەڵکی لـە بـەڕێوەبردنی کاروبـاری ویلایەتەکانی خۆیاندا بەشداریان دەکرد بەهاوبەشـی لەگـەڵ دەسـەڵاتدارانی فـەرمانڕەواو دەسـتە کارگێڕییـە جیاوازەکـان، مەبەسـتیش لـەم یاسـایە

ئەوەبوو کە هەموو ویلایەتەکان زۆر بەڕێکی بە حکومەتی مەرکەزیی لە ئەستەمبوڵەوە ببەسترێنەوە.

سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمیش زۆر کاری گرنگی بەخۆوە بینی لەوانە:دانانی دەستوورێك بوو بۆ دەوڵەت کە ئامانجی بەدیهێنانی یەکسانی سیاسی و مەدەنی بوو بۆ هەموو هاوڵاتییەکی عوسمانی. لەپاشدا دەستوور دیاریکردنی ئەرکی وەزیرەکان و کاربەدەستان دەردەخات ، بە دیهێنانی سەربەخۆیی دادگاو چەسپاندنی بودجەی دەوڵەت و جێ بەجێکردنی سیستەمی لامەرکەزی بوو لە ویلایەتە کان.

لەمادەیەکی دەستوورەکەدا باس لە دامەزراندنی پەرلەمان دەکات کە لە دوو ئەنجوومەن پێکهاتبێ، یەکێکیان ئەنجوومەنی نوێنەران (مەبعوسان)و ئەوی تریشیان ئەنجوومەنی پیران(ئەعیان)بوو.

لە ساڵی (١٨٧٧ز) پەرلەمان کۆبوونەوەکانی خۆی دەست پێکرد، بەڵام ڕووسیا بانگی شەڕی دا دژی دەوڵەتی عوسمانی ئەمەش هەلێکی گونجاوی دایە دەست سوڵتان عبدالحمید بۆ ئەوەی نیازی خۆی بهێنێتەدی و دانیشتنی پەرلەمان بۆماوەیەکی دیاری نەکراو دوابخات، دواتریش ساڵی ١٨٧٨ز بەیاننامەی هەڵوەشاندنی پەرلەمان و لابردنی دەستووری دەرکردبۆ ماوەیەك بەبیانووی ئەوەی کەدەوڵەت بەبارێکی نائاساییدا تێدەپەڕێت، بەمەشەوە نەوەستا بەڵکو دەستی کرد بە ئازاردانی چاکسازی خوازان و لایەنگرانیان، هەندێکی لە وڵات دوورخستنەوە وەك (مەدحەت پاشا) کەناردی بۆ ئەوروپا و دواتریش بەتۆمەتی بەشداریکردن لە کوشتنی سوڵتان عەبدولعەزیز دەستگیری کرد.

## ٢ - كاردانەوەی چاكسازی عوسمانی لەسەر ولاَتانی عەرەبی:-

لەسەردەمی محەممەد عەلی دا میسر پێشکەوتنێکی زۆری بەخۆیەوە بینی، ئەو کارانەی محەممەد عەلی لەم ولاَتە ئەنجامیدا بەپێی سیاسەت و ویستی خۆی بوو نەك لەسەر داوای دەوڵەتی عوسمانی. بۆیە بزووتنەوەی چاكسازی لەمیسر لەژێر کاریگەری بزووتنەوەی چاكسازی دەوڵەتی عوسمانی دا ڕوویندا. هەرچی نیمچە دوورگەی عەرەبییە لەبەر ئەوەی بە بارێکی تایبەتیدا دەرۆیشت بەهۆی بەربەرەکانێ و ناکۆکی نێوخۆی نێوان میر و شیخەکانی ناوچەکە، عوسمانییەکان نەیانتوانی هیچ چاكسازییەکی تێدا بکەن.

بەلاَم هەندێ لە ولاَتانی عەرەبی چاكسازیەکانی عوسمانی کاردانەوەی هەبوو لەسەریان لەوانە:

### ا - عێراق:-



مەدحەت پاشا

بزووتنەوەی چاكسازی عوسمانی شوێنی لە عێراقدا بەڕوونی دەرنەکەوت لەسەردەمی مەدحەت پاشادا نەبێت کە لە نێوان ساڵانی (١٨٦٩ ــ ١٨٧٢) والی عێراق بوو. کردەوەکانی مەدحەت پاشا لە عێراقدا بەچاکردنی باری کارگێڕی دەستی پێکرد. لەمەشدا یاسای ویلایاتی عوسمانی پاڵپشتی بوو جگە لەوەی دەسەلاَتێکی فراوانی پێدرابوو بۆ بەدیهێنانی چاكسازی لە عێراق .

ڕێو شوێنەکانی لە هێنانەنانەوەی چاکسازی کارگێڕی و ئابورییەوە دەست پێکرد بە تایبەتی لە چارەسەر کردنی کێشەی زەوی وزار بوو.

ڕژێمی تاپۆ بەیەکێك لە کارە دیارەکانی مەدحەت پاشا لەقەڵەم دەدرێت لە ڕووی کارگێڕی و ئابوورییەوە، چونکە بەم کارە دەتوانرا سنورێك بۆ یاخیبوونە خێڵەکیەکان دابنرێت ئەویش لەڕێگای مسۆگەرکردنی ژیان و گوزەران بۆیان، هەروەها گۆڕینی شێوازی ژیانیان لەژیانی کۆچەریەوە بۆ ژیانی جێگیر، بەلاَم ئەم سیاسەتەی مەدحەت پاشا شێخەکانی خێڵەکانی کرد بە موڵکداری زەوی ئەمەش پەیوەندی کۆنی خێڵایەتی گۆڕی بۆ پەیوەندی لەسەر بنچینەی بری ئەو موڵکەی کە ئەندامەکە هەیەتی،، هەروەها ئەمە وای لە دەوڵەت کرد بۆ کۆکردنەوەی باج، پشت بەسەرۆك



ترامواى بەغداد

خێڵەکان ببەستێت بەمەش حکومەت ئامانجی رامیاری خۆی هێنایە دی،کە لەلایەکەوە ئاسانتر لەجاران باجی کۆدەکردەوە، لەلایەکی تر بەئاسانی دەیتوانی ئەندامانی خێڵەکان بکات بەسەرباز.

لەڕووی هاتوچۆوە مەدحەت پاشا کەشتیە کۆنەکانی چاککردەوەو هەندێك کەشتی نوێی کڕی، چەندین وێستگەی سووتەمەنی دامەزراند، سەبارەت بە ڕێگاوبانی ناوخۆیش هێڵی ترامواى نێوان بەغداو کازمیەی دامەزراند.

لەبواری خوێندندا چەند خوێندنگایەکی نوێی کردەوە، وەك روشدیەی سەربازی و ئامادەیی سەربازی و خوێندنگایەکی پیشەیشی کردەوە، وێڕای کردنەوەی روشدیەی مەلەکی کە دەرچوانی لە دەزگاکانی میری دادەمەزرێندران . لەئەنجامی ئەمەدا ژمارەی فێرخوازان لەعێراقدا زۆر زیادیکرد.

لەبواری چاپەمەنیشدا چاپخانەیەکی میری دامەزراند و ڕۆژنامەیەکیشی بەناوی ڕۆژنامەی(زەورا)دەرکرد، کە بە یەکەم ڕۆژنامەی عێراقی دادەنرێت، هەفتەی دووجار بە زمانی تورکی و عەرەبی دەردەچوو تاداگیرکردنی بەغدا لەلایەن ئینگلیزەوە هەردەردەچوو. هەر لەسەردەمی مەدحەت پاشادا هەردوو شاری ناسریەو ڕومادی دروست کران.

لەکارەکانی تری مەدحەت پاشا لەعێراق دروستکردنی خانوو بوو بۆ فەرمانگەکانی میری. کێڵگەیەکی نموونەیی دامەزراند و ئەندازیارانی ناردووە بۆ رێکخستنی ئاودێری ، هەروەها چەندین نەخۆشخانەی دامەزراند و، سیستەمی سەربازگیری جێبەجێکرد.

## ب – سوريا :–

کاتێك لەساڵی(١٨٦٤ن)دا یاسای ویلایەتەکان دەرچوو، بەیروت خرایە سەر ویلایەتی دیمەشق و ناونرا(ویلایەتی سوریا). بەڵام دواتر بەیروت بوو بە ویلایەتێکی سەربەخۆ. هەر ویلایەتێك ئەنجوومەنێکی کارگێڕی خۆی هەبوو، کە لەچەند فەرمانبەرێکی گەورەو ژمارەیەك پیاو ماقوڵ پێکدەهات، کەنوێنەرانی خەڵکی جیاوازی ویلایەت بوون ، قازی وەك خۆی مایەوە،بەڵام دادگا شەرعیەکان سنور بۆ دەسەڵاتیان داندرا و تەنها ئەو کێشانەیان بۆ هێشتنەوە، کە پەیوەندی بەکاروباری ئەوقاف و میرات و ژنهێنان و تەڵاق و نەفەقەوە هەبوو.چەند دادگایەکی نوێش دامەزرێندران بۆ سەیرکردنی ئەو کێشانەی کە لە دەسەڵاتی دادگای شەرعیدا نەبوو. هەروەها دوو دادگای بازرگانی یەکیان لە حەڵەب و ئەویتر لە بەیروت دامەزرێندرا، وێڕای دامەزراندنی چەند دادگایەکی سەرەتایی لەویلایەتەکاندا.

هەروەها مافی تایبەتی بەچەند کۆمپانیایەکی بیانی درا بۆ کردنەوەی ڕێگاو دامەزراندنی پرد. یەکەم ڕێگای ئاسن لەنێوان یافاو قودس دا کرایەوە،دواتر هێڵی ئاسنی نێوان دیمەشق و مەدینە کرایەوە،هێڵەکانی پۆستە گەیشتە حەڵەب و دیمەشق و لەزۆربەی شارەکانی سوریاشدا شارەوانی دامەزرێندرا.

کاتێك مەدحەت پاشا کرا بە والی سوریا (١٨٧٨ ـــ ١٨٨٠ن) بایەخێکی گەورەی بەپرۆسەی خوێندن و فێرکردن دا. چەندین خوێندنگای دامەزراند، خوێندنگای گوندەکانی چاککردەوە و بەمەش ژمارەی خوێندنگاکان لە سوریا زیادیانکرد، و (کۆمەڵەی مەبەستەچاکەکان)ی لە کۆمەڵێك زانا پێك

هێنا کەدەستیان کرد بە کۆکردنەوەی یارمەتی لە خەڵك و بە هەموو شوێنێکی سوریا بڵاوببۆوە، هەروەها ئەم کۆمەڵەیە یەکەم چاپخانەی میری لە شام دامەزراند کە ڕۆژنامەی (لوبنان)ی دەردەکرد. لەدیمەشقیش چاپخانەیەکی دامەزراند کە ڕۆژنامەی (سوریا)ی بە هەردوو زمانی عەرەبی و تورکی دەردەکرد.

### ٣- کاردانەوەی بزووتنەوەی چاکسازی عوسمانی لەسەر کوردستان:-

هەرچەندە چاکسازی عوسمانی لەسەردەمی سوڵتان مستەفای سێیەمدا(١٧٥٧ ــ ١٧٧٤) دەستی پێکرا و سوڵتانەکان دوای ئەویش لەبوارەکانی سەربازی و رامیاری و کارگێڕی و کۆمەڵایەتی و ئابووریدا هەندێك چاکسازیان کردووە،بەڵام ڕەنگدانەوەی ئەم چاکسازیانە لەباشوور و خۆرئاوای کوردستاندا لەسەردەمی دەست بەکاربوونی والی مەدحەت پاشا لە عێراق و سوریا زیاتر هەستی پێدەکرێت چونکە:-

أ- زۆربەی چاکسازیەکانی بەر لە مەدحەت پاشا بواری سەربازی گرتبووەوە وەك نەهێشتنی سوپای ئینکیشاری و دامەزراندنی سوپای نوێ لەسەر شێوازی ئەورووپایی.

ب- دامەزراندن و چاککردنەوەی ڕێگاکانی هاتووچۆ و هۆیەکانی گواستنەوە بەشی هەرە زۆری بە مەبەستی سەربازی بوو.

جـ- چاکسازیەکان لەئەنجامی گوشاری وڵاتانی ئەورووپا یان لەئەنجامی شکستی سوپایی بووە لە بەرەکانی جەنگدا.

د- زۆربــــەی ناوچــــەکانی کوردســــتان لـــەژێر دەســـەڵاتی میرایـــەتی کوردییەکاندا بووە کە تا کۆتایی چلەکانی سـەدەی نـۆزدە ژیـاون و تاڕادەیەك نیمچە سەربەخۆ بوون، بۆیە هـەر چاکسـازییەکی کرابێـت دوور بووە لەدەسەڵاتی ڕاستەوخۆی دەوڵەتی عوسمانی. ئەوەش کە مەدحەت پاشا ئەنجامیدا بـە تایبـەتی لـەبواری خوێنـدن دا، ڕێگـای خۆشکرد بۆ لاوانی کورد تا لە قوتابخانـە سـەربازییەکانی عوسمـانی درێژە بەخوێندن بدەن، ژمارەیەکی بەرچاوی ڕۆشنبیران ئەفسەرانی کوردیش لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە و نیوەی یەکەمی سەدەی بیستدا دەرچووی قوتابخانە سەربازییەکانی عوسمانین. جگە لەوەی کە قوتابخانەکانی عوسمانی لە هەندێك لەشارەکانی کوردسـتان وەك (کەرکووك ـ سلێمانی ـ هەولێر ـ کفری) کرابوونەوە.

# بەشی شەشەم

## کورتە مێژوویەکی ڕۆژنامەگەری کوردی و پارت و کۆمەڵەو ڕێکخراوە کوردییەکان

### ١- سەرهەڵدانی ڕۆژنامەگەری کوردی:

مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی، مێژوویەکی پڕ لە خەبات و شکۆو تێکۆشانە، چونکە هەرزوو ڕووناکبیرانی کورد بیریان لە دەرکردنی ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی کردەوە، ئەوەیان خستۆتە بەرچاو کە ئەو ڕۆژنامەیە یان ئەو گۆڤارە بەئاسانی بەچاو و دڵی داگیرکەراندا ناچێتە خوارەوە، بەڵکو دەبێتە هۆی نیگەرانی و ناسەقامگیری و بێزاربوونیان تا وەکو ڕێ لە دەرچوونی گۆڤارو ڕۆژنامەکان بگرن و سەرنووسەرو یان خاوەن ئیمتیازەکەشی سەرنگوم بکەن .

ڕووناکبیرە نیشتمان پەروەرەکانی کورد لە ڕۆژگارێکی دوورەوە ئەم ئەرکە نیشتمانییەیان خستە سەر شانی خۆیان .لەڕێگەی پیت و وشەوە دەنگی زوڵاڵی ڕۆژنامەیان بە گوێی خوێنەری کوردا داو چاو و دڵ و هەنگاوەکانیان بۆ ڕووناك کردەوەو، زمانەکەیان پاراو کردو بەسەدان و هەزاران وشەی ڕەسەن دەوڵەمەندیان کردو، خستیانە ئاستی گەلانی پێشکەوتووی ئەم جیهانەوە.

مێژووی ڕۆژنامەگەرێتی کوردی لاپەڕەیەکی زێڕینە لەمێژووی خەباتی سیاسی و کولتووری و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی نەتەوەی کورد، چونکە بەشی هەرەزۆری ڕۆژنامەنووسان و نووسەرانی کورد لەهەموو ئاست و

ڕۆژگارێکدا هەر لە ریزی پێشەوەی خەباتگێڕانی نەتەوەدا بوون و، بەشێکی رووناکبیری دانەبڕاوی دیاربوون لە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەکەماندا.

یەکەمین ژمارە، لەیەکەمین ڕۆژنامەی کوردی بەناوی(کوردستان)لە (٢٢)ی نیسانی (١٨٩٨ز) لە شاری قاهیرە لەلایەن (میقداد مەدحەت بەگ)و لە دواتریش لە لایەن(عبدالرحمن بەگ)ی برایەوە کە لە نەوەی بەدرخان پاشای میری بۆتان بوون، دەرچوو. نەوەکانی بەدرخان پاشا، بۆ ئەوەی برەو بە خەباتی سیاسی و ڕۆشنبیری کولتووری کورد بدەن، پاشان لەناوچوونی میرنشینی بۆتان و دەربەدەربوونیان، هەستیان کرد، کە ڕۆژنامە باشترین و کاریگەرترین چەکە بۆ هۆشیاری نەتەوەیی و ڕێگە پیشاندانی نەوەکانی، بەڵام کاربەدەستانی عوسمانی هەمیشە بەدوایانەوە بوون، بۆ دەمکوت کردن و لەناوبردنیان، بۆیە هەر کاتەی لە شوێنێك ڕۆژنامەکە دادەخرا، ئەوا لەشوێنێکی تر سەری هەڵدەدایەوە.

ئەوەتا لە ژمارەی (١ –٥ ) لە قاهیرە و، ژمارەی (٦ –١٩) لە جنیف و ژمارە (٢٠ – ٢٣) جارێکی تر لە قاهیرە و، ژمارە (٢٤) لە لەندەن و، ژمارەکانی (٢٥ – ٢٩) لە (فۆلکستۆن ) لە ئەڵمانیا و، هەردوو ژمارە(٣٠ – ٣١) جارێکی تر لەجنێڤ لە سویسرا دەرچوون. ئەم دەربەدەری و ڕاوناون و بەردەوامیە، خۆی خۆی دا باشترین بەڵگەی باری سەختی ڕۆژنامەگەری کوردییە.

جێگەی شانازیشە بۆ مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی، کە لە سەرەوە لە لای ڕاستی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی نوسیویێتی (هەر جارەی دوو هەزار ڕۆژنامەی بە خۆڕایی ڕەوانەی کوردستان ئەکا تابیدەن بەخەڵك) و، لە وتارێکی تردا لە ژمارە ٣١دا ئەڵێ: (ئێوە ئەزانن من کوڕی ئەو پیاوەم کە

بەشیر بۆ سەعادەتی ئێوە غیرەتی زۆری نواند، منیش ئەمڕۆ بە موقتەزای زەمان بە قەڵەم ئەو خزمەتانە ئیفا ئەکەم).

مەدحەدت بەگ لەسەر وتاری یەکەمین ژمارەی کوردستان دا نوسیویێتی:
(بەداخەوە کورد لەزۆر نەتەوە زیاتر خاوەنی بیر و هۆشن، جوامێرن، لە ئایینی خۆیان دا ڕەواو بەهێزن، بەڵام وەکو نەتەوەکانی تر خوێندەوار و دەوڵەمەند نین، نازانن دراوسێکانیان چۆنن و چی دەکەن و ئاگایان لێ نییە. بۆیە پشت بەخوا ئەم رۆژنامەیەمان نووسی و بەپشتیوانی خوای گەورە لەمەودوا هەر پانزە رۆژ جارێك بڵاوی دەکەمەوە) (ناوی ڕۆژنامەکەشمان ناوە کورستان و لەم ڕۆژنامەیەدا سوودەکانی زانست و زانیاری باس دەکەم، لە چ جێگایەك مرۆڤ فێر دەبێت، لە چ جێگەیەك شەڕ بێت هەڵوێستی وڵاتانی گەورە چی دەبێ و چۆن شەڕ دەکەن، چۆن بازرگانی دەکرێت هەمووی باس دەکەم).

ناوەرۆکی باس و بابەت و وتارەکانی کوردستان بەڵگەی ئەوەن، هەم مەدحەت بەگ و هەم عبدالرحمن بەگ دوو کەسی بیر ئازاد و دوو رۆشنبیری گەورەو هۆشیاری ئاگاداری سەردەمی خۆیان بوون.

هەروەها میقداد مەدحەت بەگ(لەریگەی ژمارە - پێنچی - کوردستان)ەوە پێشنیازی بۆ زانا و میر و ئاغایانی کورد کردووە،کە بە بروسکە داوا لە سوڵتان عبدالحمیدی دووەم بکەن، ڕێگە بدات کە ڕۆژنامەی کوردستان بە ئاشکرا بنێردرێتە خاکی نیشتمان، ئەمەش بێتۆمان دەچێتە خەباتی ڕووناکبیرانی کوردی ئەو ڕۆژگارەو، شێوەو ڕێبازی ئەو خەباتە نیشان دەدات.

ڕۆژنامەی کوردستان گەلێك لایەنی شاراوەی ئەدەب و مێژووی گەلەکەمانی ڕوون کردۆتەوە و پەردەی لەسەر هەماڵیوە.

دوای کودەتاکەی کۆمەڵەی (الاتحاد و الترقي)ی عوسمانی ساڵی(١٩٠٨ز) گەلێ ڕۆژنامەو گۆڤاری تر دەرچوون، کە زیاتریان زمانحاڵی ئەو کۆمەڵ و ڕێکخراوە کوردییانە بوون کە لەو ماوەیە دامەزرا بوون، ئەمە جگە لەوەی کورد هەرکاتێك دەسەڵاتێکی کەوتبێتە دەست لایەنی ڕۆژنامەو بڵاوکراوەی فەرامۆش نەکردووە هەروەك لەسەردەمی سمکۆی شکاك و شێخ مەحموودی حەفید و پێشەوا قازی محمد دا ڕووی دا.

## ٢ - کۆمەڵە و ڕێکخراو و پارتە کوردییەکان:

بەمەبەستی کۆمەك کردن و خۆبەهێز کردن و وشیارکردنەوەی خەڵکی کوردستان، دەمێکە ڕۆشنبیر و پیاوانی سیاسی کورد بیریان لە دروستکردن و پێکەوەنانی کۆمەڵی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی و ڕۆشنبیری کردۆتەوە، ئەوەندە بوار هەبووبێ بەنهێنی یان بەئاشکرا کاریان بۆ کردووە، لەم پێناوەشدا گەلێك ئەرکی گەورەیان خستۆتە سەر شانیان.

هەرچەندە سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن ، کەلە کۆبوونەوەکەی گوندی نەهری ناوچەی شەمزینان ساڵی(١٨٨٠ز) بناغەی یەکەم کۆمەڵەی عەشیرەتەکانی کورد (یەکێتی کوردان) بەڕێبەرایەتی شێخ عوبەیدوڵای نەهری دانرا کە ئامانجی کۆکردنەوەی کورد بووە لەسەر بنچینەی پەیوەندی نەتەوەیی بەبێ گوێدانە جیاوازی خێزان ، بنەماڵە ، خێڵ ، مەزهەب ، ئایین ، شێوەی زمان و ناوچە. بەمانایەکی تر ئامانجی هۆشیارکردنەوەی خەڵکی کورد بوو بە گیانی نیشتمانی و نەتەوەیی.

دواتریش کوردانی ئەستەمبولّ ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ ڕۆڵیان لە دامەزراندنی چەند کۆمەڵ و ڕێکخراوێکی تری نهێنی دا هەبوو جا چ بەتەنیا وەك کۆمەڵەی (عەزمی قەوی کورد) یاخود

بە هاوبەشی لەگەڵ تورکەکان بۆ کۆتایی پێهێنانی حوکمی سوڵتان عەبدوالحمیدی دووەم، بەڵام گرنگترین ئەو کۆمەڵ و ڕێکخراو و پارتە کوردییە سیاسییانەی کە خاوەنی بەرنامەیەکی ڕوون و ئاشکرا بوون و بۆ بەدیهێنانی خەونەکانی کورد تێکۆشاون، بەم شێوە باسیان لێوە دەکەین :

## یەکەم: پارت و کۆمەڵە و ڕێکخراوە کوردییەکانی باکووری کوردستان:

ئەوانە بوون کە لەدوای کودەتاکەی کۆمەڵەی(الاتحاد و الترقی)ی بەسەرسوڵتان عەبدول حەمیدی دووەمی عوسمانی ساڵی ١٩٠٨دەرکەوتن کە گرنگترینیان ئەمانە بوون:

### ١- کۆمەڵەی تەعالی و تەرەقی کورد:-

یەکێکە لەکۆنترین کۆمەڵە ڕامیارییەکانی کورد کە لە(٢٥)ی ئەیلولی ١٩٠٨لە ئەستەمبولّ، لەلایەن شێخ عبدالقادری نەهری(شەمزینی) و، ئەمین عالی بەدرخان و، ژەنراڵ شەریف پاشای خەندان و، خەلیل خەیاڵی و، داماد ذوالکفل پاشاو...هتد دامەزرێنرا. . چەنددەها ئەفسەرو ڕۆشنبیرانی کوردو قوتابیانی زانکۆکان لە ئەستەمبولّ پەیوەندییان پێوەی کرد،لقی لە زۆربەی شارە گەورەکانی کوردستان هەبوو وەك دیاربەکرو بەدلیس و موش و ئەرزرۆم و وان و موسلّ.

ئەم کۆمەڵەیە ڕۆژنامەیەکیان بەناوی (تەعاون و تەرەقی کورد) بڵاوکردەوە، کەزمانحالیّ کۆمەڵەکە بوو. ئامانجی کۆمەڵەش بریتی بوو لە:

کردنەوەی قوتابخانە زمانی کوردی لە کوردستان و، دامەزراندنی کورد لەدام و دەزگا حکومییەکان و، داننان بە زمانی کوردی و، ڕێگەدان بە دەرکردنی بڵاوکراوەو ڕۆژنامە و گۆڤار بە زمانی کوردی، بایەخدان بە باری ئابووری کوردستان.

ئەم کۆمەڵەیە لە ڕاستیدا ڕۆڵێکی سەرەکی هەبوو لەوریابوونەوەی هەستی نەتەوەیی کوردان دا.

## ٢- کۆمەڵەی بڵاوکردنەوەی مەعاریفی کورد:-

کۆمەڵەیەکی ڕۆشنبیری بوو، ساڵی ١٩٠٨ لەئەستەمبوڵ دامەزراو، توانی قوتابخانەیەك بۆ منداڵانی کورد بکاتەوە، بەڕێوبەری قوتابخانەکەش (عبدالرحمن بەدرخان)بوو، ئەم کۆمەڵەیە لەلایەن دەوڵەمەندو دەست ڕۆیشتووەکانی کورد پشتیوانی دەکرا، و ئەندامەکانی ئەم کۆمەڵەیەش زۆربەیان لە ڕۆشنبیران و قوتابییانی کوردی قوتابخانەو زانکۆو پەیمانگەکانی ئەستەمبوڵ بوون.

شایانی باسە (خەلیل خەیاڵی) بە چالاکترین ئەندامی ئەم کۆمەڵەیە دادەنرا، کەزۆر بایەخی بەفێربوونی منداڵانی کورد دەدا، نەخوێندەواری بەگەورەترین کۆسپ لەڕێگای پێشکەوتنی کۆمەڵگەی کوردەواری دادەنا.

لەناوەڕاستی ساڵی ١٩٠٩ چالاکییەکانی ئەم کۆمەڵەیە بەهۆی بڕیار و سیاسەتی تورکە ئیتحادییەکان (واتە الاتحاد و الترقی) ڕاوەستا،دوای جەنگی جیهانی یەکەمیش دووبارە هاتەوە مەیدان و دەستی بەکارو چالاکی و خەباتکردن کردەوە.

## ٣- کۆمەڵەی هێڤی:-

ئەم کۆمەڵەیە لە(٩)ی کانونی دووەمی (١٩١٠ز) لە ئەستەمبوڵ لەلایەن قوتابییە کوردەکانی ئامۆژگای کشتوکاڵی دامەزرا.


ئەکرەم جەمیل پاشا بەبەرگی نەتەوەکی کوردەوارییەوە


لە کادیرە پێشکەوتووەکانی خۆیبوون: قەدری جەمیل پاشا

لەدواییدا وردە وردە فراوان بوو، تاکو هەموو چینە جیاوازەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری گرتەوە، لەئەندامە دیارەکانیشی (عومەر بەگ جەمیل پاشا، قەدری جەمیل پاشا، ئەکرەم بەگ جەمیل پاشا، فوئاد تەمۆبەگ، و مەمدوح سەلیم) بوون، پاشانیش بەهۆی چالاکییە نەپساوەکانی (خەلیل خەیاڵی)، کە ئەو کاتە (ژمێریاری ئامۆژگای کشتوکاڵی بوو لە ئەستەمبوڵ) کۆمەڵەکە بوو بە رێکخراوێکی سیاسی، پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵەی (مونتەدای وێژەیی=المنتدى الادبی) لە دیمەشق پتەوبوو.

ئەم کۆمەڵەیە گۆڤارێکی بە ناوی (رۆژی کورد) لە١٩حوزەیرانی (١٩١٣ز) بە هەردوو زمانی کوردی و تورکی دەردەکرد. پاشان گۆڤارێکی تریان بەناوی (هەتاوی کورد) لە(١٤)ی تشرینی یەکەمی ١٩١٣ دا دەرکرد.

### ٤- کۆمەڵەی تەعالی کوردستان:

ئەم کۆمەڵەیە لە (١٩) تشرینی دووەمی١٩١٧ لەئەستەمبوڵ دامەزراو، لەپێش کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی یەکەم و لەکاتی ئاگربەست و لە دوای جەنگیش، چالاکییەکانی دەست پێ کرد لەبواری سیاسی دا کە بریتی بوون لەداواکردنی سەربەخۆیی و ڕزگاریی کوردستان و شادبوونی گەلی کورد بەمافەکانی خۆی، ئەویش لە چوارچێوەی (١٤) خاڵەکانی سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (ودرۆ ولسن)، کە داوای ماف چارەنووسی بۆ هەموو گەلانی ژێر دەستی دەوڵەتی عوسمانی کردبوو.

ئەم کۆمەڵەیە گۆڤارێکی بەناوی (ژین) دەرکرد، کە زمانحاڵی کۆمەڵەکە بوو.

### ٥- کۆمەڵەی سەربەخۆیی کورد:


سێر برسی کۆکس

ئەم کۆمەڵەیەش ساڵی ١٩١٨ لە ئەستەمبوڵ لەلایەن شێخ عەبدولقادری نەهری(شەمزینی)و کوڕانی بەدرخان پاشاوە دامەزرا،زۆربەی سەرۆك و میرەکانی کورد ئەندام بوون تیایدا، لەپێناوی سەربەخۆیی و یەکبوون و یەکخستنی کوردستان، خەباتی دەکرد. لق و یانەی نەك هەر تەنها لەشارەکانی کوردستان بەڵکو لەدەرەوەی کوردستانیش دامەزراندو ئەو لیژنەیەی کە(ئەحمەد سورەییا بەدرخان)

لەقاهیرە سەرپەرشتی دەکرد،چەندەها یاداشت و بروسکەی بۆ هاوپەیمانەکانی نارد لەبارەی مافەکانی کورد و سەربەخۆیی کوردستان. بەهەمان شێوە (شێخ عەبدولقادری نەهری)یش نامەو یاداشت و بروسکەی ئاراستەی هاوپەیمانان کرد،کە هەمان داخوازیەکانی (ئەحمەد سورەییا بەدرخان) بوون.

هەروەها یەکێك لەچالاکیەکانی تری ئەم کۆمەڵەیە ئەوە بوو، کە چوار کەس لە ئەندامانی کۆمەڵەکە بەسەرۆکایەتی (خەلیل بەدرخان) ساڵی ١٩٢١چوون بۆ بەغداد، بۆ لای (سێر برسی کۆکس) مەندوبی سامی بەریتانی لە عێراق، داوای یارمەتی و پشتگیری (بەریتانیا)یان بۆ دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ کرد.

ئەمە جگە لە یەکخستنی هەوڵەکانی (ئەمین عالی بەدرخان) لەگەڵ یۆنانییەکان دژی کەمالیەکان، کەتادەهات بەهێزتر دەبوون.

٦- ئەمانەو چەندین کۆمەڵەو ڕێکخراوی تری وەك (ڕێکخراوی نەتەوەی کورد)، کەلەکاتی داگیرکردنی ئەستەنبوڵ لە لایەن هاوپەیمانەکانەوە دامەزرا، هەروەها (کۆمەڵەی تەشکیلاتی کۆمەلایەتی کورد)و (کۆمەڵەی ئیستخلاصی کورد لە دەوڵەتی عوسمانی)، پاشان (کۆمەڵەی تەعالی ژنانی کورد) کە لە (٥)ی کانونی دووەمی ١٩١٩ لە ئەستەمبوڵ لە لایەن (ئەمینە خانم) خێزانی ژەنراڵ شەریف پاشای خەندانەوە دامەزرا، کە لە گرنگترین ئامانجەکانی بریتی بوو لە فێرکردن و کردنەوەی قوتابخانە بۆ ژنان و دۆزینەوەی کار بۆ ژنان و ئیشکردن شان بەشانی پیاوان لە بوارە جیا جیاکان و دامو دەزگا جۆر بە جۆرەکانی دەوڵەت دا.

## دووەم: پارت و کۆمەڵەو ڕێکخراوە کوردییەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان:

لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش دا چەند کۆمەڵەو ڕێکخراوێك دامەزران کە گرنگترینیان ئەمانە بوون:


عبدالرزاق بدرخان

١ – کۆمەڵەی (جیهاندانی) کە لەساڵی ١٩١٢ لەلایەن سمکۆخانی شکاك و عبدالرزاق بەدرخان لە شاری (خوی) دامەزراو لە(٢٧) تشرینی یەکەمی ١٩١٣یەکەمین قوتابخانە لە شاری (خوی) بە زمانی کوردی لە لایەن ئەم کۆمەڵەیە کرایەوە.

٢ – هەر لەساڵی ١٩١٣ لەشاری ئورمیە (کۆمەڵەی ئیستخلاصی کوردستان) لەلایەن سمکۆ خانی شکاك و سەید تەهای نەهری دامەزراو، داوای لەڕووسیای قەیسەری کرد بۆ وتووێژ دەربارەی هاوکاری کورد و ڕوس دژی دەوڵەتی عوسمانی، بەو مەرجەی ڕوسیا پشتیوانی لەئامانجی نەتەوەیی کورد بکات. شایەنی باسە شێخ عەبدولسلام بارزانی پەیوەندیەکی پتەوی لەگەڵ ئەم کۆمەڵەیەدا هەبووە.

٣ – ساڵانی پێش جەنگی دووەمی جیهان ئەڵقەیەکی نیشتمان پەروەرانی کورد بەناوی(حیزبی ئازادیخوازی کوردستان) بەڕێبەری (دکتۆر عەزیز زەندی) لە ساڵی ١٩٣٩دامەزرێندرا. ئەم حیزبە لەبەرامبەر سیاسەتی دیکتاتۆرییانەی ڕەزا شادا دامەزراو هەوڵی بڵاوکردنەوەی بیری ئازادیخوازی

لەنێو کورد و ئەرمەن و ئاشوری و تورکدا دەدا. لەساڵی ١٩٤١ دا بەیەکجاری لەسەر شانۆی سیاسی ڕووداوەکاندا بوونی نەما.

٤ – لە(١٦) ئابی (١٩٤٢) پۆلێك لەخەڵکی مەهاباد لەبن دارەکانی (حاجی داود) لەقەراغ چۆمی سابڵاخ لەسەر ڕێگای ئورمیە بەنهێنی کۆبوونەوەیەکیان سازدا(میر حاج ئەحمەد) کە ئەفسەرێکی کوردی باشووری کوردستان و ئەندامی نهێنی حیزبی هیواش بوو بەمەبەستی پتەوکردنی پەیوەندی کوردی نێوان هەردوو پارچەکەی کوردستان ئامادەی کۆبوونەوەکە بوو. لەئەنجامی کۆبوونەوەکەدا بڕیاری دامەزراندنی کۆمەڵەی



ژیانەوەی کورد(ژێ کاف) درا لەلایەن عبدالرحمن زەبیحی و عەزیزی زەندی و حوسێنی فروهەر و قاسمی قادری قازی و هەردوو شاعیری نەتەوەیی کورد(هێمن مەهابادی) و (هەژار موکریانی) و مەلا عەبدوڵڵای داودی و چەند تێکۆشەرێکی تری کوردەوە دامەزرا، کۆمەڵەیەکی نیشتمانی و نەتەوەیی و دیموکراتی بووە، بەمەبەستی ئازادکردنی نەتەوەی کورد و، یەکخستنەوەی کوردستان و پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان، شایانی باسە قازی محمد لەکۆتایی ساڵی ١٩٤٤ بەئەندام لەکۆمەڵە وەردەگیرێت، و بەهاتنە ڕیزی قازی محەمەد جەماوەری کۆمەڵەی ژێ کاف گەورەترو فراوان تر بوو، چونکە قازی محەمەد کەسایەتێکی ناسراوی شاری مەهاباد و ناوچەی موکریان بوو،

بەژیانی هەردوو کۆمەڵی شار و لادێ ڕاهاتبوو، بەخەڵکی عەشیرەتی و شارستانیەوە ڕێزیان دەگرت، لەبنەماڵەیەکی ئاینی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیر وخەباتگێڕ بوو، هەروەها قازی محەمەد بەر لەوەی ببێتە ئەندام لە ژێ کافدا لای سۆڤیەتییەکان ناسرابوو، چونکە قازی محمد لەگەڵ ئەو وەفدە کوردییەبوو کە لەکۆتایی ساڵی ١٩٤١ دا سەردانی (باکۆ) یان کرد. پاشان لە سەرووی ئەو وەفدە کوردیەوە بوو سەردانی دووەمی نوێنەرانی کورد بۆ (باکۆ)لە کۆتاییەکانی ئەیلوولی ساڵی ١٩٤٥. کۆمەڵەی (ژێ کاف) بوو بە بناغەی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە ١٦ی ئابی ١٩٤٥، قازی محەمەد بوو بەسەرۆکی حیزب و چەند کەسێکیش بەئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردران.

ئەم کۆمەڵەیە گۆڤارێکی بەناوی (نیشتمان) ەوە دەرکرد .

## سێیەم: پارت و کۆمەڵەو ڕێکخراوە کوردییەکانی باشوری کوردستان:


ئەمیر لیوا مستەفا پاشا یاملکی

١ – ساڵی ١٩٢٢ لەشاری سلێمانی (کۆمەڵەی کوردستان) لەلایەن (مستەفا پاشای یامولکی) دامەزرا.

٢ – لە ساڵی ١٩٣٧ (حیزبی هیوا) لەشاری کەرکووك دامەزرا، کە سەرەتا ناوی (دارکەران) بوو بەناوی ڕێکخراوێکی نەتەوەیی ئیتاڵی

ناونرابوو، که داوای یەکێتی ئیتاڵیای دەکرد له دامەزرێنەره یەکەمینەکانیشی: مستەفا عوزێری، یونس رەئووف، جەلال قادر، موسا عەبدولسەمەد، ئیحسان حاجی ئەحمەد، خەلیل حەمەد و فەتاح جەبار بوون، که گشتیان قوتابی ناوەندی و ئامادەیی بوون، پاشان ئەمانەپەیوەندیان بەکەسایەتی (رفیق حیلمی) کرد، که کەسایەتێکی شۆڕشگێڕی بەناو بانگی کوردبوو، ئەو کاتەش پایەی (مفتشی پەروەردە) بوو لەوەزارەتی (مەعاریف - پەروەردە) بۆیە ساڵی ١٩٣٩ ناوی (دارکەران) گۆڕاو بوو بەحیزبی (هیوا) لەسەر ناوی کۆمەڵەی (هێڤی) و،رەفیق حیلمی کرا بەسەرۆکی باڵای حیزبی هیوا.



رەفیق حلمی

٣ - لەپایزی ١٩٤٥ (پارتی شۆڕش) لەلایەن صالح حەیدەری دامەزرا کەلەبنەڕەتدا ناوی(حیزبی شیوعی لەکوردستانی عێراق) بووە.بەڵام بەهۆی بڵاوکراوەکەیان بەناوی (شۆڕش) ناودەبران.

٤ - لەکۆتایی ساڵی ١٩٤٥ (پارتی رزگاری کورد) دامەزرا، هەروەها له ١٦ ی ئابی ١٩٤٦ (پارتی دیموکراتی کورد) لەشاری بەغداد بەنهێنی دامەزراو لەکۆنگرەی سێی ئەم پارته که له٢٦ی کانونی دووەمی ١٩٥٣ لەشاری کەرکووك بەسترا ناوی پارتەکه بوو به (پارتی دیموکراتی کوردستان)

## چوارەم: پارت و کۆمەڵەو ڕێکخراوە کوردییەکانی ڕۆژئاوای کوردستان:



١ – کوردانی سوریا ڕۆڵی سەرەکی و گرنگیان لەدامەزراندنی (پارتی خۆیبوون)دا هەبوو، کە لەساڵی ١٩٢٧ لەهاوینە هەواری (بەحەمدون) لەلبنان دامەزرا، ئەم پارتە لەیەکگرتنی چوار ڕێکخراو و کۆمەڵەی کوردی ئەوکاتە پێکهاتبوو، ئەوانیش:کۆمەڵەی تەعالی کوردستان، ڕێکخراوی کوردستان، ڕێکخراوی نەتەوەیی کوردو کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردبوون. خۆیبون توانی لەماوەیەکی کەمدا دەیان لق لەکوردستان و دەرەوەی کوردستان (ئەوروپا و ئەمەریکا)دا بکاتەوەو لەهەموو پارچەیەکی کوردستانیشدا خەڵکی جیاجیا پەیوەندیان پێوەکرد.



ئەمیرکامەران عالی بەدرخان (لەنێوان دووکچەکەی ئەکرەم جەمیل پاشا) وە لەوانەی دانیشتوون لەو بەری ڕاستەوە) ئەکرەم جەمیل پاشا . وە لەوانەی ڕاوەستاون لە نێوانیاندا (نورەددین زازا)

پاشان دوای هەرەس هێنانی شۆڕشی ئاگری داغ، لەکۆتایی ساڵی ١٩٣٠ئەوە بوو بارەگای سەرەکی پارتەکە لە کوردستانی سوریا (کوردستانی خۆرئاوا) دامەزرا.

ئامانجی سەرەکی خۆیبون خەبات و تێکۆشان بوو لەپێناو بەگژداچوونەوەی دوژمنان و بەدیهێنانی ڕزگاری و سەربەخۆیی و یەکخستنی کوردستان.

ئەم پارتە دوو ڕۆژنامەی بە زمانی کوردی (هاوار ١٩٣٢)و ڕوناهی ١٩٤٢بەسەرپەرشتی جەلادەت بەدرخان دەرکرد.

٢ – لەئابی ١٩٥٧ (پارتی دیموکراتی کورد–سوریا) دامەزرا. کە نورالدین زازا بەسەرۆکی پارت و، عوسمان صەبری بە سکرتێری گشتی پارت دانرا. لەگرنگترین ئامانج و بەرنامە ڕامیارییەکانی ئەو پارتە: (ڕزگاری و یەکخستنەوەی کوردستان) و (بەرەنگاربوونەوەی ئیستعمار) و (تێکۆشان لە پێناوی دیموکراتی لە سوریا)دا بوو.

# بەشی حەوتەم

## ١- کوردستان لەکات و لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم

### * کوردستان لە ماوەی ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا ( ١٩١٤ - ١٩١٨ ) ز:

ماوەیەك بەر لەدەست پێکردنی جەنگ لایەنە ڕکەبەرەکان بەگەرمی کەوتبوونەخۆو زانیاریان دەربارەی کوردستان کۆکردەوە، هەر لەژمارەی هۆزەکان و ژمارەی ئەندامەکانیانەوە تا دەگەیشتە دابونەریت و جۆری چەکەکانیان و شوێنی جوگرافی و ... بۆیە لەیەکەم ساتەکانی شەڕەوە هەروەك لازاریف دەڵێ: یەکەم تەقەی جەنگی جیهانی یەکەم لەخۆرهەڵاتی نزیکدا لەکوردستانی ئێران دەستی پێکرد)، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە عوسمانییەکان و ئەڵمانەکان لەو دەڤەرەدا بە تەنیا هەڕەشەیان لەڕێگای هیندستان نەدەکرد، کە بەریتانیەکان بەرژەوەندیەکانی خۆیان تیادا دەدۆزیەوە، بەڵکو هەڕەشەیان لە کێڵگە نەوتیەکانی باشووری کوردستان و کەنداویش دەکرد.

سەرەتاکانی جەنگ عوسمانییەکان بەناوی(غەزا و جیهاد) توانیان بەشی زۆری کوردان ڕاکێشنە ناو جەنگ و ناوچەکانی دەوروپشتی دەریاچەی ئورمیە(ڕەزائیە) داگیر بکەن و کاولکاری و تاڵانی تیدا بنێنەوە، بەڵام ساڵێکی نەخایاند عوسمانییەکان لەبەرەی باکوروی کوردستان لە شەڕی (ساری قامیش) لەبەرامبەر ڕووسەکاندا ڕووبەڕووی شکستێکی گەورە بوونەوە، ئەنجامی ئەم شەڕە ئەوە بوو ڕووسەکان پێشڕەویان کرد بۆ

داگیرکردنی ناوچەکانی قارس و ئەرزڕۆم و ئورمیەو موکریان و ڕەواندز و پێنجوین و خانەقین، عوسمانییەکان لەکاتی پاشەکشەیان دا ڕەشبگیر کەوتنە گیانی خەڵکی مەدەنی کوردستان و هەر بەبیانوی شەڕەوە زیاتر لە ٧٠٠,٠٠٠کەسیان لە کوردستان گواستەوە بۆ خۆرئاوای ئەنادۆڵ بەمەرجێکیش نابێ لەوێ لە٥٪ی دانیشتوانی زیاتربن و، جگە لەزمانی تورکیش نابێ بەهیچ زمانێکی تر قسەبکەن، شایانی باسە ژمارەیەکی زۆر لە ڕێگادا لەبەر سەرماو سۆڵەی زستان و بێ خۆراکی و نەخۆشیەوە مردن. ڕووسەکانیش لە شارەکانی (وان، مەهاباد ، شنۆ) قەسابخانەی گەورەیان خولّقاند، هەروەها بەرەی (خانەقین، کرماشان) شەڕی سەختی نێوان عوسمانییەکان و ڕووسەکانی بەخۆوەبینی، هەریەکێکیش لەو هێزانە تۆڵەی شکستی خۆی لەکوردی ناوچەکەی دەسەندەوە و جوتیاری ناوچەکەی دەکوشت و زەویەکەی تالان دەکرد و ئاگری تێ بەردەدا. هەرلەم سالانەدا ڕووسەکان لەرەواندز قەسابخانەیەکی گەورەیان خولّقاند، کە زیاتر لە(٥) پێنچ هەزار کەسیان کوشت و لە(٢٠٠٠)هەزار خانووش تەنیا (٥)خانوو بەسەلامەتی مایەوە ئەوانیش شوێنی حەوانەوەی ئەفسەرە ڕووسەکان بوون، لەکاتی گەیشتنی هێزەکانی ڕووس بۆ دەوروپشتی کرماشان و خانەقین، عەشیرەتی سنجابی (سەنجاوی) بەرگرییەکی دلێرانەیان لەبەرامبەر لەشکری ڕووس کرد.بەم جۆرە بەشی کوردستان بەدرێژایی ڕۆژانی جەنگ هەرکاولکاری و تالانکردن و سوتاندن و کوشتن و برین بوو، سەرەڕای ئەو گرانی و برسێتی و نەهامەتیەی کە لەکاتی جەنگدا بلاوبووەوە بە(گرانی گەورە ــ سەفەربەلك) ناسراوە، کە تیایدا زیاتر لەسەد هەزار کەس هەر تەنها لەبرسان مردن و، لەتاوبرسێتی دا خەڵك

گۆشتی مردوو(مرۆڤ و ئاژەڵ)ی دەخوارد، عوسمانییەکان و ڕووسەکان و ئینگلیزەکان و ئەڵمانەکان و ئێرانییەکان بەهۆکاری سەرەکی سەرجەم ئەو کارەساتانە دادەنرێن، هەرچەندە عوسمانییەکان و ڕووسەکان ڕۆڵی سەرەکییان هەبوو لەم بوارەدا. تەنانەت شوێنی دانیشتنی چەندەها عەشیرەت لە کوردستان گۆڕاوەو، چەندەها عەشیرەت بۆ دەرەوەی کوردستان ڕاپێچ کراون.

هەر لەگەرمەی جەنگی یەکەمی جیهاندا، هاوپەیمانەکان لەنێوان خۆیان دا پلانیان دانا بۆ دابەشکردنی موڵکەکانی دەوڵەتی عوسمانی(کوردستان و ئەرمەنستان و خۆرهەڵاتی عەرەبی و ئەنادۆڵ)، ئەوەبوو لە(١٠)ی ئازاری ١٩١٦ ڕێکەوتننامەیەکی نهێنی لەشاری پترسبۆرگ (لینینگراد)مۆرکرا لەنێوان(مارك سایکس)نوێنەری بەریتانیاو پسپۆڕ لەکاروباری خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و(جۆرج بیکۆ) کونسوڵی گشتی فەرەنسا لەبەیروت و(سازانۆڤ) وەزیری دەرەوەی ڕوسیای قەیسەری، کە لەمێژوودا ئەم ڕێکەوتننامەیە بە ڕێکەوتننامەی (سایکس ــ بیکۆ) ناسراوە، ناوەڕۆکی ڕێکەوتننامەکە بریتی بوو لە:

**١- ڕووسیای قەیسەری:** ئەستەنبوڵی بۆخۆی دانا لەگەڵ چەند میلێك لەناوەوە لەسەر هەردوولای گەرووی بۆسفۆر، و بەشێکی گەورەی باکووری کوردستان(بەتایبەت ویلایەتەکانی قارس، ئەرزرۆم، وان ، بەدلیس) و لەگەڵ ترابزۆن وهەموو ئەرمەنستان.

**٢- فەڕەنسا:** تەواوی سوریاو لوبنان و ناوچەی کیلکیا(ئەدەنە)ی تورکیا و ویلایەتەکانی موسڵ و ماردین و دیاربەکر و ئورفە و عەنتاب و خۆرئاوای کوردستانی بەرکەوت.

**٣- بەریتانیا:** ناوەڕاست و خوارووی عێراق و خۆرهەڵاتی ئوردون و هەردووبەندەری حەیفا و عەککای لە فەڵەستین بەرکەوت.

**٤- ناوچەیەکی نێو دەوڵەتیش لەفەلەستین** (قودس و دەوروبەری) خرایە ژێر سەرپەرشتی نێو دەوڵەتییەوە.



دوای هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لەساڵی١٩١٧ بە سەرۆکایەتی لینین و ڕووخانی ڕووسیای قەیسەری، ناوەڕۆکی ڕێکەوتننامەی سایکس-بیکۆ ئاشکرا کرا، ڕووسیا خۆی لێ کێشایەوە.

## *کێشەی ویلایەتی موسڵ ([1]):

لە١١ئازاری ساڵی ١٩١٧هێزەکانی بەریتانیا، کە لەڕێگای کەنداوەوە هاتن، توانیان بەسەرکردایەتی ژەنەڕاڵ (ستانلی مۆد) شاری بەغداد داگیربکەن و، پاشان هێزەکانیان بەرەو باکوور واتە کوردستان (ویلایەتی موسڵ) هەڵکشان و شارەکانی کەرکوك و هەولێریان داگیرکردو بەرەو مەڵبەندی ویلایەتەکە ڕێکەوتن کەشاری موسڵ بوو و تەنها (١٢) میلیان مابوو بگەنە ناو موسڵ، کە ئاگربەستی مۆدرۆس لەلایەن بەریتانیا (بەناوی هاوپەیمانەکان) و لەنێوان عوسمانییەکان لە (٣١تشرینی یەکەمی١٩١٨)


ژەنەڕاڵ مۆد

---

[1] ویلایەتی موسڵ لەسەردەمی ئێستا دا ئەم پارێزگایانە دەگرێتەوە:

(هەولێر، موسڵ، دهۆك، کەرکوك، سلێمانی) واتە تەواوی کوردستانی عێراق دەگرێتەوە،جگە لە ناوچە کوردنشینەکانی سەر بە پارێزگای دیالە واست کە ئەوکاتە سەر بەویلایەتی بەغدا بوون.

بەستراو لەسەر ئەوە ڕێکەوتن ناکۆکییەکانی نێوانیان بەئاشتی و دانوستان چارەسەر بکەن، هەرهێزێکیش لەو شوێنانەی پێی گەیشتوە زیاتر پێشرەوی نەکات، لەماددەی شەشەمی ئاگر بەستەکە داهاتووە ((هاوپەیمانەکان بۆیان هەیە هەرشوێنێکی ستراتیژی داگیر بکەن ئەگەر بزانن کار لەئاسایش و هێمنییان دەکات)).

لەماددەی شانزەهەمیش داهاتووە(دەبێ پاشماوەی هەموو هێزەکانی عوسمانی لەحیجاز و یەمەن و سوریاو میزوپۆتامیا(عێراق و کوردستان) تەسلیم بەنزیکترین سەرکردەی هاوپەیمانەکان لەو ناوچەیەدا بکرێت).بەڵام هێزەکانی بەریتانیا بەسەرکردایەتی ژەنەڕاڵ ولیام مارشاڵ بەردەوام بوون لەپێشڕەوی کردن دا لە(١٨ی تشرینی دووەمی ١٩١٨) چوونە شاری موسڵو پاشان تەواوی ویلایەتی موسڵ کەوتە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا، بەمجۆرە سەنتەری ویلایەتەکەو دەوروپشتی بەبێ شەڕ داگیرکرا. دەوڵەتی عوسمانی ڕەخنەی لەم پەلامارو داگیرکرنە گرت و نارەزایی دەربڕی بەو پێیەی کە لەگەڵ دەقی ئاگربەستەکەدا ناگونجێت، لەهەمان کاتدا ئەو ناوچەیە (ویلایەتی موسڵ) بەپێی ڕێکەوتننامەی سایکس ــ بیکۆ بۆ فەرەنسا دانرابوو، بۆیە ئەمانە لەنێوان بەریتانیا و عوسمانییەکان، دواتریش لەنێوان عێراق و تورکیا کێشەیەکیان دروست کرد کە لە مێژوودا بەکێشەی موسڵ(کیشەی ویلایەتی موسڵ) ناسراوە.

کەمالیەکان لەتورکیا دوای ئەوەی بەسەر هەندێ لەتەنگو چەڵەمەکانی دەرەوەو ناوەوەدا زاڵبوون، ئەوە بوو نوێنەریان لەپەیمانی لۆزان لە٢٤ی تەموزی١٩٢٣ زۆر پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە ویلایەتی موسڵ بەشێکی خاکی تورکیایە و چەندەها بیانووی پووچیان هێنایەوە، لەوانە: گوایە کورد و تورك لە یەك ڕەگەزن و، ناوی چەندەها عەشیرەتی ویلایەتەکەیان بەتورك ناوزەند کرد، وایان ڕاگەیاند کە بەرژەوەندی ئابووری و پەیوەندی

کۆمەڵایەتی ویلایەتی موسڵ زیاتر لەگەڵ ئەنادۆڵ گونجاوە، کە بێتۆمان هەموو ئەمانە بەڵگەی پڕو پووچ و نابەجێن، چونکە لایەنە ناکۆکەکانی کەناویان هات هیچیان ئەو مافەیان ڕۆژێك لەڕۆژان بەسەر ویلایەتەکەدا نییە، بەڵکو دانیشتوانی ڕەسەنی ویلایەتەکە کە بەشی هەرەزۆری کوردن(بەموسڵمان و مەسیحی و ئێزیدی و شەبەك) و عەرەب و تورکمانەوە هەر تەنها ئەوان مافی ئەوەیان هەیە چارەنووسی ویلایەتەکە دیاری بکەن، کەچی تەنانەت لە لکاندنی ویلایەتەکەش بەعێراقەوە پرس و ڕاوێژ بەخەڵکەکەی نەکرا، لەکاتێکدا دانیشتوانی ویلایەتەکە دوو بۆچوونیان هەبوو: یان ئەوەتا بخرێنە سەر ئەو دەوڵەتە کوردیەی کە لە باکووری کوردستان بەپێی پەیمانی سیڤەر (١٠ی ئابی١٩٢٠) بڕیاری دامەزرانی درابوو، یاخود ویلایەتەکە دەوڵەتێکی سەربەخۆی لەژێر فەرمانڕەوایی شێخ مەحمودی حەفید لێ دروست بکرێ، بەڵام بەریتانیا دژی هەموو ئەو ڕاو داخوازیانە وەستا و هەوڵی ئەوەی دەدا ویلایەتی موسڵ بخاتە سەر ئەو دەوڵەتە عەرەبیەی کە لەهەردوو ویلایەتی بەغداد و بەسرە پێکهاتبوو دواتر بە(عێراق) ناسرا، بەریتانیا لەمەدا چەند مەبەستێکی هەبوو:

١- دەستگرتن بەسەر ناوچە نەوتیەکانی ویلایەتەکە (بەتایبەتی کانەکانی کەرکوك).

٢- بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی خۆی بهێنێتە دی کە بریتی بوو لەدەستگرتن بەسەر ئەو ڕێگا بازرگانیە گرنگەی کە بەکەرکوك و خانەقین و قەسری شیرین و کرماشان دا دەڕوات و دەریای ناوەڕاست بەهیندستانەوە دەبەستێتەوە.

٣- بەرژەوەندییە سیاسییەکانی خۆی بهێنێتە دی، کە بریتی بوو لە وەی چەند حکومەتێکی دەستکەلای خۆی لەناوچەکەدا دروست بکات، تا دەسەلاتی پتەوتربێت و، ئەو حکومەتانە لەسەرێکەوە ببنە بەربەستێك لە بەردەم تەوژمی کۆمۆنیزمی سۆڤیەت و لەسەرێکی تریشەوە مەرامەکانی بەریتانیا بهێننە دی.

هەر بۆیەش سەرەتا پشتیوانیان لە حکومەتی شێخ مەحمود کرد، هەروەها بەهەمان شێوەش حکومەتەکانی عێراق و ئێرانیان هێنایە سەر کار هەر چۆنێك بێت کێشەی موسڵ خرایە بەردەم کۆمەڵەی نەتەوەکان و لە(٢٩)ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٤دا لەکاتی کۆبوونەوەی کۆمەڵەی نەتەوەکان سنورێکی کاتی لەنێوان عێراق و تورکیا دانرا کە بە(هێڵی بروکسل) ناسرا.

لە٣٠ تشرینی یەکەمی هەمان ساڵدا لیژنەیەك لەلایەن کۆمەڵەی نەتەوەکان، کە لەسێ کەس پێکهاتبوو پێکهات بۆ ئەوەی رەوانەی ویلایەتەکە بکرێت ئەمانیش:

١- کۆنت پول تیلیکی (جوگرافی ناسی بەناوبانگ و سەرۆك وەزیرانی پێشووی مەجەر).

٢- ئای. ئێف. ڤێرسن (وەزیری رێپێدراوی سوید لەبوخارست).

٣- ئەی . پولص (عەقیدی خانەنشین لەسوپای بەلجیکی).

ئەمانە لەمانگی کانوونی دووەمی ١٩٢٥دا گەیشتنە موسڵ. لیژنەکە گەشتێکیان بەناوچەکەدا کرد و ڕووی زەوی و پێکهاتەی دانیشتوانەکەیان لە ڕووی نەتەوەیی و ئایینی و مەزهەبییەوە خستە بەرلێکۆڵینەوە سەرژمێرییەکی بە پەلەی ویلایەتەکەیان کرد، ڕاو بۆچوونی خەڵکانێکیان

وەرگرت، دواجار ئەمانەیان بە گشتی لە ڕاپۆرتێکدا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ویلایەتەکە پێشکەش بەکۆمەڵەی نەتەوەکان کرد، کە پووختەکەی بریتی بوو لە:-

١- پێویستە هێڵی بروکسل بەهێڵی سنوری نێوان عێراق و تورکیا دابنرێت.

٢- دەبێ ڕژێمی سەرپەرشتیکردن(الانتداب)ی بەریتانیا بۆ ماوەی (٢٥) ساڵ بەسەر عێراق دا جێبەجێ بکرێت.

٣- کورد تەواوی مافی خۆی دەبێت لە بەڕێوەبردن و کارگێڕی و دادگای تایبەتی داو، زمانی کوردی زمانی ڕەسمی دەبێت لە قوتابخانەو داموو دەزگاکان.

سەبارەت بە عێراق ئەوە بوو کە مەلیك فەیسەڵ و ئەنجومەنی وەزیران دەیانویست کە پەیمانێکی نوێ ببەستن لەگەڵ بەریتانیا کە جێگای پەیمانی ١٩٢٢بگرێتەوەو ماوەی ئینتداب(سەرپەرشتیکردن) بۆ ماوەی (٢٥) ساڵ دیاری بکات و سەربەخۆیی عێراق بپارێزێت، بەڵام بەریتانیا بە هیچ شێوەیەك ئامادەنەبوو دەستکاری پەیمانی ١٩٢٢بکرێ و داواشی لەئەنجوومەنی دامەزراندن و مەلیك فەیسەڵ کرد تا (١١) ی حوزەیرانی ١٩٢٤ دەبێ رازی بن بە بەندەکانی پەیمانەکە کە بەریتانیا بەندەکانی دارشتووە، دووڕێگاشی بۆ هەڵبژاردن:

١- یان دەبێ پەیمانەکە پەسەند بکەن وەك چۆن بەریتانیا دایڕشتووە.

٢- یان ویلایەتی موسڵ دەخاتە سەر تورکیا.

بەمجۆرە مەلیك فەیسەڵ و ئەنجوومەنی دامەزراندن و ئەنجوومەنی وەزیران گشتیان ئامادەبوون ببنە نۆکەر و ئەڵقە لەگوێی بەریتانیا هەر تەنها لەبەر ئەوەی باشووری کوردستان(ویلایەتی موسڵ) یان لەدەست نەچێت و کوردیش بکەنە بە ژێردەستە و کۆیلەی خۆیان.

ئەوەی مایەوە تورکیا بوو، ئەوە بوو لە(٥) حوزەیرانی ١٩٢٥پەیمانێکی سێ قۆڵی لەنێوان بەریتانیا و عێراق و تورکیا بەسترا، کە لە گرنگترین بەندەکانی ئەو پەیمانەش داهاتووە:

١. عێراق و تورکیا بەڵێن دەدەن بە پچڕاندنی پەیوەندیان لەگەڵ هەر سەرۆك و سەرۆك هۆزێکی کە لە ناو دەوڵەتەکەی تردا دەژی.

٢- ڕێگە پێنەدانی دامەزراندنی هێچ ڕێکخراوێك کە دژی هەر کام لەم دوو دەوڵەتە بێت.

٣- تورکیا ڕازی دەبێت کە واز لەویلایەتی موسڵ بێنێت بەرامبەر بەشی نەوتی ویلایەتەکە ئەویش بەرێژەی لە ١٠٪ و بۆ ماوەی(٢٥) ساڵ.

بەڵام پاشان تورکیا وازی لەم بەشە نەوتەی خۆشی هێنا بە وەرگرتنی(٥٠٠) هەزار جونەیهی ئیسترلینی و ڕێگە دان بەتورکیا کە دەست بەرەڵلا بێت لەدامرکاندنەوەی ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینانەی کە لە باکووری کوردستان دژی کەمالییەکان بەرپادەکران.

لەکۆتایی دا کۆمەڵەی نەتەوەکان لە ١٩٢٥/١٢/١٦ بڕیاری دا ویلایەتی موسڵ بخرێتە سەر عێراق و بێ ئەوەی پرس و ڕاوێژ بەدانیشتوانەکەی بکرێت.

## * شۆڕش و ڕا پەڕینەکانی کوردستان و عێراق ١٩١٩ - ١٩٢٠:

لە نێوان ساڵانی (١٩١٩ – ١٩٢٠) زنجیرەیەك شۆڕش و ڕاپەڕین سنوری عێراق(کە هێشتا وەك دەوڵەت دانەمەزرابوو) ی گرتەوە، لەوانە شۆڕشی شێخ مەحمودی نەمر– کەدواتر باسی لێوە دەکەین– ، لە٢٤ی نیسانی ١٩١٩ ڕاپەڕینی کوردی گۆیان لەناوچەی زاخۆ دەستی پێ کردو، لە ١٥ی تەموزی ١٩١٩ناوچەی ئامێدی گرتەوە لە ١٠ی ئابی ١٩١٩ گەیشتە ناوچەی سۆران (ڕەواندز و باڵەکایەتی) و ئینجا هەریرو باتاس، لە١٤تشرینی دووەمی١٩١٩ شۆڕش ناوچەکانی ئاکرێ و زێبار (بارزان) ی گرتەوە و حاکمی سیاسی موسڵ لەلایەن بارزانیەکان کوژرا.

لە(٦)ی حوزەیران١٩٢٠ شۆڕش لە (تەلەعفەر) لەلایەن هۆزە کوردو تورکمان و عەرەبەکانی ناوچەکە دەستی پێکرد و دواتر شەنگال (سنجار)یشی گرتەوە.

بارودۆخی هەولێریش زۆر ئاڵۆز بووبوو، دانیشتوانی شار بەهەموو چین وتوێژێکەوە چەند جار کۆبوونەوەیان ئەنجام دابوو، پشتگیری و پشتیوانی خۆشیان بۆ حکومەتەکەی شێخ مەحمود لە سلێمانی ڕاگەیاند بوو، دواتریش کە شێخ مەحمود دورخرایەوە، دانیشتوانی شار حوکمێکی خۆییان پێکهێناو لە سەرئەوە ڕێککەوتن کە ئینگلیزەکان لەشار وەدەرنێن، ئەوە



برایم خانی دەلۆ

بوو حاکمی سیاسی ئینگلیز لە هەولێر (دبلیو . ئار . های) لە(١٢)ی ئابی ١٩٢٠لە بۆسەیەکدا زۆر بەسەرسوڕمان لەمردن ڕزگاری بوو، ئەم بارودۆخە شڵەژاوەی هەولێر، حاکمی سیاسی گشتی ئەوسای عێراق (ئارنۆلد ویلسن) ی ناچار کرد بەفڕۆکەیەکی تایبەتی بچێتە هەولێر بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخەکەو لەنزیکەوە قسەکردن بۆ خەڵك، بەڵام گشت ئەمانە دانیشتوانی هەولێری سارد نەکردەوە بۆیە دوای گەڕانەوەی (ویلسن) بۆ بەغدا جارێکی تر شۆڕش سەریهەڵدایەوە و ئینگلیزەکان ناچار بوون دووهێزی گەورە لەهەردوو قۆڵی کەرکوك و موسڵ ڕەوانەی هەولێر بکەن، دواتریش (کۆیە) چووە پاڵ شارە ڕاپەڕیوەکانی تر.

لەناوچەی گەرمەسێرو گەرمیانیش شۆڕش زۆر بەسەختی تەشەنەی کرد و کوردان توانیان شاری(قزرابات ــ السعدیە) و دەوروپشتی ئازاد بکەن

پاشان کڵپەی ڕاپەڕین خانەقین و مەندەلی گرتەوە و هۆزە کوردەکانی ئەویش هێرشیان کردە سەر کۆمپانیای نەوتی بەریتانی ـ ئێرانی لە(نەفت خانە)، هەروەها هێڵی شەمەندەفەری نێوان (خانەقین و بەغدا) و (خانەقین و کەرکوك) یان تێکدا بۆ ئەوەی یارمەتی سەربازی نەگاتە دەستی ئینگلیزەکان.

گرنگترین شۆڕشەکانی گەرمیانیش، شۆڕشەکەی برایم خانی دەلۆ بوو لەکفری، کە لە گرنگترین هۆیەکانی:

١- شوێنی شاری کفری کە کەوتۆتە نێوان شاری بەغداد و سلێمانی، چونکە دەنگ و باسی هەر ڕووداوێك بەزوویی دەگەیشتە شارەکە کاریگەری خۆی لەسەر دادەنا.

٢- کاتێك کە شێخ مەحمود شۆڕشەکەی لەسلێمانی بەرپاکرد برایم خان یەکێك بوو لەوانەی کە چووە پاڵ شۆڕشەکەو پشتگیریان لێکرد، کاتێکیش کە ئینگلیزەکان دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی پروپاگەندەو دووریان خستەوە دژ بە ئینگلیزەکان وەستاو شۆڕشی لەدژیان بەرپاکرد.

٣- ڕەفتاری خراپی حاکمی سیاسی شار کە ناوی (سۆلۆمۆن) بوو بەرامبەر بەدانیشتوانی کفری و هەڵسوکەوتی ناشیرینی لەگەڵیاندا.

٤- ئاواتی برایم خان لەسەربەخۆیی کوردستان و ڕزگاربوون لەدەسەڵاتی بێگانەوناحەزان.

ئەوە بوو شۆڕشگێڕان بەسەرۆکایەتی برایم خان دەستیان بەسەر شار دا گرت و کاپتن(سۆلۆمۆن) یش بەر سزای گەل کەوت و، بۆ ماوەی چەند مانگێك کفری بە ئازادکراوی مایەوە، بەڵام ئینگلیزەکان لەشکرێکی

گەورەیان لەکەرکوکەوە ناردو هەردوولا لەدەشتی گەرمیان بەیەك گەیشتن، دواجار لەشکری کوردان شکا و کفری دەستی بەسەردا گیراوە.

شایانی باسە دوای ئازادکردنی کفری شاری دوز لەلایەن هۆزە کورد و تورکمانەکانی ناوچەکەوە ئازاد کرا.


شێخ شەعلان ئەبولجون

لە فوراتی ناوەڕاستیش دا هۆی ڕاستەوخۆی شۆڕشی ١٩٢٠ئەوە بوو کە ئینگلیزەکان (شێخ شعلان ابوالجون)ی سەرۆکی عەشیرەتی(الظوالم) یان لەبەندیخانەی (رمیثە) بەندکرد، ئەوە بوو لە٣٠حوزەیرانی ١٩٢٠لە بەندیخانە دەرچوو ئیتر ئاگری شۆڕش هەڵکراو گشت ناوەڕاست و باشووری عێراقی گرتەوە، کە گشت چین و توێژ و گەورەو بچووك بەشداریان تێدا کرد و زیاتر لەپێنج مانگ بەردەوام بوو، لەئەنجامدا(٢٢٦٩) کەس لە هێزەکانی بەریتانیا کوژران و بزربوون و بەدیل گیران، زیانی مادی ئینگلیزەکانیش گەیشتە زیاتر لە(٤٠) ملیۆن پاوەندی ئیسترلینی.

## * دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق:

دوای ئەم هەموو شۆڕش و راپەڕینە بەر بڵاوانەی کە سەرتاپای عێراقی گرتەوەو ئەو زیانە گیانی و مادییەی بەر هێزەکانی بەریتانیا کەوت (ئارنۆلد ویلسن) لابراو (سێر برسی کوکس) کرا بەمەندوبی سامی بەریتانی لەعێراق، ئینگلیزەکان بەڵێن و پەیمانیان بەگەلانی عێراق و کوردستان دا کە ئامادەن رێرەوی ئیداری و سیاسی خۆیان بگۆڕن.

لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٠کۆکس گەیشتە بەغدا و بانگەوازی دەرکرد کە لە ژێر سایەو سەرپەرشتی خۆیدا حکومەتێکی خۆیی دروست دەکات، وێڕای ئەوەش کوکس لەهەرەشەدا دەستێکی باڵای هەبوو، ئەوە بوو لە٢٥تشرینی دووەمی ١٩٢٠ حکومەتێکی کاتی عێراقی دامەزرا(تەنها لە هەردوو ویلایەتی بەصرەو بەغداد) دوای ئەوەی کە کوکس توانی قەناعەت بە نەقیبی ئەشرافی بەغداد( عبدالرحمن نقیب گەیلانی) بکات کە ببێتە سەرۆکی ئەو حکومەتە(واتە سەرۆك وەزیران).

لە ئازاری ١٩٢١ کۆنگرەی قاهیرە بەسەرپەرشتی(ونستۆن چەرچل)ی وەزیری داگیرکەکانی بەریتانی و ئامادەبوونی گشت مەندوبەکانی سامی بەریتانی بەسترا لەوێدا باس لەچوار خاڵی سەرەکی کرا:-

١- دەست نیشانکردنی فەیصەڵ کوڕی حوسێن بۆ پۆستی پاشایەتی عێراق.

٢- مانەوەی هێزەکانی بەریتانیا لە عێراق و کەمکردنەوەی خەرجی بەریتانیا بۆ هێزەکانی.

٣- ویلایەتی موسڵ(باشووری کوردستان) بڕیاردرا حوکمێکی سەربەخۆی لێ پێك بهێنرێت و ڕاستەوخۆ لەلایەن مەندوبی سامی بەریتانییەوە بەڕێوەببرێت.

٤- کێشەی نەتەوەکانی عێراق (داواکاریەکانیان، پێداویستەکانیان) و چۆنیەتی چارەسەرکردنیان.

ئەوە بوو لەڕۆژی٢٣ئابی١٩٢١ ئاهەنگی ڕەسمی بوونە پادشایی فەیسەڵ سازکرا، پاشان دەسەڵاتی ئینگلیز لە ١٢تەموزی١٩٢٢ دا هەڵبژاردنێکی ساختەیان بۆکرد، لەم هەڵبژاردنە دا لیوای سلێمانی بەشداری نەکرد (بەبیانوی شۆڕشی شێخ مەحمود و نائارامی ناوچەکە)، لیوای کەرکوك دژی مەلیك فەیسەڵ دەنگیان دا، لیوای هەولێر و لیوای موسڵ(ئەو کاتە دهۆك قەزایەکی سەر بە موسڵ بوو) بەو مەرجە بڕیاریان دا دەنگ بدەنە مەلیك فەیسەڵ کە دەبێت تەواوی مافە سیاسی و مەدەنی و ڕوشنبیریەکانی کورد (بە جیاوازی ئایین و مەزهەبەوە) دابین بکرێت و بپارێزرێت، لەگەڵ ئەوەش دا ئەنجامی مەلیك فەیسەڵ بەهۆی هەڵبژاردنە ساختەکەوە دەرچوو کرا بە پادشای عێراق.

## * گرنگترین پەیمانەکانی عێراق ـــ بەریتانیا:

مەلیك فەیسەڵ شان بەشانی عێراقیەکان وەستا لەوەی کە دەبێ ڕژێمی سەرپەرشتیکردن (الانتداب) بگۆڕدرێت تا وەکو ئەو دەسەڵاتەی وەریگرتووە شێوەیەکی سەربەخۆیی وەربگرێت، بۆیە باشترین ڕێگاچارەبۆ دیاریکردنی پەیوەندی نێوان عێراق و بەریتانیا بەستنی پەیمانێك بوو کە

ماف و سنوری دەسەڵاتی هەردوولا دەستنیشان بکات، لەبەر ئەوە مەلیك فەیسەڵ ئەو پێشنیارەی بەریتانیای پەسەند کرد، کە پەیمانێکی عێراقی ــ بەریتانی ببەسترێت بەو مەرجەی جێی ئینتداب بگرێتەوە، چونکە پەیمان بەستن ئەوە دەگەیەنێت کە لەسەر بەرژەوەندی هەردوولا مامەڵە لەگەڵ یەکتردابکەن، نەك لەسەر بناغەی ئاغا و نۆکەر یان سەردەست و ژێر دەست. لەبەر ئەوە مەلیك و عێراقییەکان پرۆژەی پەیمانی عێراقی ــ بەریتانی  ساڵی ١٩٢٢ یان ڕەت کردەوە، بەریتانیا ویستی برگە و خاڵەکانی ئینتداب بەشێوەی پەیمان دابڕێژێت، هەروەك لەبەندەکانی داهاتووە:

١- پەیمانەکە بۆ ماوەی(٢٠) ساڵ دانرا.

٢- عێراق دەبێت پرس و ڕاوێژ بەبەریتانیا لەکاروباری ئابووری(دارایی) و دەرەوەو سەربازی دابکات.

ساڵی ١٩٣٠ پەیمانێکی تری عێراقی ــ بەریتانی بەسترا بۆ گۆڕین و دەستکاریکردنی پەیمانی١٩٢٢ز کە لە گرنگترین بەندەکانی پەیمانەکە داهاتووە:

١- بەریتانیا دان دەنێت بەسەربەخۆیی عێراق لەحاڵەتێکدا ئەگەر عێراق بووە ئەندام لەکۆمەڵەی نەتەوەکان.

٢- بەریتانیا بۆی هەیە لەکاتی جەنگ دا خاکی عێراق بەکاربهێنێت.

٣- هەردوو بنکەی ئاسمانی(بەسرەو حەبانیە) لەژێر دەستی هێزی ئاسمانی پادشایەتی بەریتانی دا دەمێننەوە.

٤- لەکاروباری دەرەوەدا پرس و ڕاوێژ لەنێوان عێراق و بەریتانیا دادەکرێت.

٥- لەکاتی بەئەندامبوونی عێراق لەکۆمەڵەی نەتەوەکان پەیمانەکە جێ بەجێ دەکرێت و هەر بەردەوام دەبێت.

٦-ماوەی پەیمانەکەش٢٥ساڵە.

ساڵی ١٩٣٢ لەکۆمەڵەی نەتەوەکان دابوو بە ئەندام، ساڵی ١٩٣٣ مەلیك فەیسەڵ مرد و مەلیك غازی کوڕی جێگای دەگرێتەوە تا ساڵی ١٩٣٩ لە حوکم دا مایەوە.

# بەشی هەشتەم

## ڕا پەڕین و شۆڕشەکانی کورد لە نێوان نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە تاکۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی بیست

### أ-ماوەی نێوان سالآنی ١٨٥٠ - ١٩١٤:

#### ١- شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری :-

لەناوبردنی دەسەلآتی میرایەتییەکانی کورد جۆرێك لەنائارامی لەکوردستان دا بەدوای خۆیدا هێنا و عوسمانییەکان سووربون لەسەر سیاسەتی دەسەلآت سەندنەوە لەمیرە کوردەکان و سەپاندنی دەسەلآتی ناوەند بەسەریاندا. لەکاتێکدا توانیان دەسەلآت لەکورد بستێننەوە، بەلآم لەسەپاندنی دەسەلآتی ناوەند بەسەریاندا سەرکەوتوو نەبوون، چونکە دەسەلآتی عوسمانی ئەو بۆشاییە سیاسییەی پێ پڕنەکرایەوە کەبەهۆی لەناوبردنی میرنشینەکانی کوردەوە دروست بوو، بۆیە لەجاران زیاتر ئالۆزی و پشێوی کەوتە نێو ژیانی سیاسی و کۆمەلآیەتی کوردەواری و هۆزەکانی کورد، دەوڵەتیش بۆ چارەسەرکردنی بارودۆخەکە ڕێگای هێرش و پەلاماری سەربازی گرتە بەر بەمەش بارودۆخەکەیان ئالۆزتر کرد. کاربەدەستانی عوسمانی و ئێرانی بەسەپاندنی دەسەلآتی ناوەند بەسەر کوردستان دا زوڵم و ستەمی زۆرتریان بۆ کورد هێنا، باج و سەرانەی زیاتر بەسەر خەڵکدا سەپێنرا، کاربەدەستی بێگانە جێگای کاربەدەستە ناوچەییەکانیان گرتەوە گەنج و لاوی کورد بەزۆری ڕاپێچی سەربازی دەکران، ئەم بارودۆخە بوو بەکۆسپێکی گەورەی سەر ڕێگای پەرەسەندنی ژیانی ئابووری و

کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی خەڵکی کوردستان و، لەژێر سایەی دەسەڵاتی قاجاریەکاندا. وێڕای ئەمانە چەوساندنەوەی مەزهەبیش زیادیکرد. جەنگەکانی نێوان (عوسمانی ــ ڕوسیا)ش جگە لەوەی بارودۆخی سیاسی و ئابووری عوسمانییەکانی لاوازتر کرد، باری سەرشانی کوردەکانیشی قورستر کرد، لەئەنجامی شکستی دەوڵەتی عوسمانی لەجەنگی(١٨٧٧ ــ ١٨٧٨)ز لەگەڵ ڕوسیا دا خەزێنەی دەوڵەتی عوسمانی بەتەواوی نابووت بوو، بۆیە کاربەدەستان کەوتنە بەرزکردنەوەی ڕادەی باج و سەرانەو ڕووتاندنەوەی زیاتری خەڵك، تەنانەت لەکوردستان بارودۆخەکە بەئاستێك گەیشت ژمارەیەك خەڵك لەبرسا مردن، بۆیە تاقە ڕێگا لەبەردەم گەلی کورد لەو کاتەدا ڕزگار بوو بوون لەدەسەڵاتی عوسمانی لەڕێگای ڕاپەرینەوە،ڕاپەڕینی کوڕانی میربەدرخان (حسین کەنعان پاشاو عوسمان پاشا) لەساڵانی بەر لەڕاپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا وەڵامدانەوەی کورد بوو بۆ ئەم دۆخە نالەبارەی کوردستان. هەموو ئەو ڕووداوە ناوخۆیی و ناوچەیی نێو دەوڵەتییانە شێخ عوبەیدوڵڵای خستە بەردەم لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی بارودۆخەکە و سەرەنجامیش نەخشەدانان بۆ ڕاپەڕین و ڕزگارکردنی کوردستان.

شێخ عوبەیدوڵڵا پیاوێکی خاوەن دەسەڵات بوو، ڕێبازی نەقشبەندیش لەزەمینەسازی بۆ ڕاپەڕینەکەی ڕۆڵی کاریگەری هەبوو، شێخ سوودی لە بارودۆخی خراپی ناوچە کوردنشینەکان وەرگرت و بیروباوەڕی سیاسی خۆی لەسەر بناغەیەکی ئاییني ــ نەتەوەیی دارِشت، بەمجۆرە لەدوای دەسەڵات سەندنەوە لەمیرەکانی کورد شێخ عوبەیدوڵڵا دەبێتە یەکەمین

ڕێبەر لەمێژووی نوێی کورد کە جڵەوی بزاڤی ڕزگاریخوازی گەلی کورد بگرێتە دەست.

لەکۆتایی تەمووزی ساڵی١٨٨٠ز دا شێخ عوبەیدوڵڵا بەمەبەستی یەکخستن و ڕێکخستنی ڕیزەکانی کورد کۆبوونەوەیەکی لەگوندی نەهری ناوچەی شەمزینان لە ویلایەتی هەکاری بەست کەنزیکەی (٢٢٠) سەرکردەی خێڵ وعەشیرەتەکان و دەرەبەگ و ڕیش سپی ئامادەبوون، لەم کۆبوونەوەیەدا چەندین خاڵی گرنگ باسکرا.لەوانە:-

١- پێکهێنانی یەکەمین ڕێکخراوی سیاسی کوردی بەناوی(یەکێتی کوردان).

٢- شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە کۆبوونەوەکەدا باس لەدامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆو یەگرتوو دەکات، بۆیە داوا لە ئامادەبوان دەکات دژی هەردوو دەوڵەتی ئێرانی و عوسمانی تێبکوشن.

٣- کۆبونەوەکە بڕیاری دا یەکەمجار ڕاپەڕین لە ناوچەکانی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی قاجاری دەست پێبکات لەبەر ئەم هۆیانە:-

أ- بێهێزی دەوڵەتی قاجاری لەو کاتەدا بە بەراورد لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی، چونکە ئەو کاتە قاجاریەکان خەریکی شەڕکردن بوون لەگەڵ هۆزە تورکمانەکانی سنووری باکووری خۆرهەڵاتی ئێران.

ب- ئەو بەشەی کوردستان لەڕووی کشتوکاڵییەوە دەوڵەمەندترو بەپیت تربوو لەکوردستانی بندەستی عوسمانی. ئەمەش بەپێی گوتارەکەی شێخ سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند بۆ ڕاپەڕینەکە دابین دەکات بۆ بەگژداچوونەوەی دوژمنی دووەم کە بەهێزترە ئەویش عوسمانییەکانن.

جـ- ئەو ستەم و زۆردارییەی کە کوردەکانی ژێر دەسەڵاتی قاجاری ڕووبەڕووی ببوونەوە بە تایبەتی دوای کوشتارەکەی هۆزی و مەنگوڕ و بڵباس، بۆیە تەواوی خەڵکی موکریان لەستەم و زۆرداری (لوتف عەلی میرزا)ی حاکمی سابڵاخ بێزار بوون.

بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە کوردستانی بندەستی عوسمانییەوە هەبوو، شێخ عوبەیدوڵڵا لەبەر ئەم هۆکارانە بڕیارپیدا ڕاپەڕین لە ناوچەکانی عوسمانی بەرپا بکات:-

١- لەئەنجامی دوا شەڕی عوسمانی - ڕوسی (١٨٧٧ - ١٨٧٨ز) بەشێکی کوردستان ببوو بەگۆڕەپانی شەڕ و بەمەش ناوچە کوردییەکان بەتایبەت لەلایەن سوپای عوسمانییەوە دووچاری تاڵان و کاولکاری بوون، قورسایی ژیانی سەربازەکان کەوتبووە سەرشانی خەڵکی لادێکانی کوردستان، وێڕای ئەوەی کاربەدەستانی عوسمانی تادەهات ڕادەی باجیان زیاتر و ماوەی کۆکردنەوەشیان کورتر دەکردەوە.

٢- لەئەنجامی هەردوو پەیمانی سان ستیڤانۆ و کۆنگرەی بەرلین (١٨٧٨ز) ناوچەیەکی زۆری کوردەواری کەوتە ژێر دەستی ڕوسیای قەیسەری بەتایبەتی ویلایەتی(قارس) و دەوروبەری، ئەمەش خەڵکەکەی ڕووبەرووی ئاوارە بوون و برسێتی نەهامەتی زۆرکرد.

٣- لە هەریەکێك لەپەیمانی سان ستیڤانۆو و کۆنگرەی بەرلیندا مادەی تایبەت بەمافی گەلی ئەرمەن لە چوارچێوەی سنووری عوسمانیدا دیاری کرابوو، کەچی باسی گەلی کوردو مافەکانی کورد نەکرابوو.

هەرچەندە مەسەلەی مافی ئەرمەن بۆ دەست خستنە نێو کاروباری دەوڵەتی عوسمانی لەلایەن دەوڵەتە گەورەکانی وەك ڕوسیا و بەریتانیا و

فەرەنسا بەکاردەهێنرا، بەلاَم بۆکوردیش مایەی هەڕەشەو مەترسی بوو بەتایبەتی ئەگەر ئەو مافانە لەسەر حسابی نیشتمانی کورد بووایە.

هەموو ئەو خالاَنەو ئەوانەش کە لە سەرەتای ئەم بەشەدا خستمانە روو پێویستی ڕزگارکردنی کوردستانی ژێر دەسەلاَتی عوسمانیان خستە نێو بەرنامەی سیاسی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهرییەوە.

هێزەکانی شێخ عوبەیدوڵڵا بۆ ئازادکردنی کوردستانی بندەستی قاجاری بەسەر سێ قوڵدا دابەشبوون:-

**قۆڵی یەکەم:** ڕزگارکردنی ناوچەی موکریان تا دەگاتە تەبریز ئەم قۆڵە لەژێر سەرکردایەتی هەمزاغای مەنگوڕ و شێخ عەبدولقادری کوڕی دابوو.

**قۆڵی دووەم:** کە ئەرکی ڕزگارکردنی ناوچەی ئورمیە بوو شێخ عوبەیدوڵڵا خۆی سەرکردایەتی دەکرد.

**قۆڵی سێیەم:** ڕزگارکردنی خوی و سەلماس بوو کە بە خەلیفە محەمەد سدیق سپێردرا. لەقۆڵی یەکەمدا کوردەکان سەرکەوتنی گەورەیان بەدەست هێناو ناوچەی موکریان تا دەروازەکانی تەبریزیان ڕزگار کرد.

لەقۆڵی دووەم دا ئابلۆقەی شاری ئورمیە دراو دەوروبەرەکەی ئازادکرا، بەلاَم خودی شارەکە ڕزگارنەکرا لەبەر ئەم هۆیانە:-

١- شێخ عوبەیدوڵڵا ویستی بە بێ شەڕ بچێتە ناو شارەکەوە بۆیە چەند نامەیەکی بۆ پیاو ماقوڵانی شارەکە ناردو داوایکرد شارەکە بەدەستەوە بدەن، کاربەدەستانی ئورمیە داوای(٣) ڕۆژ مۆڵەتیان کرد بۆ خۆبەدەستەوەدان، لەو ماوەیەدا توانیان قەلاَ و دەروازەکانی شار قایم

بکەن و یارمەتی هێزەکانی دەوڵەتیشیان لەقۆڵی(تەبرێز — سەلماس)پێگەیشت.

٢- ئیقبال دەولەی حاکمی شاری ئورمیە وای لە خەڵکی شارەکە گەیاندبوو کە لەشکری کوردان لەناوچەی موکریان تاڵانی و کوشتنێکی زۆریان لە خەڵك کردووە و ئەگەر بێنە ناو (ئورمیە) وە هەمان ستەم و زۆرداری دووبارە دەکەنەوە، بۆیە خەڵکەکە پشتیوانی ئیقبال دەولەیان کرد.

٣- هێزی کورد هێزێکی نارێك و پێك بوو لە ڕووی زانستی سەربازی و تەکنیکی جەنگیدا بە بەراوورد لەگەڵ سوپای قاجاری دا، تەنانەت لە کاتی گەمارۆی شاری ئورمیە دا هێزەکانی شێخ پێداویستی و کەرەستەی جەنگیان لێبڕا. بەمانایەکی تر هێزەکانی شێخ هێندەی لەسەر بنچینەی خێڵایەتی بوو هێندە لەسەر بنچینەی زانستی سەربازی نوێ دانەمەزرێنرابوو.

٤- ڕۆڵی دکتۆر کۆچران نێردراوی ئەمریکایی لە ئورمیە کە پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵ شێخ هەبوو، شێخ عوبەیدوڵڵای لەگرتنی شاری ئورمیە سارکردەوە.

سەرەنجام هێزەکانی شێخ عوبەیدوڵڵا لەسەرجەم قۆڵەکانەوە پاشەکشەیان کردو لەکوردستانی بندەستی قاجاریدا سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا. تێکشکاندنی ڕاپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا دەگەڕێتەوە بۆ زۆر هۆکار، لـەوانە:-

١- دەوڵەتی ئێران لەسەر کوتکردن و دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکەدا سەرجەمی هێزەکانی خۆی خستەکار،ئەم هێزانەش کە لە ناوچە

جیاوازەکانی ئێرانەوە هێنرابوون خاوەن مەشقی سوپایی باش و چەك و جبەخانەی زۆربوون، وێڕای کۆکردنەوەی هێزە خێڵەکییە ئازەری و کوردەکانی ئازربایجان لەسەر هێزەکانی شێخ عوبەیدوڵڵا.

٢- دەوڵەتە گەورەکانی وەك: بەریتانیا ـ ڕووسیا ـ فەڕەنسا ـ نەمسا ڕۆڵی کاریگەریان هەبوو لە یارمەتیدان و پشتگیریکردنی دەوڵەتی ئێران دژی ڕاپەڕینەکە جگە لەبوونی ئەفسەرانی فەڕەنسی و نەمسایی لەڕیزی سوپای ئێران دا، (ئابوت)کە کونسوڵی ئینگلیز بوو لە تەبرێز دوای ئەوەی گەمارۆی شاری ئورمیە درا بوو، سەردانی شیخ عوبەیدوڵڵای کرد، لەکاتی گەڕانەوەی بۆ تەبرێز، هەواڵ و نهێنی زۆری ڕاپەڕینەکەی دا بەسەرانی لەشکری ئێران. ڕوسیاش ئامادەیی خۆی نیشاندابوو بۆ هاوکاریکردنی ئێران لەڕووی سوپاییە وە ئەگەر پێویستی کرد.

٣- نەتەنینەوەی ڕاپەڕین بۆ ناوچەکانی سنە ــ کرماشان ــ هەورامان ــ ئیلام و لوڕستان و بەختیاری کە بەشێکی فراوان و گەورەی کوردستان بوون.

٤- هێزە جەنگییەکانی شێخ عوبەیدوڵڵا لەسەر بنچینەی عەشیرەتگەری دامەزرا بوون هەر لەسەر بنچینەی بەرژەوەندییە عەشیرەتەکانیش بەشداریان لە شۆڕشدا دەکرد، بۆیە دەبینین کاتێك بەرژەوەندیان لەگەڵ شۆڕشدا نەدەما دەچوونەوە پاڵ دەوڵەتی ئێران.

دوای تێکشکاندنی لە ئێران و لەگەڵ ئەوەش کە سنوورەکانی عوسمانی- ئێرانی بەلەشکرێکی زۆر تەنرابوو، شێخ و ژمارەیەکی زۆر لایەنگرەکانی توانیان خۆیان بگەیەننەوە گوندی نەهری.

شێخ بەنیاز بوو لەکوردستانی بندەستی عوسمانی دەست بە ڕاپەڕین بکاتەوە بۆ ئەم مەبەستەش نامەیەکی بۆ ژمارەیەك لەسەرۆك خێڵەکانی کورد نارد. لەوکاتەشدا ئێران لەهەوڵی بەردەوام دابوو لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی تا شێخ بگرێت زیندانی بکات. کاتێك هەوڵەکانی ئێران سوودێکی نەبوو، ئەمجارەیان داوای لە دەوڵەتە گەورەکانی وەك بەریتانیاو ڕوسیا کرد گوشار بخەنە سەردەوڵەتی عوسمانی بۆ دەستگیرکردنی شێخ عوبەیدوڵلا.ئەوەبوو دواجار دەوڵەتی عوسمانی شێخیان ڕازی کرد بچێت بۆ ئەستامبوڵ، بەڵام دوای ئەوەی شێخ بۆی ڕوون بووەوە دەست بەسەرە نەك میوان، بەنهێنی ڕای کردو گەرایەوە بۆ نەهری. بەڵام ئەمجارەیان بەدیل گیراو بەدەست بەسەری ڕەوانەی حیجازکرا ساڵی ١٨٨٣ لەشاری (تائیف) کۆچی دوایی کردو لەمەککە بەخاك سپێردرا.

### * دامەزراندنی سوارەی حەمیدییە :-

دوای شکستی ڕاپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری، سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٧٦ – ١٩٠٩ز) هەوڵیدا سیاسەتی خۆنزیك کردنەوە لەسەرانی کورد بگرێتە بەر. ئەوەبوو دەستی کرد بەدامەزراندنی فەوجەکانی سوارەی حەمیدییە کەیەکێکە لەدیارترین ڕووداوەکانی پاش شکستی ڕاپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵلایە.

دامەزراندنی حەمیدییە تەنها بەمەبەستی بەکارهێنانی کورد لەدژی ئەرمەنەکان نەبوو، بەڵکو پەیوەندی بە ئامانجە ستراتیژیەکانی سوڵتان عەبدولحەمیدەوە هەبوو، کە گرنگترینیان بریتی بوو لە جێگیرکردنی دەسەڵاتی ناوەند، هێنانەکایەی هاوسەنگیەکی نوێی سیاسی –

کۆمەڵایەتی، سودوەرگرتن لەو هێزانە دژی ئەرمەنەکان، بەرگریکردن لەپەلاماری ڕوسیاو، ڕێگرتن لەدەسەڵاتی بەریتانیا لەئەنادۆڵی خۆرهەڵات، هەروەها سەرکوتکردنی جووڵانەوە ڕزگاریخوازەکانی گەلانی ناتورک ئامانجێکی تری حەمیدییە بوو. هەموو ئەو ئامانجەش لەگەڵ سیاسەتی بنچینەیی عوسمانی بۆ یەکبوونی ڕیزی موسڵمانان دەگونجا. ئەمانە سەرجەم وایان کرد سوڵتان عەبدولحەمید لەساڵی ١٨٩١ز بڕیاری دامەزراندنی سوارەی حەمیدییە بدات.

سوارەی حەمیدییە لەکوشتاری بە کۆمەڵی گەلی ئەرمەن دا ڕۆڵێکی خراپی بینی، ئەو کوشتارەی لە ساڵی(١٨٩٤ز) ەوە دەستی پێ کردو بەسەدان هەزار ئەرمەنی تێدا کوژرا. ئەوەی پەیوەندی بەکوردەوە هەیە ڕاستە بەشێك لەدەرەبەگ و سەرەك خێڵ و پیاوە ئایینییەکان لەڕیزەکانی فەوجەکانی سوارەی حەمیدییە دا کۆببوونەوەو لەکوشتاری بەکۆمەڵی ئەرمەندا بەشداریان کردبوو، بەڵام دەبێت ئەو ڕاستیەش لەبەر چاو بگیرێ کەئەمانە بەشێك بوون لە دام و دەزگا سوپایی و ئیداریەکانی سوڵتان عەبدولحەمید و بەفەرمانی دەوڵەتیش دەجووڵانەوە ئەمە لە لایەك ، لەلایەکی ترەوە کەم نەبوونی ژمارەی ئەو کوردانەی سەرەڕای هەموو مەترسییەکان گیانی ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی ئەرمەنیان ڕزگار کرد کاتێك لە گوندو ماڵەکانی خۆیاندا بەنهێنی ژیانیان دەپاراستن. بۆیە هەرگیز ڕاست نییە کەکورد وەك نەتەوەیەك بەکوشتاری ئەرمەن تاوانبار بکرێت، بەڵکو ئەوەی تاوانی ئەم کوشتارەی دەکەوێتە ئەستۆ سوڵتان عەبدولحەمید و دام و دەزگاکانی دەوڵەتی عوسمانیە نەك کورد کەلەزۆربەی کاتدا هاو خەبات و هاوچارەنووسی گەلی ئەرمەن بووە.

## ٢- ڕاپەڕینەکەی شێخ عبدولسەلامی بارزان ١٩٠٧ ــ ١٩١٤ز:

لەماوەی نێوان ساڵانی ١٩٠٧ ـ ١٩٠٨ز شێخ عەبدولسەلامی بارزانی چەند یاداشت و بروسکەیەکی سەبارەت بەمافەکانی گەلی کورد بۆ بابیعالی (سوڵتان)لەئەستانبوڵ نارد، گرنگترین داواکارییەکانی شێخ عەبدولسەلام کە تایبەتکرابوو بە ناوچە کوردنشینەکان بریتی بوون لـــــــە:

أ- کردنەوەی دەزگای بەڕێوبەرایەتی کوردی لەناوچە کورد نشینەکان.

ب- زمانی کوردی بکرێت بە زمانی پەروەردەوفێرکردن لەناوچە کوردنشینەکاندا.


شێخ عەبدولسەلام بارزانی

جـ- دانانی بەڕێوبەرو قائمقام و لێپرسراوانی تری کورد زمان.

د- ئەو باجەی وەردەگیرێ بۆ چاکردن و پاراستنی ڕێگاو بان و کردنەوەی قوتابخانە خەرج بکرێت.

هـ- بەپێی بنچینەکانی شەریعەت یاساو دادپەروەری جێبەجێ بکرێت.

و- لەو ناوچانەدا قازی و موفتی سەر بەمەزهەبی شافعی دابنرێت.

ز- وەرگرتنی باج بەپێ ی شەریعەتی ئیسلام.

بابیعالی ئەم داوایانەی بەدەرچوون لەپشتگیریکردنی دەوڵەت دانا، بۆیە دەستیکرد بەجمووجۆڵی سەربازی و شەڕو پێکدادان لەنێوان هەردوو لادا دەستی پێکرد. لەئەنجامدا شێخ عەبدولسەلام ناوچەی بارزانی جێهێشت و

ڕووی کردە خۆرهەڵاتی کوردستان و لەوێ بوو بە میوانی سەید تەهای شەمزینی و لە گوندی (ڕاژان) مایەوە. دواتر لەلایەن سۆفی عەبدوڵڵا ناوێك داوەت دەکرێ و لەپیلانێکدا لەگەڵ پیاوەکانی دەستگیر دەکرێن و دەدرێنەوە دەست دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی عوسمانی دوای دەستگیرکردنی شێخ عەبدولسەلام گوازرایەوە بۆ موسڵ و پاش دادگای کردنێکی ڕواڵەتی لە ١٩١٤/١٢/١٤دا لە سێدارەدرا.

## ٣- ڕاپەڕینەکەی مەلا سەلیمی بەدلیسی:-

شێخ سەلیم یەکێك بوو لە شێخە گەورەکانی ناوچەی(خیزان)ی سەر بەویلایەتی (بەدلیس). بەهۆی خەبات و تێکۆشانی لەپێناو گەلی کورد دا لەلایەن سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمەوە دوور خرایەوە بۆ مەدینە. لەمەدینەداو لەوەرزی حەجکردندا، چاوی بە ژمارەیەکی زۆر لەشێخ و پیاوە ئایینییەکانی کوردی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان کەوت، هەر لەوێدا سوێندیان خوارد کە کار بۆ دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ بکەن.

دوای گەڕانەوەی بۆ کوردستان مەلا سەلیم بیروباوەڕی خۆی گەیاندە ناوچە دوورەکانی قارس و ئەرزرۆم و ئەرزنجان هەروەها لەناوچەکانی وان و بەدلیس و دیاربەکریش. بزووتنەوەکەی مەلا سەلیم تا دەهات لایەنگرو موریدی زۆرتر دەبوو، بەتایبەتی پاش ئەوەی کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی سیاسەتی بەتورك کردنیان گرتەبەر و کەوتنە هەوڵدان بۆ تواندنەوەو سڕینەوەی گەلانی ناتورك.

کاتێك ئیتحادییەکان بەمەیان زانی ساڵی (١٩١٠ز) هێزێکیان ڕەوانەی سەر شێخ سەلیم کردو لەڕێگای نێوان (وان ــ بەدلیس) دەستگیریان کرد.

بەڵام پاش شەڕێکی توند بەیارمەتی شێخ شەهابەدین توانرا ئازاد بکرێت. لەم شەڕەدا کوردەکان چەك و تەقەمەنیەکی زۆریان دەست کەوت و نزیکەی (٣٢٠) سەربازی تورکیش بەدیل گیران، (٥٠) جەنگاوەری کوردیش لەشەڕەکەدا شەهید بوون.

ساڵی ١٩١٣ز تەواو نەببوو، کەتەواوی ویلایەتی بەدلیس کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی شێخ سەلیمەوە، تەنها شاری بەدلیس نەبێت، کەبەدەست تورکەکانەوە مابوو، بەڵام دوای شەڕێکی پێنج سەعاتی شێخ سەلیم و هاوڕێکانی توانیان بچنە نێو شاری بەدلیس و ژمارەیەکی زۆریش سەربازی تورکیان کوشت، بەڵام کاتێك ڕۆژ بووەوە هێزەکانی تورك لەچەندین قۆڵەوە هێرشیانکردە سەر بەدلیس و، شێخ سەلیم لەگەڵ دە کەس لەهاوڕێکانی کە مابوونەوە پەنایان بردە بەر کونسوڵخانەی ڕووس لە بەدلیس و لەوێدا مانەوە. بەڵام کەجەنگی یەکەمی جیهانی دەستی پێکرد تورکەکان پەلاماری کونسولخانەکەیان داو شێخ سەلیم و هاوڕێکانیان دەستگیرکردو لەبەردەم کونسولخانەکەدا لەسێدارەیان دان.

## ب- ڕاپەڕین و شۆڕشەکان لەساڵی ١٩١٨ ـــ ١٩٥٠:

### ١- شۆڕشەکانی شێخ مەحموود:-

داگیرکردنی تەواوی ویلایەتی موسڵ لە لایەن ئینگلیزەکانەوە لەساڵی ١٩١٨ ز دا پێچەوانەی بڕیارەکانی ڕێککەوتننامەی سایکس ـ بیکۆی ساڵی ١٩١٦ز ی نێوان بەریتانیاو فەرەنسا بوو، چونکە بەپێی ئەم ڕێککەوتننامەیە ویلایەتی موسڵ ناوچەیەکی دەسەڵاتی فەرەنسی بوو ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە داگیرکردنی شاری موسڵ لەلایەن بەریتانیاوە بە

بێ شەڕو دوای ئاگربەستی مۆدرۆس  بوو بەهۆی دروستبوونی کێشەیەک لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی کەبە(کێشەی ویلایەتی موسڵ) ناسراوە.

بەریتانیا تەواو پێچەوانەی ویست و ئارەزووی خەڵکی کورد لەساڵی ١٩٢٥ز ویلایەتی  موسڵی بەدەوڵەتی تازە دامەزرێندراوی عێراقیەوە لکاند. ئینگلیزەکان پێش ئەوەی بێنە سلێمانی شێخ مەحموود خۆی نامەی بۆ ناردن و ئامادەیی کوردی بۆ پشتیوانی ئینگلیز دەربڕی بە مەرجێك مافەکانی گەلی کورد لەبەرچاو بگرن.

دوای ئەمە(مێجەر نوئێل) بە نوێنەرایەتی ئینگلیز هاتە سلێمانی و لە ١٧تشرینی دووەمی ١٩١٨ز دا  شێخ مەحموودی وەك حوکمداری کوردستان ڕاگەیاند بەبێ ئەوەی سنوری دەسەڵاتی شێخ مانای حوکمداری بۆ ڕوون بکرێتەوە کە دواتر ئەمانە بوون بەخاڵێکی گرنگ لەناکۆکییەکانی نێوانیاندا.

سەرەتا شێخ مەحمودی حەفید لە ٢١ی نیسانی ١٩١٩دوای ئەوەی ئینگلیزەکان ویستیان حکومەتەکەی بڕوخێنن، ئەویش هەرچی فەرمانبەر و سەربازی ئینگلیزی هەبوو لەناوچەی سلێمانی توانی دەریان بکات، بۆیە ئینگلیزەکانیش هێرشێکی گەورەیان کردە سەر شێخ مەحمود و پایتەختەکەی، ئەوەبوو چەند شەڕێکی گەورە لەنێوانیاندا ڕووی دا، تا لە حوزەیرانیی ١٩١٩ز دا لەشەڕی دەربەندی بازیان، کەتێیدا جەنگاوەرەکانی کورد بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمود ئازایەتیەکی گەورەیان نواند لەبەرامبەر هێزی داگیرکاری ئینگلیزدا.بەڵام ناهاوسەنگی تەرازووی هێزی سوپایی نێوان هەردوو لا کەمی ئازووقەو تەقەمەنی جەنگی وخیانەتی هەندێك لەسەرۆك هۆزەکانی کورد و دواتریش بریندداربوونی شێخ مەحموود

لەپاڵ(بەردەقارەمان)دا، سەرجەم ئەم خاڵانە بوون بەهۆی تێکشکاندنی سوپاکەی شێخ مەحموود و دواتریش بەدیل گرتنی شێخ خۆی، دوای بەدیل گرتنی شێخ مەحموود ئینگلیزەکان بریاری لە سێدارەدانیان دا، بەڵام دواتر بڕیارەکە گۆڕدراو بەدەست بەسەری ڕەوانەی هیندستان کراو تا ساڵی ١٩٢٢ز لەوێ مایەوە.

لەماوەی هێشتنەوەی شێخ مەحموود لەهیندستان بارودۆخی عێراق بە گشتی و کوردستان بەتایبەتی لەهەڵچوون دابوو. لەو ماوەیەداو لە(٢٥) تشرینی یەکەمی ١٩٢٠ز حکومەتی کاتی عێراق دامەزرێندرا. لە ئازاری ساڵی ١٩٢١ز یشدا بەسەرپەرشتی(ونستۆن چەرچڵ)ی وەزیری داگیرگەکانی بەریتانیا لەسەرچارەنووسی عێراق و باشووری کوردستان کۆنگرەی قاهیرە بەسترا.لەم کۆنگرەیەدا جگە لە بڕیاری دانانی(فەیسەڵ کوڕی حسین) بە پادشای عێراق، چارەنووسی(ویلایەتی موسڵ) یش وەك بەشێك لەدەوڵەتی عێراق سەیرنەکرابوو.

ئەو کاتەی شێخ مەحمود لەهندستان دەست بەسەر بوو، سلێمانی تا ساڵی ١٩٢٢ز ڕاستەوخۆ لەژێر دەسەڵاتی ئینگلیز و ئەفسەرەکانیدا بەڕێوە دەچوو لەو ماوەیەدا(١٩١٩ ــ ١٩٢٢)ز لەئەنجامی گوشاری خەڵکی کوردستان بەگشتی و شاری سلێمانی بە تایبەتی، هەڕەشەو مەترسی تورك لەچەند ناوچەیەکی کوردستان، ئینگلیز بۆ ئارام کردنەوەی بارودۆخەکە، ئازادکردنی شێخ مەحموودی بەباشترین چارەسەر دەزانی.

دوای ئەوەی شێخ مەحموود لەنێو پێشوازییەکی گەورەدا لە ٣٠ ئەیلولی ١٩٢٢ز گەیشتەوە سلێمانی، لە ١٠تشرینی یەکەمی هەمان ساڵدا بەفەرمانێکی حوکمداری کابینەی حکومەتەکەی لەسلێمانی ڕاگەیاند و

خۆیشی وەك(مەلیك)ی كوردستان ناساند. ئەندامانی حكومەتەكەی شێخ بریتی بوون لە:

| | |
|---|---|
| ١- سەرۆك وەزیران و سوپا سالار | شێخ قادری حەفید |
| ٢- وەزیری ناوخۆ | شێخ محەمەد غەریب |
| ٣- وەزیری دارایی | كەریمی عەلەكە |
| ٤- وەزیری مەعاریف(پەروەردە) | مستەفا پاشای یامولكی |
| ٥- وەزیری ئەشغال | محەمەد ئاغا عەبدولڕەحمان ئاغا |
| ٦- لێپرسراوی گشتی گومرگ | ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ |
| ٧- لێپرسراوی گشتی ئاسایش | سەید ئەحمەدی بەرزنجی |
| ٨- موفەتیشی گشت | میر لیوا سدیق پاشا قادری |
| ٩- وەزیری بەرگری | سالّح زەكی بەگ ساحێبقران |


شێخ مەحمود بەبەرگی مەلیكیەوە

ئینجا موتەسەڕیف و قائیمقام و بەڕێوبەری ناحیە و پۆستە گرنگەكانی تری دەست نیشان كردو ئاڵای كوردستان لەسەر هەموو دام و دەزگاو بیناكانی حكومەت هەڵكرا، بێتۆمان ئەم كارانە بەدڵی ئینگلیز و تەنانەت حكومەتی عێراقیش نەبوو. شێخ مەحموود نەیدەویست و بەوەش ڕازی نەدەبوو كەتەنها داردەستی ئینگلیز و ملكەچ و گوێڕایەڵی فەرمانەكانی ئەوان بێت، بەڵكو دەیویست سنووری

دەسەڵات و سنووری جوگرافی دیاریکراو بێت و کەس دەست نەخاتە نێو کاروبارییەوە ئەمە لەلایەك لەلایەکی ترەوە ئەو کاتە تورکەکان هێزێکیان بەسەرۆکایەتی عەلی شەفیق(ئۆزدەمیر پاشا) ڕەوانەی ڕەواندز کردبوو، ئەمانە هەوڵیاندە دا لەشێخ مەحموود نزیك ببنەوە، شێخ مەحموودیش ئەو کاتە چ بەهۆی نائومێد بوونی لەئینگلیزو چ لەژێر کارتێکردنی تورکخوازەکان وردە وردە لەتورکەکان نزیکتر دەکەوتەوە. سەرجەم ئەمانە ڕێگا خۆشکەر بوون بۆ دووبارە گرژبوونەوەی پەیوەندییەکانی نێوان شێخ مەحموود و ئینگلیز و دواتریش دەست پێ کردنەوەی شەڕی نێوانیان. ئینگلیزەکان بۆ لەناوبردنی حکومەتەکەی شێخ مەحموود لە ٢٢ شوباتی ١٩٢٣ز بە فڕۆکە بەخەستی بۆردومانی شاری (سلێمانی)یان کرد خەڵکێکی



شێخ مەحمودی نەمر

مەدەنی زۆریان کوشت. شێخ مەحموودیش لەسەرەتای ئازاری هەمانساڵدا ڕوویکردە ئەشکەوتی جاسەنە لەسورداش.

بەڵام دوای ئەوەی ئینگلیز لەحوزەیرانی ١٩٢٣ز (سلێمانی) یان چۆڵکرد، لە تەموزی هەمان ساڵدا جارێکی تر شێخ مەحموود گەڕایەوە شارەکە.

شەڕو ناکۆکی نێوان شێخ مەحموود و ئینگلیز کۆتایی پێنەهات، دوای ئەوەی بەپێی بڕیاری کۆمەڵەی گەلانیش ویلایەتی موسڵ

بەعێراقەوە لکێنرا ئەم بڕیاری لکاندنە پێچەوانەی خواستی ڕووناکبیران و زۆرینەی خەڵکی ویلایەتەکەو جووڵانەوەی ڕزگاری گەلی کورد بوو. تائەو کاتەی بەپێ ی ڕێکەوتنی ئینگلیزو شێخ، شێخ مەحموود لەگوندی پیران و لەسەر سنوری ئێران مایەوە بەمەرجێك دەست لەکاروباری سیاسیەوە وەرنەداتەوە.

## ٢ - شۆڕشی سمکۆی شکاك:

ئیسماعیل ئاغا (سمکۆی شکاك) لەدوای مردنی باوکی بوو بە سەرۆك عەشیرەتی شکاك. یەکێکە لەناسراوترین ئەو سەرکردە کوردانەی کە پێش جەنگی یەکەمی جیهان دژی دەسەڵاتی قاجاری لەئێران جەنگاوەو، لەساڵانی دوای جەنگیش لەخەباتێکی بێوچان دا بووە بۆ بەدیهێنانی مافەکانی کورد لەخۆرهەڵاتی کورد دەسەڵاتی سمکۆ لەناوچەکانی خۆرئاوای دەریاچەی ئورمیە(مەڵبەندی سەرەکی عەشیرەتی شکاك) فراوان بوو، هەروەها شێخ عەبدولسەلام بارزانیش کە لەدەست عوسمانییەکان ڕایکردبوو، ماوەیەك لەنێو ئەم عەشیرەتە مایەوەو دواتریش



سمکۆی شکاك

لەگەڵ سمکۆدا چوون بۆ دیدەنی جێگری کۆنسوڵی ڕوسیا لەقەفقاس تا داوای پشتیوانی و کۆمەکی بۆ بزووتنەوەی کوردی لێبکەن. جگەلەمانە سمکۆ کچێکی(شێخ محەمەد سدیق)ی هێنابوو،شێخ محەمەد سدیق کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری و باوکی(سەید تەها)بوو، کەیەکێك لەسیاسەتمەدارو شۆڕشگێرەکانی ئەو سەردەمە بوو،ئەم خزمایەتییە هاوکاری نێوان بنەماڵەی شەمزینان بەتایبەت سەید تەها و سمکۆی پتەوتردەکرد. لەساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانی دا، ناوچەی دەسەڵاتی سمکۆ کەوتە بەر شاڵاوی عوسمانییەکان، بەڵام کاتێك ڕووسەکان عوسمانییەکانیان تێکشکان ژمارەیەکی زۆری سەربازە کوردەکانی ناو سوپای عوسمانی بەخۆیان و چەکەکانیانەوە پەیوەندییان بەسمکۆوە کردو هاتنە ڕیزی لەشکرەکەیەوە بەهەڵگیرسانی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی(١٩١٧ز) و پاشەکشەی هێزەکانی ڕوس لەناوچەکە، بەدەست بەسەرداگرتنی بەسەر ناوچەی تردا دەسەڵاتی سمکۆ فراوانتر بوو. دوای کۆتایی هاتنی جەنگیش جێنشینی والی ئازەربایجان لەتەبرێز پیلانێکی بۆ کوشتنی سمکۆ دارشت، هەرچەندە سمکۆ لەپیلانەکە ڕزگاری بوو، بەڵام برایەکی و چەند کەسێکی تر لەناوچوون. ئەم کارە زیاتر سمکۆی ڕق ئەستوورکرد لەبەرامبەر عەجەمەکان،چونکە ساڵێك پێش شۆڕش دەستووری ئێران(نیزام سەلتەنە)ی والی ئازەربایجان لە تەبرێز بەناوی داوەتەوە(جەعفەر ئاغا)ی برای گەورەی سمکۆ و دوو هاوڕێی کوشت دوای ئەوەی سمکۆ بۆی دەرکەوت قاجارییەکان دەست لەپیلان گێڕان و دوژمانیەتی هەڵناگرن، کەوتە هاندانی کورد بۆ ڕاپەڕین و شۆڕش لەپێناوی ئازادی و سەربەخۆیی.

سمکۆ شارەکانی(خانە ، شنۆ ، نەغەدە ، بۆکان ، مەهاباد ، میاندواو، سەردەشت)ی ڕزگارکرد، هەروەها جگە لەڕزگارکردنی شارەکانی(خوی، سەلماس، ماکۆ) گەمارۆی شاری(ئورمیە)شی دا، دوای گەمارۆیەکی(٢٥) ڕۆژی هێزەکانی کورد بەشێکی شارەکەیان ئازادکرد، بەلآم ئینگلیزەکان و ئەمە ریکاییەکان بەهانای حاکمی شارەکەوە هاتن و نەیانهێشت تەواوی شارەکە بکەوێتە دەست سمکۆ.

لەم ماوەیەدا سمکۆ هەولّیدا پشتگیری دەولّەتە گەورەکان بۆ خۆی مسۆگەر بکات، سەید تەهای نارد بۆ بەغدا بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی بەریتانیا، سمکۆ خۆیشی نامەیەکی بۆ(ویلسن)حاکمی سیاسی بەریتانیای لەعێراق نارد، بەلآم ئەم هەولآنە سەریان نەگرت. بۆیە ئەمجارە پەیوەندی بەکەمالیەکانەوە کرد کەتازە خەریکی چالاکییەکانیان بوون لە کوردستان.لەم کاتانەدا ڕەزا شای پەهلەوی هاتە سەر حوکم و کۆتایی بەدەسەلآتی بنەماڵەی قاجارییەکان هێنا، ڕەزا شا بەپشتیوانی ولآتانی گەورەی دنیا توانی لە ماوەیەکی کورتدا دەسەلآت بەسەرتاسەری ئێراندا بەسەپێنێتەوە، جگە لە چەند ناوچەیەکی کوردستان کە یەکێك لەوانە ناوچەی دەسەلآتی سمکۆ بوو. ڕەزا شا هێزێکی گەورەی لەتەبرێزەوە ناردە سەر سمکۆ، بەلآم بەهاوکاری هۆزەکانی کورد سمکۆ توانی زەبرێکی کوشندەیان لێبدات. بەمەش ناوچەی دەسەلآتی سمکۆ بۆ دەوروبەری(سنە) فراوانبوو سمکۆ توانی بۆ ماوەی چوارساڵ لەبەرامبەر هێرش و پەلامارەکانی ڕەزا شادا خۆی ڕابگرێت و لەزۆربەی شەڕەکانیشدا سەرکەوتوو بوو بۆ ئازاد کردنی شاری(سنە) سمکۆ پەیوەندی بە(مەحموود خانی کانی سانان) و (مەحموود خانی دزڵی) و (سەردار

ڕەشید) ەوە کرد، هەموو لایەك بۆ ئەم مەبەستە هاو هەڵوێست بوون، بەڵام پەلاماری لە ناکاوی هێزەکانی ئێران بۆ سەر ناوچەکانی عەشیرەتی شکاك، ڕێگای ڕزگارکردنی سنەو ناوچەکانی باشووری لەسمکۆ گرت، ئەمەو وێڕای ئەوەی عەشیرەتەکانی(لوڕستان) یش ئامەدەییان نیشاندابوو بۆ هاتنە ریزی بزووتنەوەکەی سمکۆ و،کوردانی بندەستی عێراق و تورکیاش پەیوەندی دۆستایەتییان لەگەڵ سمکۆ دامەزراند بوو. لە هاوینی ١٩٢٢ز شەڕی گەورەی شەرکەیازی لەنێوان هێزەکانی سمکۆو سوپای ئێران دا هەڵگیرسا، هەرچەندە کوردەکان بۆ ماوەیەك خۆیان ڕاگرت، بەڵام لەکۆتاییدا هێزەکانی سمکۆ شکستیان خواردوو ناوچەکەیان دەستی بەسەرداگیرا.سمکۆ پەنای بردە بەر تورکیا، لەئەنجامی پەلاماری تورکەکانیش ژنەکەی کوژراو کوڕێکیشی بەدیل گیرا. بۆیە ئەمجارە سمکۆ ڕوویکردە باشووری کوردستان ساڵی ١٩٢٣ز لەلایەن شێخ مەحموودەوە پێشوازییەکی شاهانەی لێکرا.

سمکۆ لەسەر داوای ئینگلیزەکان بڕیاریدا بگەڕێتەوە خۆرهەڵاتی کوردستان بەو پێ یەی ئینگلیز داوای لەدەسەڵاتدارانی ئێران کردووە لەسمکۆ خۆشبن پاش ئەوەی سمکۆ لەهاوکاری ئینگلیزو تورکە کەمالییەکان بێ ئومێد بوو،ئەمریکاش نەیدەویست تەرازووی هێزەکان لەناوچەکە تێك بچێت، بۆیە ئەم جارەیان سمکۆ ویستی هاوکاری یەکێتی سۆڤیەت مسۆگەر بکات، بەڵام ئەمەشی بۆ جێبەجێ نەبوو، چونکە سۆڤیەت ڕێککەوتننامەی دۆستایەتی و هاوکاری لەگەڵ هەردوو ڕژێمی ڕەزاشای پەهلەوی و مستەفا کەمال ئەتاتورك مۆرکرد بوو. بۆیە سەرەنجام لەسەر داواکەی ئینگلیز دەگەڕێتەوە بۆ خۆرهەڵاتی کوردستان. بەڵام کاتێك

تێدەگات ڕەزاشا نیازی پاك نییە لەساڵی ١٩٢٥ز و لەژێر کاریگەری شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران کە لە باکووری کوردستان دژی کەمالییەکان هەڵگیرسا. دەستدەکاتەوە بەشۆڕش، بەڵام ئەمجارەشیان ڕووبەڕووی شکست دەبێتەوە و پەراگەندەی سەر سنورەکانی تورکیا ـــ عێراق ـــ ئێران ـــ دەبێت تا ساڵی ١٩٣٠ز، ئەو کاتەی پەیامێکی لێبووردنی لەتەبرێزەوە پێدەگات، وێڕای بڕیاری دانانی بەحاکمی ناوچەی شنۆ. سمکۆ کەوتە هەڵەیەکی سیاسی گەورەوەکە بڕوای بەم بەڵێنی لێبوردنە کرد، چونکە هەر ئەمساڵە بەهەمان شێوەی جەعفەر ئاغای برای بە پیلانێکی داڕێژراو کوژرا. بەکۆتایی ژیانیشی کۆتایی بە جووڵانەوە سیاسیەکانی هات.

### ٣- شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران ١٩٢٥ز :-

ساڵی ١٩٢٥ لەماوەی خەریکبوونی بەریتانیا و فەرەنسا و کۆمەڵەی گەلان بەکێشەی ویلایەتی موسڵ و دیاریکردنی سنوری کۆماری تورکیای نویێ لەگەڵ ڕژێمی پاشایەتی عێراق دا،شۆڕشێکی گەورەی نەتەوەیی لەباکووری کوردستان لەهەرێمی دیاربەکر و دەورووپشتی دا بەڕێبەرایەتی شێخ سەعیدی پیران بۆ بەدی هێنانی مافەکانی گەلی کورد لەسەربەخۆیی و ئازادی، هەڵگیرسا، گرنگترین هۆکارەکانی شۆڕش ئەمانە بوون:-

١- شۆڕشەکە مۆرکی نەتەوەییانەی هەبوو، وەك پەرچەکردارێك لەبەرامبەر سیاسەتی پڕ لە ستەم و زۆرداری کەمالییەکان دەرهەق بەگەلی کورد، بەتایبەتی دوای پەیمانی لۆزان(١٩٢٣)ز، کە نکوڵیان لەهەموو ئەو بەڵێنانە کرد، کە بەکوردیان دابوو، لەوانەش دابینکردنی مافەکانی گەلی کورد بوو لەتورکیا.

٢- یاسای نوێی دەوڵەتی تورکیای کەمالی، تەنها دانی بەبوونی نەتەوەیی تورك دادەنا لەتورکیاو سەرجەم نەتەوەکانی تریشی بەتورك دانابوو تەنانەت ناویان لەکوردنا بوو تورکی چیایی. بەمجۆرە زمانی تورکی کرا بەزمانی ڕەسمی دەوڵەت و زمانی کوردی قەدەغەکرا، هەموو ئەو یانەو ڕێکخراوو کۆمەڵە و گۆڤارە کوردیانەش کەهەبوون قەدەغەکران.

٣- سیاسەتی ڕاگواستن و دەربەدەرکردنی کورد لەسەر زەوی باب و باپیرانی بۆ خۆرئاوای ئەنادۆڵ و نیشتەجێکردنی تورك لە شوێنیاندا، هەروەها گرتن و دوورخستنەوەو کوشتنی سەرکردە و تێکۆشەرانی کورد.

٤- ئەو گوشارە ئابووریەی کەمالییەکان لەکوردستان دا پیادەیان دەکرد، دەستیان بەسەر بەپیترین زەویە کشتوکاڵیەکانی کورد داگرت و دەیاندابە تورك، بەمجۆرە تا دەهات جوتیارانی کورد بێ زەوی و بێکاردەمانەوە، بۆیە گرانییەکی گەورە لە کوردستان پەیدابوو، بەتایبەتیش دوای ڕەوانەکردنی ئەو ژمارە زۆرەی سەربازە تورکەکان بۆ کوردستان بۆ ئەوەی پەیوەندی بازرگانی و ئابووری ئەم پارچەیەی کوردستان لەگەڵ بەشەکانی تردا بپچڕێنن، وێڕای ئەوانەش باج و سەرانەیەکی زۆریان بەسەر خەڵکی کوردستان دا سەپاند بوو.

شێخ سەعیدی پیران پێش لە سێدارەدرانی

سەرکردە نیشتمانیەکانی کورد لە ساڵی ١٩٢٤ کۆبوونەوەیەکیان ئەنجامدا، لەو کۆبوونەوەیەدا بڕیاریاندا لە ڕۆژی جەژنی نەورۆزدا (٢١ئازاری ١٩٢٥) شۆڕش دەست پێبکەن، بەڵام کاتێك هێزێکی کەمالییەکان لەمانگی شوبات دا بەمەبەستی دەست بەسەرداگرتنی کوردستان گەیشتە گوندی پیران (بارەگای شێخ سەعید و شۆڕشگێران)، لەئەنجامدا شەڕ لەنێوان هەردوولادا دەستی پێکرد و، کوردەکان توانیان هێزەکەی تورك تێکبشکێنن. بەمجۆرە شۆڕش پێش وادەی دیاریکراوی خۆی ڕاگەیەندرا و لەماوەی دووهەفتەدا چەندین شاری گەورەی باکووری کوردستان وەك (خەرپووت، دەرسیم، موش، ئورفە، مەلاتییە، بینگۆل ، مەلاز گرد، پالو) ئازادکران،دواتر شۆڕشگێران ڕوویانکردە ڕزگارکردنی شاری دیاربەکرو دوای شەڕێکی خوێناوی و کوژرانی ژمارەیەك لەهەردوولا، شارەکە ئازاد کرا. ئازاد کردنی دیاربەکر وای لەئەنجوومەنی گەورەی نیشتمانی تورکیا کرد، کۆبوونەوەیەك سازبدەن بۆ چۆنیەتی لەناوبردنی شۆڕش،بۆ ئەم مەبەستەش ئەم بڕیارانەدا:-

١- حوکمی عورفی لەزۆربەی ویلایەتەکانی خۆرهەڵاتی تورکیا(واتە باکووری کوردستان)ڕاگەیاندرا.

٢- ڕەوانەکردنی (٢٥) هەزار سەرباز لەڕێگای هێڵی شەمەندەفەری سوریا لەباکووری حەڵەب، ئەویش دوای ئەوەی فەرەنسییەکان ڕێگەیان پێدان و هاوکاریان کردن و سنوری سوریایان لەبەردەم واڵاکردن.

٣- ناردنی (٩) تیپی پیادەو(٩) لیوای تۆپخانەو (٣) تیپی سوارە، پێشتریش لەتشرینی یەکەمی ١٩٢٤ (٦) تیپی پیادە ڕەوانەی (قارس و سەعرت و ماردین و میدیات)کرابوو.

٤- بانگهێشت کردنی هەموو ئەولاوە تورکانەی تەمەنیان لەنێوان (٢٠ ـ ٢٨)ساڵیدا بوو بۆ خزمەتی سەربازی.

٥- دامەزراندنی دادگاکانی سەربەخۆیی لەدیار بەکرو ئەنقەرەو شوێنی تریشیان کە هەموو دەسەڵاتێکیان پێدرابوو لەدەرکردن و جێبەجێکردنی هەربڕیارو حوکمێك سەبارەت بە خنکاندن و لەسێدارەدانی شۆڕشگێڕان.

٦- عیسمەت پاشا ناسراوبە (عیسمەت ئینۆنۆ)، کە دۆستێکی نزیك مستەفا کەمال بوو، لەجێگای فەتحی بەگ کرا بەسەرۆك وەزیران، ئەویش هێزیکی تری مەشق پێکراوی چەکی تازەی خۆرئاوایی نارده کوردستان، ئەم هێزە لە(٨) تیپ بێکهاتبوو، ژمارەی سەربازەکانی لە (٢٥) هەزار سەرباز زیاتر بوو، لەگەڵ هەشت فرۆکەی جەنگی.دوای چەندین شەڕو ڕووبەڕووبونەوەی شۆڕشگێڕانی کورد بەرامبەر لەشکری گەورەی تورك، سەرەنجام بنکەی شۆڕشگێڕان لە(دارەخان) دەستی بەسەرداگیرا و، شێخ سەعید و دکتۆر فوئادو هاوڕێکانیان بە دیل گیران و، هەرهەمان ساڵ (١٩٢٥) دوای دادگاییەکی ڕووکەش لەشاری دیاربەکر لەسێدارەدران.

وێڕای ئەو هەموو ئامادەباشی و هەنگاوانەی ئەنجوومەنی نیشتمانی تورکیا گرتییە بەر بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشەکەو، هەروەها هاوکاری و پشتگیری دەوڵەتانی فەرەنساو بەریتانیاو سۆڤیەت بۆ کەمالییەکان، کەچی چەند هۆکارێکی تریش کەپەیوەندی بەکورد خۆیەوە هەبوو ڕۆڵی گرنگیان لەسەر نەکەوتنی شۆڕشەکەدا بینی،لەوانەش:

١- شۆڕش بەر لەوادەی دیاریکراوی خۆی بەرپابوو، بەمەش بەرنامەو پلانی شۆڕشەکە تێکچوو.

٢- زۆربەی سەرکردە سەربازییە کوردەکان، بەر لە هەڵگیرسانی شۆڕش لەلایەن کەمالییەکانەوە دەستگیر کران، بەمەش شۆڕش لەزۆربەی کادیرو شارەزایانی بێبەشکرا.

٣- زۆربەی ئەوانەی سەرکردایەتی شۆڕشەکەیان دەکرد، شارەزاییەکی ئەوتۆیان لەهونەری شەڕو نهێنییەکانی شۆڕش و، نەخشەدانانی ڕزگارکردنی شارەگەورەکان و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ئەو شارانەدا نەبوو.

٤- خیانەتی چەند سەرۆک عەشیرەتێك و پەیوەندی کردنیان بەکەمالیەکانەوە، دانیشتوانی چەند شارێکیش نەهاتنە پاڵ شۆڕش و دوورە پەرێز وەستان، ئەمەش بەهۆی پڕوپاگەندەی کەمالییەکان کە بۆ شۆڕش و سەرکردەکانیان دەکرد، ناووناتۆرەی خراپیان دەدانەپاڵ و بەکۆنەپەرست و بەکرێگیراویان لە قەڵەم دەدان، هەروەها وایان بڵاوکردبۆوە کەشۆڕشەکە بەفیتی دوژمنانی دەرەوە هەڵگیرساوە. بەڵام ڕاستییەکەی ئەمانە جگە لە پڕوپاگەندە تورکە کەمالییەکان هیچی ترنەبوون، چونکەلەکاتی دادگاییکردنی سەرکردەکانی شۆڕش هەموو ئەم پڕوپاگەندانەی کەمالییەکان بۆ شۆڕش و سەرکردەکانی شۆڕشیان هەڵبەستبوو، بەدرۆ خرانەوە.

## ٤ - شۆڕشی ئاگری داغ(ئارارات)١٩٢٧ - ١٩٣١ز:-

پاش سەرکوتکردنی شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران، کەمالییەکان توندتر لەجاران دەستیان دایە سیاسەتی ڕاگواستنی کورد و بەزۆرکردن بە تورک و تواندنەوەی کورد. بۆیە ڕۆشنبیران و نیشتمانپەروەرانی کورد بە یەکخستنی دەنگیان و وەستانەوە لەبەرامبەر ئەو سیاسەتە پڕ لەستەمە نەتەوەییەی کەمالییەکان، ساڵی ١٩٢٧لەناوچەی(بیحەمدون)لە لوبنان کۆنگرەیەکیان بەست و تیایدا بڕیاری دامەزراندنی کۆمەڵەی(خۆیبون)درا.



سەرکردەی شۆڕشی ئاگری، جەنەڕاڵ ئیحسان نووری پاشا و خانمی خێزانی

خۆیبون بڕیاریدا چیای ئاگری داغ لەباکووری کوردستان بکرێتە مەڵبەندی هەڵگیرساندنی شۆڕش دژی کەمالییەکان و سەرکردایەتی شۆڕشەکەش بەجەنەراڵ ئیحسان نوری پاشا سپێردرا، کە ئەفسەرێکی کورد بوو لەسوپای عوسمانی خەڵکی شاری بەدلیس بوو.

لە ٢٨ تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٧دا سەربەخۆیی کوردستان لەچیای (ئاگری داغ)ەوە ڕاگەیەندراو ئاڵای کوردستان هەڵکرا، دوای ئەوەی پارتیزانەکانی کورد بە سەرۆکایەتی ئیحسان نوری پاشا توانیان ناوچەکە ئازاد بکەن، لەسەربازی تورک. دواتر هێزەکانی تورک لەهەموولایەکەوە

پەلاماری ئەو ناوچە سەختەی کوردستانیدا، بەڵام کوردەکان زەبرێکی کوشندەیان لێوە شاندن و زیانی سەدەها کوژراو و بریندارو دیلیان لێدان، وێڕای خستنەخوارەوەی (١٢) فرۆکەی جەنگی، دەست بەسەرداگرتنی(٦٠) ڕەشاش و(٦٠)تۆپ و(٥٠) مەترە لۆزو (١٥٠) چادرو (٣) هەزار تفەنگ و (٥٠) بار ئازووقە، زیاتر لە (٤) هەزار سەربازیش لەڕیزەکانی سوپای تورکدا ڕایانکرد. بەمجۆرە ناوچەیەکی فراوان لە (وان و ئاگری و ئیغیدیرو بایەزیدو قارس و موش) کەوتە دەست شۆڕشگێڕان.

کاتێك حکومەتی تورکیا سەیری کرد بینی تەنها دوو فەیلەقی (٧،٨) و پاشماوەی چەند فەیلەقێکی تر لەناوچەکە مابوونەوە،بۆیە بڕیاریدا.

لەدایکبووانی ساڵانی (١٩٠١ ــ ١٩٠٦) بۆ خزمەتی سەربازی بانگهێشت بکات، هەروەها تورکەکان ڕایانگەیاند کەئەم هێزانەیان بۆ لێدانی دزو چەتە و ڕێگرەکانەکە لەدیوی سنوری ئێرانەوە دزەیان کردووە و هاتونەتە نێو سنوری تورکیا.

دوای ئەوەی هێرشێکی بەربڵاوی تورك دەستی پێکرد، هەرچی گوند و کێڵگەی کشتوکاڵی هاتە سەر ڕێیان ئاگریان تێبەرداو سووتاندیان ، بەڵام بەمەش نەیانتوانی بەسەر شۆڕشگێڕاندا زاڵ بن. بۆیە دواجار کەمالییەکان پەنایان بردە بەر حکومەتی ڕەزا شای پەهلەوی لەئێران و ئەویش ڕەزامەندی خۆی لەسەر بەکارهێنانی خاکی ئێران لەلایەن تورکەکانەوە پیشاندا بۆ لێدان و گەمارۆدانی شۆڕشگێڕان، بەمجۆرە دوای شەڕێکی نابەرامبەر دەستەویەخە، هێزەکانی تورك لەهەموو لایەکەوە گەمارۆی بنکەی شۆڕشگێڕانیان لەچیای (ئاگری داغ)دا داو داگیریان کردەوە و خەڵکێکی زۆریشیان کوشت.

## ٥ - ڕاپەرینی بەردەرکی سەرا لە سلێمانی :

لە ٦ ئەیلولی ١٩٣٠ لەبەردەرکی سەرای حکومەت لە سلێمانی ڕاپەرینێکی جەماوەری هەڵگیرسا کە تیایدا بۆ یەکەمجار بوو خوێندەواران و ڕۆشنبیران ( مامۆستایان ، فەرمانبەران ، قوتابیان ) شانبەشانی پیاوماقولان و کاسبکاران و بازرگان و جووتیاران و کرێکاران جڵەوی سەرکردایەتی ڕاپەرینەکە بگرنە دەست و بەشداری تێدا بکەن . گرنگترین هۆکارەکانی بریتی بوون لە :

١ . پەیمانی عێراق — بەریتانی ساڵی ١٩٣٠ هیچ بەندێکی لە بارەی کوردو مافەکانی گەلی کورد لە باشووری کوردستان تێدا نەبوو .

٢. ئەو کاتەی سیاسەتمەداران ڕۆشنبیرانی عەرەب لە عێراق ڕێگایان پێدرابوو پارت و ڕێکخراو و کۆمەڵەی سیاسی دابمەزرێنن، بەڵام کورد لەو مافە بێبەش کرابوو.

٣. نائومێدبوونی کورد لەوەی کە مافەکانیان لە چوارچێوەی عێراق دا ،یان لەلایەن کۆمەڵەی گەلانەوە دابین بکرێت .

٤. ئارەزووی کورد بۆ سەربەخۆی و بەڕێوەبردنی کوردستان لەلایەن کورد خۆیەوە، بۆ نموونە لەو گەشتەی کە وەفدێکی حکومەتی عێراقی بۆ شارەکانی ( کەرکوک — هەولێر — سلێمانی ) کردی و لەگەڵ پیاوماقولان و نوێنەرانی شارەکان کۆبوونەوە بۆیان دەرکەوت کە خەڵکی کوردستان دەیانەوێ سەربەخۆ بن و لە عێراق جیاببنەوە.

٥- لادانی تۆفیق وەهبی لە پۆستی موتەسەریف (پارێزگار)ی سلێمانی کەنیشتمان پەروەردێکی ناودارو کورد پەروەرێکی تێکۆشەر بوو.

ڕۆژی ٦ ئەیلول کە بڕیار بوو هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی نوێنەران ئەنجام بدرێت، خۆپیشاندەران لەبەردەم دەرکی سەرا کۆبوونەوە ( فایەق بێکەس) ی شاعیر و نیشتمان پەروەر لە ریزی پێشەوەی ئەو کەسانە بوو کە قوتابیانی کۆکردبۆوە و دواتریش چین و توێژە کۆمەلایەتیەکانی تریش هاتنە ریزی خۆپیشاندەران و دەرگای دوکان و بازارەکان داخران و ژمارەی خۆپیشاندەران گەیشتە ( ٢ تا ٣ ) هەزار کەس . حکومەت بۆ سەرکوتکردنی راپەرینەکە هێزێکی رەوانەی شوێنی رووداوەکە کرد، ئەم هێزە کەوتە گوللەبارنکردنی خەڵکەکە و ژمارەیەکیان لێکوشتن و ژمارەیەکیشیان بریندار کرد.

ئەمرۆژە هەستی زۆر لە شاعیرانی کوردی ئەو سەردەمە جوڵاند بە تایبەتی ( پیرەمێرد – حەمدی – بێکەس – گۆران – ئەخۆل ) کە چەندین هۆنراوەیان بۆ هۆنیوەتەوە و بە ( رۆژە رەشەکە) ناویان بردووە.

**ئەم راپەرینە چەند نیشانەیەکی تایبەت بەخۆی هەبوو کە جیای دەکاتەوە لە شۆرش و راپەرینەکانی پێش خۆی لەوانە:**

١. لە جیاتی شێخ و سەرۆك عەشیرەت و دەرەبەگە گەورەکان ، ئەمجاریان رۆشنبیران ( مامۆستایان، فەرمانبەران، قوتابیان و پیاوماقولان و کاسبکاران و بازرگانەکان ) سەرکردایەتی راپەرینەکەیان دەکرد .

٢. بەر لە شەڕ و بەیەکدادانی سەربازی، کاری سیاسی ئاشتیانە و شێوازی دبلۆماسیانە تاقیکرایەوە، وەك( خۆپیشاندان، مانگرتن، نووسین و یاداشت و داواکردنی گفتوگۆ ) .

٣. له نێو ئەو یاداشتانەی بۆ کۆمەڵەی گەلان بەرزکرانەوە، ژنانی کورد ڕۆلێکی بەرچاویان بینی بۆ داواکردنی مافەکانی کورد . یاداشتەکەی حەپسەخانی نەقیب نموونەی ئەو ڕاستیەیە .

٤. له جیاتی ناوچه شاخاوییه سەختەکان، ئمجاره ناوەندی شارەکان (قوتابخانه و بازاڕ و دامودەزگا حکومیەکان ) کرانه مەڵبەندی چالاکی شۆڕشگێرانه و ڕاپەڕین،تا ئەو کاتەی شێخ مەحمود له گوندی پیران لەسەر سنوری عێراق – ئێران نیشتەجێ بوو ،دوای ڕاپەڕینەکەی بەردەرکی سەرا، ژمارەیەك له کەس و کاری قوربانیانی ڕاپەڕینەکە چوونه لای شێخ و داوایان لێکرد تۆڵیان بۆ بستێنێتەوە، هەروەها ژمارەیەکیش له خەڵك له نێویاندا ئەفسەران و ڕووناکبیرانیش هەبوون پشتگیری و ئامادەیی خۆیان نیشاندا بۆ سەر لەنوێ دەست پێکردنەوەی شۆڕش .

شێخ مەحمود یەکسەر دەستی نەدایەوە چەك ، سەرەتا چەند بروسکەو یاداشتێکی ئاراستەی کاربەدەستانی حکومەتی عێراقی و مەندوبی سامی بەریتانی له بەغدا و کۆمەڵەی گەلان کرد . لەو یاداشتانەدا شێخ کوشتارەکەی بەردەرکی سەرا و دەستگیرکردنی رۆشنبیران و پیاوماقوڵانی کورد و ڕەفتاری خراپی سەرانی حکومەتی عێراقی تێدا رون کردبۆوە.

هەروەها داوایکرد بوو کرد پێویستە حکومەت سەرجەم دەزگا مەدەنی و سیاسییه عەرەبیەکانی له کوردستان هەر له زاخۆوە تا خانەقین بکێشێتەوە و دامودوزگای کوردی لەو ناوچانەدا دابمەزرێندرێن جا له ژێر سەرپەرشتی هەر دەوڵەتێکی گەورەی تر که کۆمەڵەی گەلان دەست نیشانی بکات.

که شێخ مەحمود وەڵامی نەدرایەوە دەستی بەسەر بەشێکی زۆری ناوچەکانی سلێمانیدا گرت، ئینجا بۆ ئازادکردنی کەرکوك بەرەو گەرمیان پێشڕەویان کرد . سەرئەنجام لە ساڵی ١٩٣١ ز لە ئاوباریك شەڕ لە نێوان هێزەکانی شێخ و لە شکری عێراقی روویدا . لەم شەڕەدا هێزی ئاسمانی بەریتانی و هێزەکانی پیادە و سوارەی حکومەت و هێزەکانی (لیڤی) بەشداریانکرد. دوای ئەوەی شێخ مەحمود شکستی خوارد جارێکیتر روویکردەوە سەر سنوری ئێران ، بەڵام ئەمجارەیان حکومەتی ڕەزا شای پەهلەوی بەپێی ئەوەی کە لە ساڵی ١٩٢٩ ز لەگەڵ حکومەتی پاشایەتی عێراق رێککەوتبوو لەسەر لێدانی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد ، بۆیە شێخ بەناچاری لە ١٣ مایسی ١٩٣١ ز دا خۆیدا بەدەستەوە و بەدەست بەسەری نێردرا بۆ (سەماوە) لە باشووری عێراق. بەمەش جوڵانەوە سیاسییەکانی شێخ مەحمود کۆتاییان پێهات.

### ٦ - شۆڕشی دەرسیم ١٩٣٧ز :-

لەڕابردوودا زۆربەی کات هەرێمی دەرسیم سەربەخۆیی خۆی پاراستووە، تەنانەت لەسەردەمی عوسمانییەکاندا ماوەیەك لەلایەن دەوڵەتەوە بەویلایەتی (کوردستان) ناودەبرا. دوای جەنگی یەکەمی جیهانیش خەڵکی هەرێمەکە بۆ بە دەستهێنانی سەربەخۆییان ڕاپەڕینێکیان دژی کەمالییەکان بەناوی ڕاپەڕینی (کۆچگیری) یەوە بەرپاکرد، بەڵام ڕاپەڕینەکە درندانە سەرکوتکراو ژمارەیەکی زۆریش ژن و منداڵ و خەڵکی ناوچەکە کوژران و، گوندێکی زۆر سوتێندران و خەڵکێکی زۆریش ڕاگوێزران دەربەدەر بوون. ئەم سیاسەتە پڕ لە زەبرو زەنگەی کەمالییەکان دژی

کورد بەکاریان دەهێنا لەبیستەکان و سییەکانی سەدەی بیستەم، وەك پێشتر باسکرابوو بەهۆی هەڵگیرسانی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران وشۆڕشی ئاگری داغ و دواتریش ڕاپەڕینی دەرسیم بەڕێبەرایەتی سەید ڕەزای دەرسیم.

لەگەڵ سەرەتای هاوینی ١٩٣٦ بارودۆخی هەرێمی دەرسیم تێکچوو. بەهۆی ئەو هەموو هێزە سەربازیە و دام ودەزگا سەرکوتکەرانەی کە تورکیا لەناوچەکە دایمەزراندو دواتریش ئەو گەمارۆ سەختەی کەسەرکردەی هێزەکانی تورکیا لە ناوچەکە(ئالب دۆغان)سەپاندبووی بەسەر دانیشتوانی ئەو هەرێمە، ئەم هۆیانە و زۆری تریش کە پەیوەندی بەسیاسەتی شۆڤێنیانەی کەمالییەکانە وە هەبوو،بوو بەهۆی بێزاری و ڕق وقینی کوردەکان بەرامبەر کەمالییەکان و بەئاشکرا خەڵك ڕووبەڕووی کەمالییەکان دەبۆوە و نارەزاییان دەردەبڕی، تەنانەت کار گەیشتە ئەوەی مستەفا کەمال (ئەتاتورك) بەڕاشکاوی لەکۆبوونەوەی ئەنجوومەنی گەورەی نیشتمانی تورکیا لەساڵی ١٩٣٦دابڵێت: (گرنگترین مەسەلەی باری ناوخۆی ئێمە گیروگرفتی دەرسیمە، لەبەر ئەوە و بۆ بنبڕکردنی ئەو کوانە کوشندەیەو، بۆ ئەوەی بتوانین خێراتر بڕیاربدەین، پێویستە حکومەت دەسەڵاتێکی فراوان و بێ سنوری بدرێتێ).


کەمال ئەتاتورك

هەروەها ئەو گرانی و برسێتی و بێکاریەی کەلەئەنجامی قەیرانی ئابووری جیهانی سالآنی(١٩٢٩ ــ ١٩٣٢) دروستبوو، کوردستانیشی گرتبۆوە.

سەید ڕەزا بۆ ئەوەی ناوچەکە لەشەڕ دووربخاتەوە چەند جارێك نامەی بۆ(ئالب دۆغان)نارد، تەنانەت جارێکیان کوڕێکی خۆی نارد بۆ وتووێژ، بەلاَم بەفێڵ گرتیان و دواتر کوشتیان. بۆیە شۆڕش لە زستانی ١٩٣٧زدا دەستی پێکردو. شۆڕشگێڕان چەندین سەرکەوتنی گەورەیان بەسەر هێزەکانی تورکدا بەدەست هێنا، بۆیە تورکیا بڕیاری دا هێزێکی گەورەی پڕ مەشق و پشت ئەستوور بەچەکی قورس و فڕۆکەی جەنگی ڕەوانەی دەرسیم بکات، تەنانەت سەرۆك وەزیران (عیسمەت ئینۆنۆ) خۆی سەرکردایەتی سوپای تورکیای گرتە ئەستۆ،لەپەلامارێکی گەورەدا ڕووبەرێکی فراوانی لەدارستان و کێڵگەو گوندەکانی دەرسیمی ئاگرتێبەردا بەوبیانووەی شوێنی خۆحەشاردانی شۆڕشگێڕانە.ئینجا چەندین شەڕی قورسی نا هاوتا لەنێوان هەردوولادا هەڵگیرسا کەتیایدا کوردەکان ئازایانە بەرگریان کرد، بەلاَم لەبەرامبەر لەشکری گەورەو پڕچەك و مەشق پێکراو و فڕۆکەی جەنگی تورکیا نەیانتوانی خۆیان ڕابگرن و تەنانەت لەشەڕێکیاندا سەید ڕەزا خۆی کەتەمەنی (٧٥) ساڵ بوو بەقورسی برینداربوو.

زستانی ساڵی ١٩٣٧زۆر سەخت بوو، خەڵکێکی زۆریش ئاوارەو دەربەدەر ببوون بێ جێگاو شوێنی حەوانەوە بوون و، شۆڕشگێڕانیش ئازووقەو تەقەمەنیان زۆر کەم ببوو لەچیا سەختەکانی دەرسیم. لەو کاتانەدا(ئالب دۆغان) نامەیەکی بۆ سەید ڕەزا ناردو بەناوی حکومەتی تورکیاوە ئامادەیی خۆی بۆ گفتوگۆ دەربڕی، بۆیە سەید ڕەزا بۆ گفتوگۆ

چوو بۆ شاری(ئەرزنجان)لەو پەڕی باکووری کوردستان، بەڵام لەویّ یەکسەر دەستگیریان کردو دوای دادگاییەکی ڕووکەشانە خۆی و(پانزدە)کەس لەهاوڕێکانی لەسێدارەدران.

## ٧ - شۆڕشەکانی بارزان:-

### أ- شۆڕشی یەکەمی بارزان بە سەرۆکایەتی شێخ ئەحمەدی بارزان(١٩٣١ - ١٩٣٢)ز:-

دوای لەسێدارەدانی شێخ عەبدولسەلام بارزانی،شێخ ئەحمەدی برای جڵەوی سەرکردایەتی بارزانی گرتە دەست، کەئەو کاتە تەمەنی ١٨ساڵان بوو.شێخ ئەحمەد بەتوندی پابەندی ڕێبازی شۆڕشگێڕانەی شێخ عەبدولسەلام و داب و نەریتە باشەکانی ناوچەکە بوو. لەئەنجامی بەهێزی هەستی نیشتمانپەروەریەوە شێخ ئەحمەد لەساڵی ١٩١٩ز داهێزێکی بۆ یارمەتیدانی شۆڕشەکەی شێخ مەحمود نارد،بەڵام بەهۆی ڕێگری ئینگلیزەکانەوە کاتێك هێزەکە گەیشتە ناوچەکە شۆڕشەکەی شێخ مەحمود کپ کرابۆوە.


شێخ ئەحمەدی بارزانی ١٩٣٣ موسل

ئینگلیزەکان بڕیاریاندا زەبرێکی توند لەناوچەی بارزان بدەن و خەڵکەکەشی دەربەدەربکەن و لەجێگای ئەواندا ئاشووریەکان نیشتەجێ بکەن. لەمانگی تشرینی دووەمی ۱۹۱۹ز دا (کۆلۆنێل بیل)ی حاکمی موسڵ لەگەڵ (کابتن سکۆت)ی حاکمی ئاکرێ گەشتێکیان بەناوچەکانی سورچی و زێباری و بارزان دا کردو دەستیانکرد بەهەڕەشەکردن بەسزادانی شێخ ئەحمەد و، سەپاندنی سزاو باجی گەورە بەسەر سەرۆك عەشیرەتەکانی ناوچەکە، کاتێکیش چوونە بارزان شێخ ئەحمەد پێشوازی لێنەکردن، زێباریەکان و بارزانیەکانیش بۆسەیەکیان بۆ ئەم دوو حاکمەی ئینگلیز نایەوەو هەردووکیان کوشتن، دواتریش دەستیان بەسەر شاری (ئاکرێ)دا گرت.

لەبەهاریساڵی ۱۹۲۰ز دا ئینگلیز هێزێکی زۆری (لیڤی) ئاشووریەکانی ناردە سەربارزان و چەند شەڕێکی خوێناوی لەنێوانیاندا ڕوویدا. بەڵام زۆری پێنە چوو کاتێك هەردوولا درکیان بەو نەخشە خراپەی ئینگلیز کردو شەڕەکانیان کۆتایی پێهێناو پەیوەندییەکانیشیان ئاسایی کردەوە. ئینگلیز ئەمجارە ویستی بەهەر نرخێك بێت شێخ ئەحمەد بەلای خۆیدا ڕابکێشێت جارێك بەهەڕەشەو جارێکی تر بەپارەو خەڵەتاندن. بەڵام شێخ ئەحمەد هەڵوێستی خۆی نەگۆڕی و ئامادە نەبوو مل بۆ داگیرکاران کەچ بکات.

شێخ ئەحمەد هەمیشە لەگەڵ بەرپرسە بەریتانییەکاندا جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کەپارەو سامان و شۆێنی بەرزی ناوێ، بەڵکو دەیەوێ لەسەر زێدی باب و باپیرانی خۆیان بەئازادی بژین، بەڵام ئینگلیزەکان بەردەوام مەترسی دەست پێکردنی شۆڕشیان هەبوو لەناوچەکە. بۆیە ئەمجارە دەسەڵاتدارانی حکومەتی عێراق و ئینگلیز پەنایان بردە

بەرهاندانی عەشیرەتەکانی تر بۆ لێدانی بارزانییەکان، بەڵام ئەم پیلانەشیان سەری نەگرت.بۆیە هێزەکانی حکومەتی عێراقی خۆیان هێرشیان کردە سەر ناوچەی بارزان و لەشەڕی(بەرقی بەگ)لە٩ کانونی یەکەمی ١٩٣١ز دا بارزانیەکان کە ژمارەیان لە (٨٠) کەس تێنەدەپەڕی توانیان فەوجێکی سەربازی حکومەتی عێراقی، کە فڕۆکەیەکی جەنگیش پاڵپشتی دەکردن، تێکبشکێنن .

لەم شەڕەدا ژمارەیەك سەرباز کوژران و ژمارەیەکیش بەدیل گیران، پێنج جەنگاوەری بارزانیش شەهیدبوون. لەئەنجامی ئەم تێکشکانەدا ئەمجارەیان هێزەکانی حکومەتی عێراق بەپاڵپشتی چەکی ئاسمانی بەریتانیا هێرشێکی گەورەیان کردە سەر گوندەکانی بارزان و دڕاندانە بۆمبا بارانیان کردن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بارزانییەکان لە شەڕی (دۆلاڤاژی) لە نیسانی ١٩٣٢ز داو بەسەرۆکایەتی مستەفا بارزانی داستانێکی تریان تۆمارکرد. بۆیە دوژمن داوای شەڕوە ستاندنی کردو بۆ ماوەی دوو هەفتە شەڕ وەستا. بەڵام زۆری نەبرد هێزی ئاسمانی بەریتانیا دەستیان کردەوە بەهێرشکردن، شێخ ئەحمەد و هەڤاڵەکانی کاتێك زانیان ناتوانن لەبەرامبەر هێرشی چڕو پڕی هێزە ئاسمانییەکانی بەریتانیا بوەستن، پەنایان بردە بەر خاکی تورکیا. لەبەهاری ساڵی ١٩٣٣دا دەسەڵاتدارانی تورکیا شێخ ئەحمەدیان تەسلیم بەحکومەتی عێراق کردەوە.شێخ ئەحمەد و مستەفا بارزانی و خێزانەکانی تر بۆ موسڵ و لەوێوە بۆ بەغداو دواتریش بۆ ناسریە گوازرانەوە.دوای ئەمەش ناوچەی بارزان بەتەواوی هێمن و ئارام نەبۆوە، چونکە ئەو لێبوردنە گشتییەی کە حکومەتی عێراقی و ئینگلیزەکان دەریانکردبوو بۆ بارزانیەکان ڕاست دەرنەچوو. بۆیە (خەلیل خۆشەوی و

ئەحمەد نادر و عەبدوڵڵا کرکە مویی) پەنایان بردە بەر چیای (گۆڤەند)و خۆیان بەدەستەوەنەدا.

ئەحمەد نادر لە ئەیلولی ١٩٣٥لەشەڕێکی هێزەکانی تورکدا کە هاوکاری هێزێکی عێراقیان دەکرد بۆ دەستگیرکردنی ئەم شۆڕشگێڕانە، کوژرا، هەر لەو شەڕەدا (عەبدوڵڵا کرکەمویی) بەبرینداری کەوتە دەست هێزەکانی حکومەتی عێراق. بەڵام خەلیل خۆشەوی و(٣٠) کەس لە هەڤاڵانی توانیان خۆیان لەئابلۆقەی هێزەکانی عێراق و تورکیا ڕزگاربکەن و لەئەشکەوتێکی ناوچەی (ڕێکان) دامانەوە، بەڵام لە هەموو لایەکەوە گەمارۆدران و پاش شەڕێکی قارەمانانە هەر هەموویان شەهید کران.

لەساڵی ١٩٣٩ز دەسەڵاتدارانی حکومەتی عێراق دوای ئەوەی ناوچەی بارزان ئارام بۆوە، شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفاو خێزانە بارزانییەکانیان بۆ بەندیخانەی (سلێمانی) گواستەوە.ئەمەش دەرفەتێکی لەباری بۆ ڕەخسـاندن تا پەیوەندی بکەن بەخەڵکی بارزان پاش ئەوەی دەسەڵاتداران ڕێگایان دا بەچەندین خێزان سەردانیان بکەن. هەر لەسلێمانی پەیوەندی لەنێوان حیزبی هیواو مستەفا بارزانی و چەند کەسایەتێکی نیشتمانپەروەری تر دروستبوو. بۆیە لە هاوینی ساڵی ١٩٤٣ز مستەفا بارزانی و دووکەس لە هەڤاڵانی بەیارمەتی حیزبی هیواو چەند کەسێکی نیشتمانپەروەری کورد لەسلێمانی دەرباز بوو بەخاکی ئێراندا گەڕایەوە ناوچەی بارزان و سەر لەنوێ دژی حکومەتی عێراقی و ئینگلیز دەستی بەشۆڕش کردەوە.

## ب – شۆڕشی دووەمی بارزان بەسەرۆکایەتی مستەفا بارزانی(١٩٤٣ – ١٩٤٥):-

دوای ئەوەی مستەفا بارزانی و دوو کەس لەهەڤاڵەکانی توانیان بەیارمەتی حیزبی هیواو بەهاوکاری شێخ لەتیف کوڕی شێخ مەحموودی حەفید ساڵی ١٩٤٣ز لـــە سلێمانی دەربازبن، لەڕێگای خۆرهەلاتی کوردستانەوە هەر ئەو ساڵە خۆیان گەیاندەوە ناوچەی بارزان و ژمارەیەکی زۆری خەڵك پەیوەندییان بەبارزانیەوە کردو ئەویش لەماوەیەکی کورتدا دەستی بەسەر ناوچەی بارزاندا گرت. حکومەتی عێراقی زانی کەلەڕێگای بەکارهێنانی هێزەوە ناگاتە هیچ ئاکامێك پەنای بردە بەر گفتوگۆ، مستەفا بارزانیش گەڕانەوەی شێخ ئەحمەد و سەرجەم دوورخراوەکانی تری کردە مەرجی گفتوگۆ، حکومەت داواکەی بارزانی جێبە جێکردو شەڕ ڕاوەستا و ڕێککەوتننامەیەك لەنێوان بارزانی و حکومەتی نوری سەعید دا مۆرکرا. گرنگترین داواکارییەکانی بارزانی لەم ڕێککەوتننەدا بریتی بوو لـــە:-

١– لادان و گواستنەوەی ئەو فەرمانبەرانەی کە بەهەڵسوکەوتی خراپ و بەرتیل خۆری تاوانبار بوون.

٢– دامەزراندنی ویلایەتی کوردستان کەپێکهاتبێ لەلیواکانی(کەرکوك، هەولێر، سلێمانی،قەزا کوردنشینەکانی لیوای موسڵ و لیوای دیالەو لیوای کوت).

٣– ناسینی زمانی کوردی بەزمانی ڕەسمی.

٤– دامەزراندنی وەزیرێکی کورد ببێتە بەرپرسی ویلایەتی کوردستان.

٥– دامەزراندنی یاریدەدەری وەزیری کورد لەهەر وەزارەتێکی دەوڵەتدا.

٦- بژاردنەوەی ئەو زیانانەی کەبەر خەڵك کەوتوون.

٧- دروستکردنی قوتابخانەو نەخۆشخانەو کردنەوەی ڕێگاو بان و ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکە.

دوای ئەوەی ساڵی ١٩٤٤ز وەزارەتەکەی نوری سەعید دەستی لەکار کێشایەوە، وەزارەتێکی نوێ بەسەرۆکایەتی(حەمدی پاچەچی)پێکهات. وەزارەتی نوێ ڕایگەیاند کەپابەندی ئەو ڕێککەوتننامەیە نابێت کە وەزارەتەکەی نوری سەعید ئەنجامیداوە، هەموو ئەمانەش شانۆگەریەك بوو بەریتانیا ڕێکیخستبوو، ئەنجامەکەشی سەر لەنوێ هەڵگیرسانەوەی شۆڕش بوو لەساڵی ١٩٤٥ز دا.

ئەمجارەیان ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆشنبیران و سەرباز و ئەفسەرانی کورد ڕیزەکانی سوپای عێراقیان جێهێشت و چوونە پاڵ شۆڕش. بارزانی لەزستانی ١٩٤٥دا لەگەڵ ئەم ڕۆشنبیرو ئەفسەرانەدا (لیژنەی ئازادی)یان دامەزراند بۆ داواکردنی مافەکانی گەلی کورد. هەروەها بارزانی پەیوەندی بەعەشیرەتە کوردیەکانیشەوە کرد لەناوچە جیاجیاکانی کوردستان، دواتریش هەر لەبارەی مافەکانی گەلی کوردەوە یاداشتێکی ئاراستەی حکومەتی عێراقی و باڵیوزی بەریتانیاو باڵیوزخانەی دەوڵەتانی ترکرد لەبەغداد. حکومەتی عێراق گوێی بەداواکانی بارزانی نەداو لەهاوینی ١٩٤٥ز لەنێو مەخفەری مێرگە سوور (وەلی بەگ)یان کوشت کە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی هاووڵاتیان ڕووی لە مەخفەرەکە کردبوو، ئەمەش بوو بەهۆی بێزاری و تووڕەیی خەڵکی ناوچەکە چونکە (وەلی بەگ) ڕێزو پلەو پایەی لەنێو خەڵکدا زۆر بوو، هەرچەندە بارزانی هەوڵیدا بارودۆخەکە ئارام بکاتەوە، بەڵام حکومەتی عێراق لەدەرفەتێکی تر دەگەڕا بۆ سەپاندنەوەی

دەسەڵاتی بەسەر ناوچەی بارزان دالەم ڕوانگەیەشەوە  ئینگلیز هاندەرێکی سەرەکی حکومەتی عێراقی بوو، بۆیە جارێکی تر هێزی ئاسمانی بەریتانیا ناوچەکەی بۆردومان کرد لەگەڵ ئەوەشدا هێزەکانی کورد لەچەند شەڕێکدا کە گرنگترینیان شەڕی (مەیدان مۆریك) بوو لەپایزی ١٩٤٥ز دا زەبری کوشندەیان لەسوپای عێراقی دا.

حکومەتی عێراقی توانی بەپارەو سامان چەند عەشیرەتێکی کورد بۆ لای خۆی ڕابکێشێت و بیانخاتە سەنگەری دژی شۆڕشەوە. بارزانی کاتێك هەستی کرد ناتوانێت لەبەرامبەر سوپای عێراقیی و فڕۆکەکانی بەریتانیا دا تاسەر بەرگری بکات، بۆیە دوای وتووێژ و ڕاگۆڕینەوە لەگەڵ لیژنەی ئازادی و شێخ ئەحمەد بارزانی، بڕیاریدا پەنا ببەنە بەر خۆرهەڵاتی کوردستان کە لەو کاتەدا خەریکی مەراسیمی دامەزراندنی کۆماری کوردستان بوو لەمەهاباد. بەمجۆرە بەدرێژایی ساڵانی جەنگی دووەمی جیهانی، باشووری کوردستان لە خەباتێکی سیاسی و چەکداری بێ پسانەوە دابوو، تەنانەت پاش کۆتایی هاتنی جەنگیش ئەم خەباتە درێژەی هەبوو، باشترین نموومەش ڕاپەڕینی


مەلا مستەفا بارزانی

گاورباغی بوو لە ساڵی ١٩٤٦ز لەشاری کەرکوك، کەکرێکارانی کۆمپانیای نەوتی کەرکوك بۆ بەدیهێنانی مافەکانیان لەدژی حکومەتی عێراقی و داگیرکەرە بەریتانیەکان بەرپایان کرد.

### ٧ - کـۆمـاری کوردستان:

### أ- بارودۆخی دامەزراندنی کۆمار:-

لە ٢٥ ئابی ١٩٤١دا واتە لە گەرمەی جەنگی دووەمی جیهانی دا هاوپەیمانان بەشی هەرە گەورەی وڵاتی ئێرانیان داگیرکرد. بەریتانیاو ئەمەریکا لە باشوورەوە، یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو لەباکوورەوە هاتنە ناو خاکی ئێرانەوە، لەئەنجام دا ڕەزا شای پەهلەوی لەسەر کارلادراو لە ١٦ ئەیلولی هەمانساڵدا (محەمەد ڕەزا شا)ی کوڕە گەورەیان لە جێگای دانا.



ئەندامانی کابینەی حکومەتی کوردستان

لەساڵانی جەنگی دووەمی جیهانی دا بەهاتنە ناوەوەی هاوپەیمانان و نەمانی دەسەڵاتی ڕەزا شا، ڕێ لەبەردەم کاری سیاسی لە کوردستان دا

هەلومەرجی پێکهێنانی ڕێکخراوێکی نەتەوەیی کوردیان لەمەهاباد بەناوی کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد(ژێ کاف) لە ١٦/ئابی/١٩٤٢ وە هێنایە بوون.کەپاشان بوو بە بناغەی پارتی دیموکراتی کوردستان ١٦/ئابی/١٩٤٥ و قازی محەمەد یش کرا بەسەرۆکە ئەو حیزبە ڕۆژی (٢) ڕێبەندان (٢٢کانوونی دووەمی ١٩٤٦) پێشەوا (قازی محەمەد) لەڕێو ڕەسمێکی گەورەدا لەگۆڕەپانی چوارچرا لەمەهاباد کۆماری کوردستانی ڕاگەیاند.

ڕێو ڕەسمەکە بەسوێند خواردن بە(قورئان) و (نەخشە) و (ئاڵای کوردستان) جێبەجێ کرا، ئاڵای کوردستان لەسەر دام و دەزگاکانی حکومەت لەشارەکانی ژێر دەسەڵاتی کۆماردا بەرز کرایەوەولە ١١ شوباتی ١٩٤٦یشدا لەڕۆژنامەی (کوردستان)کە زمانحاڵی حیزبی دیموکراتی کوردستان بوو، ناوی وەزیرەکانی کابینەی حکومەتی کوردستان بڵاوکرایەوە.



## ب ـ دەستکەوتەکانی کۆماری کوردستان:-

هەرچەندە تەمەنی کۆماری کوردستان کەمتر لە١١ مانگ بوو، بەڵام توانی لەو ماوە کورتە دا دەستکەوتی گەورە بۆ گەلی کورد بەدەست بێنێ. گرنگترین ئەو دەستکەوتانەش بریتی بوو لە:-

١- زمانی کوردی کرا بەزمانی ڕەسمی لەسەرجەم دام و دەزگاکانی کۆماردا.

٢- دامەزراندنی دەزگای چاپ و دەرچوواندنی ژمارەیەکی زۆر بڵاوکراوەو ڕۆژنامە و گۆڤار بەزمانی کوردی، لەوانەش ڕۆژنامەی (کوردستان) کە زمان حاڵی کۆمارو حیزبی دیموکراتیش بوو، لەشاری بۆکان گۆڤاری (هەڵاڵە) و یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستانیش گۆڤاری (هاواری نیشتمان)یان دەردەکرد، وێڕای دەرکردنی گۆڤاری (گڕوگاڵی منداڵانی کورد) کەبەیەکەمین گۆڤاری کوردی تایبەت بە منداڵان دادەنرێت.

٣- دامەزراندنی شانۆی کوردی کەسوودێکی زۆری بەخەڵکی گەیاند، چونکە لە٩٠٪ی خەڵکی ئەو کاتەی کوردستان نەخوێندەواربوون و نەیاندەتوانی سوود لەخوێندنەوەی بڵاوکراوەکان وەربگرن.

٤- بەشداری پێکردنی ئافرەتی کورد لەکاری سیاسی و ڕۆشنبیری دا. پێشەوا قازی پێشەنگی ئەو کەسانە بوو کەهانی خێزانەکەی خۆیدا بۆ ئەم مەبەستە (مینا خان)ی خێزانی لەکۆبوونەوەیەکی ئافرەتان دا لە ١٤ ئازاری ١٩٤٦ دا دامەزراندنی (یەکێتی ئافرەتانی دیموکراتی کوردستان)ی ڕاگەیاند.

٥- دامەزراندنی سوپای کوردستان کە بە هەزاران کەس چوونە نێو ڕیزەکانییەوەو ژمارەیەکیش لەئەفسەرانی کوردی باشووری کوردستان لەگەڵ مستەفا بارزانی و هاوڕێکانیدا لەڕیزی سوپای کۆماردا بوون.

٦- پاراستنی هێمنی و ئاسایش و ژیانی هاووڵاتیان. لەماوەی نزیك بە ١١مانگی تەمەنی کۆماردا تەنها یەك کەس لەسنووری دەسەڵاتی کۆماردا کوژرا وێڕای ئەوەی کەچەکداری دیاردەیەکی بڵاوبوو. هەروەها دیاردەکانی ڕێگری و بەرتیل و تاڵانی و دزی کە پێشتر بڵاوبوو، لە ناوبران.

٧- دەستکەوتەکانی کۆمار زۆرن، بەڵام بەدەستهێنانی ئازادی و سەربەخۆیی و ڕزگاری نەتەوەیی لەبەشێکی خۆرهەڵاتی کوردستان بەگرنگترینیان دادەنرێت.

## ج - ڕۆڵی بارزانی و هەڤاڵەکانی لە کۆماری کوردستان:

ژمارەی هێزەکانی مستەفا بارزانی کە لە ڕیزی سوپای کۆماردا بوون نزیکەی (٢٠٠٠) هەزار پێشمەرگە دەبوون، خۆیشی یەکێك بوو لە چوار ئەفسەرە پایە بەرزەی کۆمار کە پلەی (ژەنەراڵ) یان پێدابوو.



لەسەر داوای پێشەوا، مستەفا بارزانی پێشمەرگەکانی خۆی بەسەر چوار هێزدا دابەشکرد، بۆیە هەر هێزێکیش ئەفسەرێکی کوردی سوپای

عێراقی وەك فەرماندە دەست نیشانکرد ، خۆشی فەرماندەیی (ئەرکانی هێزی بارزانیان)ی دەکرد، ئەفسەرەکانی تریش بۆ سوود وەرگرتن لەکاروباری مەشق پێکردن دابەشکران. هێزی بارزانیەکان لەهێڵی پێشەوەی بەرەی سەر ڕێگای سەقز ـ بۆکان بەرامبەر هێزەکانی ئێران دامەزران. لەم بەرەیەدا ئێران هێزێکی زۆری کۆ کردەوەو دەیویست پێشڕەوی بکات، بەڵام هێزی بارزانییەکان لەشەڕی بەناوبانگی (قاراوا) بە سەرۆکایەتی مستەفا بارزانی زەبرێکی توندیان لەهێزەکانی ئێراندا. بۆ تۆڵەی شکستی شەڕی (قاراوا)، حکومەتی ئێران هێزێکی گەورەی بە پاڵپشتی ژمارەیەکی زۆر تۆپ و تانك و زرێپۆش و فڕۆکە ناردە سەر بارزانییەکان، هەر چەندە بارزانییەکان ڕووبەرووی ئەم هێزە بوونەوە، بەڵام دواجار نەیانتوانی لەبەرامبەر ئەو هێزە پڕ چەك و گەورەیە خۆیان ڕابگرن و پاشەکشەیان کرد و شەڕ وەستا.



**ئەفسەرانی سوپای کۆمار**

پاش ڕووخانی کۆمارو خۆبەدەستەوە دانی قازی محەمەد و هاوڕێکانی، بارزانییەکان خۆیان بەدەستەوە نەداو بڕیاری شەڕ لەگەڵ هێزەکانی ئێرانیاندا. وێڕای پشتیوانی ئەمەریکاو بەریتانیا لەحکومەتی ئێران و، ناهاوتایی هێزەکانی هەردوولا لەڕووی ژمارەی سەربازو چەك و تەقەمەنی و مەشق و......هتد، کەچی بارزانییەکان بە تایبەتی لەبەرەی شنۆ هێزەکانی ئێرانیان ڕووبەڕووی شکستی گەورە کردەوە. سەر ئەنجام لەژێر گوشاری زۆری هێزەکانی ئێران، بارزانی و هەڤاڵەکانی بەنێو باشووری کوردستان پاشەکشەیان کرد. بەمەش هێزەکانی حکومەتی ئێران لەبەدیهێنانی تەواوی ئامانجە سەربازییەکاندا سەرکەوتوو نەبوو.

لەباشووری کوردستان ژمارەیەك لەبارزانییەکان بەسەرۆکایەتی شێخ ئەحمەدی بارزانی و ژمارەیەکیش لەئەفسەرە کوردەکان خۆیان دایەوە دەست حکومەتی عێراقی بەپشت بەستن بەو بەڵێنانەی حکومەتی عێراقی بۆ لێخۆشبوون دەریکردبوو.

هەرچەندە حکومەتی عێراقی بەڵێنەکەی نەبردە سەرو هەرچوار ئەفسەرە کوردەکەی(خەیروڵلا عەبدولکەریم ، عیززەت عەبدولعەزیز ، مستەفا خۆشناو، محەمەد مەحمود قودسی) لەڕۆژی ١٩حوزەیرانی ١٩٤٧دا بە بڕیارێکی ستەمکارانە لەسێدارەدران.



عزت عبدالعزيز



خيرالله عبدالكريم



مستەفا خۆشناو



محەممەد مەحمود قودسی

**وێنەی چوار ئەفسەرەکەی شەهیدانی کوردستان**

ئەوەی کەمابۆوە مستەفا بارزانی و نزیکەی (٥٠٠) کەس لەهەڤاڵەکانی بوو ئەوانیش لەلایەن حکومەتی عێراقی و بەپاڵپشتی هێزی ئاسمانی بەریتانیا هێرشێکی توندیان کرایە سەرو ناچار بوون پەناببەنە بەر خاکی

توركیا، لەتورکیاشدا هێزەکانی تورك هێرشیان کردە سەریان، بەمجۆرە بارزانی و هەڤاڵەکانی لەگەڵ هێزی سێ دەوڵەتی (ئێران ـ عێراق ـ توركیا) لە سەنگەری شەڕی بەرگری و مان و نەمان دابوون، حکومەتی ئێران ژمارەیەکی زۆر هێزی ئاسمانی و زەمینی بۆ لێدانی بارزانی و هەڤاڵەکانی تەرخانکرد، بەڵام نەیتوانی بەسەر شەڕی پارتیزانی بارزانییەکاندا زاڵ بێت، تاکتیکی شەڕی پارتیزانی بارزانی و هەڤاڵەکانی ئەوەندە سەرکەوتووبوو لەدواتردا وەکو وانەیەك لەزانکۆی جەنگی ئێران دا دەگوترایەوە، تا سەرەنجام دوای ئەوەی دەیان کەمین (بۆسە) یان بڕی وبارزانی و هەڤاڵەکانی ڕۆژی ١٨حوزەیرانی ١٩٤٧لەئاوی ئاراس پەڕینەوە وپەنایان بردە بەرخاکی یەکێتی سۆڤیەت و تا هەڵگیرسانی شۆڕشی ١٤تەموزی ١٩٥٨لەم وڵاتە مانەوەو ئەودەمە گەڕانەوە بۆ نیشتمان.

## د- ڕووخانی کۆماری کوردستان:-

کۆماری کوردستان لەئەنجامی ژمارەیەك هۆکاری ناوخۆیی و ناوچەیی و نێودەوڵەتی ڕووخا کەگرنگترینیان بریتی بوون لە:-

١- خۆبەدەستەوەدانی حکومەتی ئازەربایجان بەبێ بەرهەڵستی، ڕێگای خۆشکرد بۆ لەشکری ئێران ئاسانتر پەلاماری کۆماری کوردستان بدات و هێزی زیاتریشی لەسەر کۆبکاتەوە.

٢- کشانەوەی هێزەکانی سۆڤیەت لە ١٠ئایاری ١٩٤٦لەئێران و کوردستان دەستی هێزەکانی لەشکری ئێرانی ئاوەڵاتر کرد بۆ هێرشکردنە سەر ناوچەکانی دەسەڵاتی کۆماری کوردستان.

٣- نیازپاکی قازی محەمەد لەبەرامبەر دوژمنەکانیدا. قازی بڕوای بەبەڵێنە درۆینەکانی (قەوام سەڵتەنە)ی سەرۆك وەزیرانی ئێران کرد، هەروەها لەژێر گوشارو بەڵێنی یەکێتی سۆڤیەتدا شاری (سەقز)ی ئازاد نەکرد. ئەگەر

سەقز ئازاد بکرایە ڕێگای ڕزگارکردنی شارەکانی بانەو سەردەشت زۆر ئاسانتر دەبوون ئەو کاتەش کۆمار قورساییەکی زۆرتری لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا دەبوو، جگە لەوەی سنوری سیاسی کۆمار فراوانتر و بەرەکانی جەنگیش گەورەتر و ئاوەڵاتر دەبوون و مەترسییەکانیش لەسەر (مەهاباد) پایتەختی کۆمار کەمتر دەبوونەوە.

٤- هەوڵەکانی (قەوام سەڵتەنە) لەدروست کردنی ناکۆکی نێوان حکومەتی ئازەربایجان و کۆماری کوردستاندا، کەبەداڕێژەری پیلانی ناکۆکی نێوان ئەم دوو دەسەڵاتە دادەنرێت.

٥- جگە لەوەی لەسەر ئاستی ناوچەیی حکومەتەکانی عێراق و تورکیا دژایەتی خۆیان بۆ کۆمار ڕاگەیاند، لەڕووی نێو دەوڵەتیشەوە یەکێتی سۆڤیەت و بەریتانیا و ئەمەریکا. هەرسێکیان بەپێ ی لێکدانەوەی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان دژی کۆمارووەستانەوەو تەنانەت هەرسێکیان تەبابوون لەسەر پاراستنی یەکپارچەیی خاکی ئێران و لەمڕووەشەوە هاوکاری باشی دەوڵەتی ئێرانیان کرد.

لەئەنجامی ئەمانەو زۆر هۆکاری تریش هێزەکانی ئێران لە ١٧ کانوونی یەکەم ساڵی ١٩٤٦ پەلاماری شاری(مەهاباد)پایتەختی کۆماری کوردستانیان داو داگیریان کردەوە. لەئەنجامی هێرشی ئێراندا نزیکەی (١٥,٠٠٠) کەس لەخەڵکی کورد دەکوژرێن و (١٥) سەرکردەی کۆماریش دوای دادگاییەکی ڕووکەشانە لە ٣١ ئازاری ساڵی ١٩٤٧ دا لە گۆرەپانی چوار چرا لەشاری مەهاباد لەسێدارە دەدرێن لەنێویاندا پێشەوا قازی محەمەد(سەرۆك کۆماری کوردستان) و سەدری قازی(برای پێشەوا قازی و ئەندامی پەرلەمانی ئێران) و سەیفی قازی(ئامۆزای پێشەواو وەزیری بەرگری کۆماری کوردستان) بوون.

# بەشی نۆیەم

## أ- راپەرین و شۆڕشەکانی عێراق و رۆڵی کورد تیایاندا:

### ١- ڕاپەڕینی (١٩٤٨) لە عێراق و رۆڵی کورد تیایدا:-

گەلی عێراق پاش دوایی هاتنی شەڕی دووەمی جیهانی و دامەزراندنی نەتەوە یەککگرتووەکان سەیری کرد پەیمانی ساڵی١٩٣٠ی نێوان عێراق و بەریتانیا لــە مەبەست کەوتووە، پەیوەندی نێوان عێراق و بەریتانیاش دەبێ بەپێی بەندەکانی بەڵێننامەی نەتەوە یەککگرتوەکان بێت بەتایبەتی کە هەردوو دەوڵەت هاو ماف و هاوئەرکن، بەڵام چینی کاربەدەستی عێراق ملکەچی ئیستعماری بەریتانیا نەخشەی ئەنگلو ــ ئەمریکایی دەربارەی بەرگریی هاوبەش لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست و تێکەڵبوونی شەڕی ساردی نێوان کۆمەڵە دەوڵەتە گەورەکانی پەسەندکرد. بەریتانیاش ویستی سیفەتی ڕەوایی پەیمانەکەی عێراقی بەریتانی نوێ بکاتەوە و مافی سوپایی بەریتانیا لەعێراق فراوانتر بکات بەمەرجێ هەموو عێراق نەك هەردوو بنکەکەی حەبانیە و بەسرە بکات بەفرۆکەخانەی هێزەکانی خۆی.

نوری سەعید ڕێگەی بۆ صالح جەبر خۆش کرد کەلە ٢٩ئاداری١٩٤٧ وەزارەتی پێکهێنا، وتووێژ لەنێوان هەردوولای عێراق و بەریتانیا دا لەبەغداد و لەندەن دەستی پێ کرا و کۆبوونەوەیەکی زۆریان کرد کە لە بەشێکیاندا (وەصی) خۆیشی بەشداربوو، پاشان نێرژەیەك بەسەرۆکایەتی سەرۆك وەزیران صالح جەبر و، وەزیری بەرگری نوری سەعید و فاضل الجمالي وەزیری دەرەوە چوونە ئینگلتەرا بۆ مۆرکردنی پەیمانی

پۆرتسموث کە بەناوی بەندەری پۆرتسموث لە باشووری ئینگلتەرا ناونرابوو گەلێ کۆتی تازەی بۆ عێراق تێدابوو وەکو هاوبەشیکردنی عێراق لەدانی خەرجی هێزەکانی بەریتانیا و بەکارهێنانی هێزەکانی عێراق لەدەرەوەی وڵات بۆ یاریدەدانی بەریتانیا، بەریتانیا دەسەڵاتی جارانی لەسیاسەتی دەرەوەی عێراق دابمێنێ.

ئەوە بوو نیشمانپەروەرانی کورد هەر لەسەرەتاوە شان بەشانی جەماوەری راپەڕیوی بەغدا ڕژانە سەر شەقامەکان، لەبەغداد پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی شیوعی عێراقی و حیزبی(الشـــعب) کۆمیتەیەکی سێ قۆڵی تایبەتیان دامەزراند، کەئەرکی سەرپەرشتی و ڕێکخستنی خەباتی گەل و دیاریکردنی دروشمەکانی خەباتی ئەو قۆناغەی لەئەستۆ گرت لە پووچ کردنەوەی پەیمانەکەو ڕووخاندنی وەزارەتەکەی سالّح جەبرو – جگە لەهەندێ دروشمی تر، کە بەشێکیان پەیوەندیدار بوون بەمافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد.

لەکەرکوکیش نیشتمانپەروەران هێرشیان کردە سەر کونسوڵخانەی بەریتانی و لەسلێمانیش هێرشیان کردە سەر مەڵبەندی ڕۆشنبیری بەریتانی، هەر بۆ بەشداریکردن لەڕاپەڕینەکە لەشوباتی ئەو ساڵەدا نوێنەرانی شارەکانی هەولێر و کۆیە تێکڕا ڕژانە سەر شەقامەکانی بەغداد و پاشان لەگەڵ جەماوەری شاری بەغداد سەردانی گۆڕی کوژراوانی (٢٧)کانوونی دووەمیان کردو بەشداری ناشتنی نیشتیمانپەروەری کورد(حوسێن عەلی) یان کرد، کە لە ڕاپەڕینەکەدا شەهید ببوو.

هەر لەو مانگەدا وەفدی زاخۆ و ڕانیە و سلێمانی گەیشتنە بەغداو خۆپیشاندانێکی گەورەیان ڕێکخست، ئەمانە گشتیان بەجلی کوردی و

بەچەپکە گوڵ و بەلافیتەی جۆراو جۆرەوە دروشمی هەر شارێکیش بەرزکرابووەوە.

دانیشتوانی شاری سلێمانی، لەنامەیەکی تایبەتیدا ئەم داخوازییانەی لای خوارەوەیان خستە بەردەمی وەزارەتی ساڵح جەبر:

١- دانی مافە دیموکراسییەکانی گەل.

٢- ڕێگەدان بەژیانی پارتایەتی سەربەخۆ .

٣- ڕێگەدان بەدامەزراندنی جڤاتی کرێکاران.

٤- ئازادکردنی هەمووگیراوە سیاسییەکانی عێراق.

٥- لابردنی پەیمانی١٩٣٠.



وێنەی وەفدی سلێمانی لەڕاپەرینەکەی ١٩٤٨

هەرچەندە پەیمانی پۆرتسمۆث هەڵوەشایەوەو،وەزارەتەکەی(ساڵح جەبر) لەکارخرا، ژمارەیەك لە وەزیرەکان و جێگری وەزیر دەستیان

لەکارکێشایەوە،لەگەڵ ئەمانەشدا ڕاپەڕینەکەی ١٩٤٨ چەندین دەستکەوتی باشی بۆ کورد تێدابوو لەوانە:

١- ڕێگەدرا بە دەرچوونی گۆڤارێکی سیاسی بەزمانی کوردی ئەویش گۆڤاری (نزار) بوو، کە (عەلائەدین سەجادی) سەر نووسەری بوو.

٢- ڕۆژی ٢١ی ئازاری ١٩٤٨بۆ یەکەمجار کورد بەشێوەیەکی فراوان و ئاشکرا یادی نەورۆزی لە کوردستانی بندەستی عێراق کردەوە.

بەڵام زۆری نەخایاند وەزارەتەکەی (محەمەد سەدر) کە لە جیاتی وەزارەتەکەی (سالح جەبر) دامەزرابوو، لەڕێرەوی دیموکراتی لایداو، لەزۆر شارو ناوچە و دەزگاکانی میری دەستیان وەردایە کاری هەڵبژاردن و لە ئەنجامدا چەند بەیەکدادانێك لەنێوان نیشمانپەروەران و پۆلیس دا ڕوویدا، لەهەمانکاتدا پۆلیس لە چەند شوێنێك لەکرێکارانیان دا، مانگرتنی کرێکارانی شەمەندەفەری هەولێریان سەرکوتکرد، هەربەمەشەوە نەوەستان، بەڵکو ژمارەیەك لەنیشتمانپەروەرانیان خستە زیندانەکانەوە، ژمارەیەکی زۆر قوتابییانی سلێمانی لەکاتی تاقیکردنەوەدا دەستگیر کران.

ئەم ڕاپەڕینە ڕێگای خۆش کرد بۆ سەرهەڵدانی بزوتنەوەو ڕاپەڕینی جوتیارانی کورد هەروەك ساڵی١٩٤٨ لەناوچەی عەربەت(لەدەشتی شارەزوور)و ،ساڵی ١٩٥٣ز لەدەشتی دزەیی (هەولێر)دا ڕوویدا دژی چەوساندنەوەی دەرەبەگایەتی ،هەر لەهەمان ساڵدا جوتیارانی هۆرین شێخان (لەباکوری خانەقین) و ،جوتیارانی (وارماوە) لە هەڵەبجە ڕاپەڕین.

## ٢- ڕاپەڕینی ١٩٥٢ لە عێراق و ڕۆڵی کورد تیایدا:-

کۆمەڵێك هۆکار هانی گەلی عێراقیدا بۆ ئەم ڕاپەڕینە، لەوانە سەرکەوتنە گەورەکەی گەل بوو لەڕاپەڕینەکەی کانوونی ١٩٤٨، سیاسەتی دەمکوتکردن و نەهێشتنی سەربەستی و باری ئابووری شڕو گوزەران خراپی خەڵك لەلایەکەوە و ڕووداوەکانی ناوچە عەرەبییەکان لەلایەکی ترەوە وەکو سەرکەوتنی شۆڕشی ٢٣تەموزی١٩٥٢لە میسر و لەناوبردنی ڕژێمی مەلیکی و بڕیاردانی کۆماری بەسەرکردایەتی(جەمال عبدالناصر)، ڕاپەڕینی گەلی عەرەبی لوبنان و ڕووخاندنی حکومەتی بشار الخوري لەهەمانساڵدا، سەر لە نوێ چالاکی جەماوەرکەوتە گوڕ. بزوتنەوەی نیشتمانی داوای لەحکومەت کرد چەند چاکەسازی یەك بکات وەکو:

١- هەڵبژاردنێکی گشتی و خێرا.

٢- پاککردنەوەی دەزگاکانی دەوڵەت.

٣- سنووردارکردنی خاوەندارێتی زەوی.

٤- چەك داماڵین لەعەشیرەتەکان.

٥- داشکاندنی نرخی شتومەکی بەکاربردن.

٦- چاوگێڕانەوە بەدەستوور و سنوردارکردنی دەسەڵاتی مەلیك و لابردنی پەیمانی١٩٣٠.

بەڵام (عەبدولئیلا)ی وەصی ئەم داخوازیانەی گەلی ڕەت کردەوە، چونکە هەڕەشەیان لەبەرژەوەندی خۆی و ئاغاو دارودەستەکەی ئەکرد.

مان گرتنی قوتابیانی زانستگای دەرمانسازی و کیمیاگەری لەبەغداد بوو بە پریشکێك و ئاگری ڕاپەڕینەکەی هەڵگیرساند.قوتابییان لەخانووی زانستگاکاندا خۆیان قایم کرد، بۆ بێزاری دەربڕین بەرامبەر دەستکارییەکی ستەمکارانەی پەیڕەوی زانستگاکە کە زیانی بەمافی قوتابیان دەگەیاند.

خۆپیشاندەران بەشەقامەکانی بەغداد وەربوون و خۆپیشاندەرەکان بەرەنگاری هێزی حکوومەت بوون و ژمارەیەکی زۆر لە تێکۆشەران و رۆڵەی گەل بریندار و شەهید بوون. هەروەها لەخۆپیشاندانەکان دا خوێندکارە کوردەکانی زانکۆی بەغدا رۆڵێکی بەرچاویان تیا بینی.

پاش ئەوەی راپەرینەکە هەموو جەماوەری گەلی عێراقی گرتەوە، حکومەت جڵەوی لە دەست چوو، مصطفى العمري وازی لەکارهێناو دوابەدوای ئەو سوپا هاتە سەر شەقام و لایەنگیری داخوازییەکانی گەلی کرد.

پاشان سەرۆکی ئەرکانی سوپا نورالدين محمود بەیاننامەیەکی دەرکرد و بڵاوی کردەوە کەوا وەزارەتێکی نوێ بەسەرۆکایەتی خۆی پێکهێناو داخوازییەکانی گەل بەدی دەهێنێ، بەڵام ئەمە پیلانێك بوو بۆ لەناوبردن و پووچکردنەوەی راپەرینەکە، چونکە نورالدين محمود حوکمی عورفی بڕیارداو خوێندنی قوتابخانە و زانستگاکانی راگرت، سەرکردەکانی بزوتنەوەی نیشتمانی لەبەندیخانە توند کردو حزبەکانی داخست.

لەپاش لابردنی حوکمی عورفی ، حیزبی شیوعی بەجۆرێکی باش و چالاك خۆی کۆکردەوە لەتشرینی دووەمی ۱۹٥۲دا سەرکردایەتی راپەرینێکی تری کرد کە دوو وەزارەتی بەدوای یەکدا رووخاند، پەرلەمانیشی هەڵوەشاندەوە. ئەو راپەرینەش یەکێك لەو هۆیانە بوون کەحکومەتی ناچار کرد بڕیاری هەڵبژاردنێکی نوێ بدات و رێگای حزبە خاوەن مۆڵەتدراوەکانیش بدات بەشداری تیادا بکەن.

## ٣- ڕاپەڕینی ١٩٥٦:-

بەر لەڕاپەڕینی گەلی عێراق لەساڵی ١٩٥٦کۆمەڵێك ڕووداو لەباری دەوڵەتان و عەرەبیدا هاتەکایەوە و بوو بە هۆکارێك لەوانە (پەیمانی بەغداد) لەساڵی ١٩٥٥ لەنێوان عێراق و تورکیاو پاکستان و ئێران و ئینگلتەرەو ئەمریکا، بەئامانجی خزمەت کردنی بەرژەوەندییەکانی ئەنگلۆ – ئەمریکی لە ناوچەکەداو بەربەرەکانیکردنی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی. ئومێدی لای گەلانی ژێردەستی وەك(بلوج و کورد)بڕی کە ئەمریکا وەك زلهێزێك بیر لە مافە ڕەواکانیان بکاتەوەو پشت گیرییان بکات. گەلی عێراق بەخۆی و بە حیزبە نەتەوەیی و نیشتمانییەکانەوە دژی سازکردنی ئەم پلانە وەستاو بەیاننامەی سیاسی حزبەکان بۆ گۆڕینی دەرچوو.

کاتێك میسر لەساڵی ١٩٥٦ کۆمپانیا(نۆکەندی سویسی) خۆماڵی کرد حکوومەتەکانی فەرەنساو بەریتانیا لەگەڵ ئیسرائیل هێرشێکی سێ قۆڵیان کردە سەر میسر. لەعێراقیشدا گەل ڕاپەڕی، بەڵام حکوومەتی نوری سەعید حوکمی عورفی بڕیارداو دەزگاکانی حکومەت ئەو پەڕی تۆقان و ئازاردان و دڵ ڕەقیان بەکارهێنا بۆدەمکوت کردنی گەل،و ژمارەیەکی زۆر لە هاونیشتمانان شەهید و گەلێکیشیان بریندار بوون، خوێندن لەزانستگاو قوتابخانەکاندا ڕاگیراو ڕۆژنامەکان خرانە ژێر چاودێری سوپاییەوەو سەرکردەکانی بزوتنەوەی نیشتمانی گیران و بەزەبری هێز ڕاپەڕینەکە دامرکێنرا. ئەم ڕاپەڕینەش وەك ڕاپەڕینەکانی پێشوو ڕۆشنبیران و خوێنەرانی کورد ڕۆڵی پێویستی خۆیان گێڕا.

شایانی باسە بارزانی و هەڤاڵانی کەئەو کاتە لەدوورە وڵاتی دا دەژیان(لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو) پشتگیری و پشتیوانی خۆیان بۆ هاوکاری گەلی میسر نیشاندا،کە ئەمەش بووە جێی ڕێزو پێزانین لەلایەن(جەمال عبدولناصر).

## ٤ - رۆڵی کورد له شۆڕشی١٤ای تەموزی ١٩٥٨:-

هێزو یاسای بەتەوژمی پاشایەتی عێراق بە ئەندازەیەکی زۆر گەلی عێراقی هێنا بۆ ژێر ئازارەوە. دەسەڵاتی یاسایی کۆنەپەرستی و دەرەبەگ کارێکی وەهای کردبوو کە کرێکار و ڕەنجدەر بیر لە ڕزگاری خۆیان بکەنەوە.

حوکمی دەوڵەتی (نوری سەعید) و (وصی عەبدولئیلا) و (مەلیك فەیصەل) پەردەیەکی ڕەشی زۆرداری بەسەر عێراق دا هەڵکێشابوو.زیندانەکان پڕکرابون لەئازادیخوازانی کوردو عەرەب.

بۆ چارەکردنی ئەو زۆردارییە (پارتی دیموکراتی کوردستان)، (حیزبی شیوعی)، (حیزبی ئیسقلال) لە هەموو لایەکەوە کەوتبونە تێکۆشانی نهێنی. بۆ ڕووخاندنی حکومەتی(نوری سەعید)، بەڵام ئەوەی کە هەستی پێ نەکرا وریابوونەوەی سوپا بوو کە لەلایەن سەرکردەی سوپای(عبدالكريم قاسم) پێکهاتبوو.

لەبەرەبەیانی١٤تەموزی ١٩٥٨ڕژێمی پادشایەتی لەعێراق ڕوخێنراو ڕژێمی کۆماری بەسەرکردایەتی عبدالكريم قاسم جێگای گرتەوە، گەلی کورد شان بەشانی عەرەب ڕۆڵێکی گرنگی لەشۆڕشەکەدا بینی، چونکە ڕێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخواز لەعێراقدا کە نەخشەی بەرپاکردنی شۆرشەکەیان دانا بوو ژمارەیەك لەئەفسەرانی ئازادیخوازی کوردی تێدا بەشدار بوون، هەروەها ژمارەیەك لە ئەفسەرانی ئازادیخوازی کورد لە بەرە بەیانی هەڵگیرساندنی شۆڕشەکەدا بەشداری چالاکیەکانی شۆڕشیان کردووە، لەهێرشکردن بۆ سەر بەغداو دەست بەسەراگرتنی دام و دەزگاکانی دەوڵەت و هەردوو کۆشکی پادشایەتی (الرحاب) و (الزهور) لەوانە رئیس (مستەفا عبدالله) و (عبدالفتاح شالی)، کە ئەندامی دادگای تایبەتی بوو، پاشان کورد بەیەك ئەندام، کەعەقید (خالید نەقشبەندی) بوو بەشداری لەئەنجوومەنی سەرکردایەتی کرد، کەلەسێ ئەندام پێکهاتبوو، هەروەها

وەزیرێکیشیان هەبوو،کە(بابەعەلی حەفید زادە) یان کردبە وەزیری ئابووری لەئەنجوومەنی وەزیران کە لە (١٠) وەزیر پێك هاتبوو.

هەروەها لەماددەی (سێیەم)ی دەستووری کاتی کۆماریدا هاتووە:(عەرەب و کورد هاوبەشن لەم نیشمانەدا ــ واتە لەعێراق)، پاشان شۆڕش لێبوردنی گشتی دەرکرد، بۆ هەموو ئەوانەی کە عێراقیان لە سەردەمی پاشایەتی جێ هێشتبوو، ئەوەبوو بارزانی هەڤاڵانی گەیشتنەوە عێراق پاش ئەوەی (١١) ساڵیان لەیەکێتی سۆڤیەتی پێشوو دوور لە وڵات بردە سەر، هەروەها شۆڕش ڕێزی لەو چوار ئەفسەرە کوردە نا، کەڕژێمی پادشایەتی لە ١٩حوزەیرانی ١٩٤٧ لەسێدارەی دان، ئەوانیش چوار شەهیدەکەی ڕێگای ڕزگاری و سەربەخۆیی کوردستان(خەیروڵڵا عەبدولکەریم و مستەفا خۆشناو و عیزرەت عەبدولعەزیز و محەمەد مەحمود قودسی).

## ب – شۆڕشی ئەیلولی١٩٦١ لە باشووری کوردستان:

هەرچەندە گەلی کورد پشتیوانییەکی گەورەی لەشۆڕشی ١٤ی تەموزدا کردو، توانی ببێتە فاکتەرێکی سەرەکی ڕووخاندنی ڕژێمی پادشایەتی و هێنانە سەرکاری ڕژێمی کۆماری، تەنانەت بارزانی و هەڤاڵانی دوای گەڕانەوەیان لەیەکێتی سۆڤیەت دڵسۆزی و پشتگیری خۆیان و گەلی کوردیان جارێکی تر پیشان دا، بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو کۆنەپەرستان و ڕەگەز پەرستان سەریان بەرزکردەوە و کەوتنە دژایەتی گەلی کوردو بانگەوازی توانەوەی گەلی کوردیان بڵاوکردەوە، حکومەتی عەبدولکەریم قاسمیش کەوتە پیادەکردنی سیاسەتێکی دوور لە ڕێبازی شۆرشی١٤تەموز، وەك کار نەکردن بەماددەی سێ یەمی دەستووری کاتی عێراق و هەوڵدان بۆ بێ بەشکردنی کورد لەگەیشتن بە مافەڕەواکانی خۆی.

سەرەتا حکومەت ئەفسەر و پلەدارەکانی کوردی لە سوپا دوور خستەوە، فەرمانبەرە کوردەکانی لەشوێنە گرنگ و دام و دەزگاکانی حکومەت دالابرد، هەروەها پشتی ئەو خێڵانەی گرت کە لەگەڵ بارزانی دا ناکۆك بوون و پرچەکی کردن، ئەمانە هەمووی بوونە ئاڵۆز بوونی پەیوەندی نێوان بارزانی و عەبدولکەریم قاسم. بارزانی هەولێکی زۆری دا، کەپەیوەندی لەگەڵ حکومەت دا بەگشتی و لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم بەتایبەتی،ئاسایی بکاتەوە، بەڵام بێ سوودبوو، چونکە عەبدولکەریم قاسم سوور بوو لەسەر سیاسەتی خۆی، بۆیە سەرەتای مانگی مارتی١٩٦١بارزانی بەغدادی بەجێهێشت و گەڕایەوە(بارزان).

عەبدولکەریم قاسم سەندیکا پیشەیی و قوتابییان و لاوان و ئافرەتان و دەزگاکانی بڵاوکردنەوەی کوردی و ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی داخست، لەوانە

ڕۆژنامەی (خەبات) کەزمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، هەروەها پارتی کە پارتێکی مۆڵەت پێدراوی ڕەسمی بوو، چالاکیەکانی قەدەغەکراو، بارەگاکانی داخران.

عێراق لەسەرەوە بۆ خوارەوە بەئاگری فیتنەو هاندانی وڵاتانی دەرەوە سەری لێ شێوابوو.حکومەت کەوتە گرتنی کادێرو ئەندامانی پارتی،پارتییش بە ناچاری خەبات و تێکۆشانی لەباری ئاشکراییەوە گواستەوە بۆ نهێنی و کەوتە وشیارکردنەوەی جەماوەر،دەست کرا بەکڕین و کۆکردنەوەی چەك، حکومەتیش ئەو هێز و خێڵ و کەسانەی پڕ چەك کرد، کەئامادەبوون بەگژ شۆڕشگێڕاندا بچنەوە، پاشان پارتی پەیوەندی بەهێزە نیشتمانیەکانەوە چ لەناو عێراق و چ لەدەرەوە کرد بۆ ئەوەی گشت لایك هەوڵ بدەن کە شەڕ لەکوردستان هەڵ نەگیرسێت. لە (٢٠) تەموزی ١٩٦١مەکتەبی سیاسی پارتی یاداشتێکی مێژوویی دا بە قاسم و داوای لێکرد پێش ئەوەی کارلەکار بترازێ بەگیانێکی برایانەوەچارەسەری بارودۆخی کوردستان بکرێت،بەڵام یاداشتەکە بایەخی پێ نەدرا. لە ٦ ئەیلولی ١٩٦١ لە شارەکانی کوردستان بڕیاری مانگرتنێکی گشتی درا بە بۆنەی ڕۆژە ڕەشەکەی (٦)ی ئەیلولی (١٩٣٠) لەسلێمانی کە بە ڕاپەڕینی بەردەرکی سەرا بەناوبانگە.

لە ڕۆژی ١١ ی ئەیلولی ١٩٦١ لەهەموو ناوچەی کوردستان لەنێوان هێزی حکومەت و عەشایر و حیزبی بوو بە شەڕ. پێشمەرگەش چوونە ناو سەنگەرەکانی خاکی کوردستان، هێزی میری بەتانك و فڕۆکە و تۆپ و چەکی تازە پەلاماری سەنگەرەکانی داو بۆ ئەوەی ڕێگابکاتەوە کەهێزی میری پێدا بڕوات چەند سەعات بەم ئاگر بارانە بە ناپاڵم وتانك و تۆپ

لەگەڵ هێزی پێشمەرگە شەڕخایاندی لەئاکاما لەبەر ئەوەی هێزی پێشمەرگە و حکومەت وەك یەك نەبوون لەڕووی چەکەوە ناچار لەناوچەی دەربەندی بازیان و دەربەندیخان ئەو ڕێگایە بەرەڵلاکەن و بکشێنەوە. هەروەها لە ناوچەی هەولێر لەبەر ناشارەزایی و نەبوونی هەواڵگری نەیانزانی بوو کەمیری بەرەو کوێ دێ چ لە هەولێر و چ لە قۆڵی کەرکوکەوە تەنیا بەوە ڕاگەیشتن کە بکشێنە دواوەو خۆیان دەربازکەن. لەقۆڵی بارزانیشەوە پەلاماری مەلا مستەفا درا بەپاڵپشتی فرۆکەوە ناوچەی بارزانیان هەموو ئاگردا. شەڕ هەموو ناوچەیەکی کوردستانی گرتەوە وپێکدادان بەدرێژایی ساڵانی ١٩٦٢بەردەوام بوو هەر هەلێکیان بۆ هەڵ کەوتایە پەلاماری هێزی حکومەتیان ئەدا لەدێ و قەزاو ناحیە و زیانیان لێ ئەدان.



وێنەی مەلا مستەفا بارزانی

## * چۆنیەتی هاتنی بەعس بۆ سەر حوکم و هەوڵدانی بۆ سەرکوتکردنی نەتەوەی کورد :

سەرەتای بیرۆکەی بەعس و دامەزراندنی لە ١٩٤٧ لە سوریا بوو، دوای ئەوەی ڕەگی داکوتا دەستی بەگەورەبوون و فراوانبوون کرد، هەرێمی عێراق یەکێك لەو هەرێمانەی کەحزبەکەی تێدا هاتە کایەوەو پەیوەنییان لەگەڵ سەرکردایەتی حیزبەکەی هەرێمی سوریا دا هەبوو، لەساڵی ١٩٥٢بوو بە لق و لەکۆتایی ساڵی ١٩٥٤ کۆنفرانسی هەرێمایەتی حیزبەکە گیرا.

شۆڕشی ١٤تەموزی١٩٥٨زەمینەیەکی باشی بۆ بەعس ڕەخساند لەسەرەتا هەموو حیزبەکان بەئاشکرا چالاکی خۆیان ئەنجام دەدا.

لە ڕۆژی ٨ مارتی ١٩٥٩لە موصڵ هەڵگەڕانەوەی (عبدالوهاب شەواف) عەقیدی سوپای(٥) پێك هات و کوشتارێکی زۆر لەسوپا و دانیشتوانی موصل ڕووی دا، بەڵام حکومەتی قاسم توانی(شەواف) بکوژێ و بەشێك لەهاوڕێکانی بگرێ.

لە ساڵی ١٩٥٩بەعسیەکان لە شەقامی ڕەشید لەلایەن (عبدالوهاب غریری و صدام حسین) تەقەیان لەعبدالکریم قاسم کرد و بریندار کرا.

ڕۆژی١٩٦٣/٢/٨ عبدالسلام عارف بەهاوکاری بەعسیەکان هەڵگەڕانەوەیەکی ئەنجام دا (ئەحمەد حەسەن بەکر) کرا بەسەرەك وەزیران. عبدالکریم قاسم یان گرت و کوشتیان.لیژنەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان بروسکەی پشتگیریان نوسی بۆ (عبدالسلام) بەو مەرجەی کە لە گەڵ کورد ڕێگەی ئاشتی و دۆستانە بگرێتە بەر. ڕێککەوتن لەلایەن مەلامستەفا و عبدالسلام عارف پێکهات و بەیانێك بڵاوکرایەوە کە حکومەتی عێراق

شێوەیەکی لامەرکەزی بۆ میللەتی کورد لە عێراق پێك دێنێ لەچواردە مادە ڕێکخرا لەوانە:

١- نیوەی داهاتی نەوت بدرێ بە کورد.

٢- لامەرکەزی کورد لەهێڵی (چیای حەمرین)ەوە دەست نیشان بکرێ.

٣- سەربازو پۆلیس و کاربەدەستی ئیداری کورد بن.

٤- زمانی کوردی بەڕەسمی دابنرێ.

لە بەهاری ساڵی ١٩٦٣ شاندێکی شۆرش بە سەرکردایەتی مام جەلال بە ئەندامیەتی صالح یوسفی و حبیب محەمەد کەریم و شاخەوان نامیق وە عبدالحسین فەیلی و صەمەد محەمەد و مسعود محەمەد گەیشتە بەغدا. جگە لە یاداشتەکەی سەرەوە لەو ماوەیە قسە لەسەر یەکگرتنی عێراق و میسر و سوریا دەکرا، بۆیە لەو یاداشتە کەلەلایەن سەرۆکی شاندەکەوە ئاراستەی کۆبونەوەکانی قاهیرە کرا کە بۆمەبەستی ناوبراو کۆبوبوونەوە، ئەم بەندانە هاتوون:-

١- هەر وەختێك عیراق لەگەڵ سوریا و میسر یەکێتی کۆمارییان بەست، شێوەی عێراق خرایە سەر باری(هەرێمایەتی)، کورد بۆی هەبێ داوای جیابوونەوە بکات و، بە لامەرکەزیەت ڕازی نابێت، کوردیش لەو وەختە دا بەشێوەی هەرێمی (چوارەم)، بەسەربەخۆیەتی خۆی دێتە ناو یەکێتی عەرەبی و کۆماری یەکگرتوو.

٢- کورد هەر هێندە بەلامەرکەزیەت ڕازییە کە عێراق سەربەخۆ بێ و پەیوەندی یەکێتی لەگەڵ میسرو سوریادا نەبەستێ.

ڕێکەوتنی میسر و سوریا و عێراق، بەسەرهاتی کوردو ڕێکەوتنەکەی پاش خست لەهەموو کوردستان چاوەڕوانی ڕێکەوتنی حکومەت و پێشمەرگەیان ئەکرد بەلاّم هیچ ئەنجامێکی لەیاداشتەکەی مام جەلال و

شاندەکەی چنگ نەکەوت، حکومەتی عێراقی فەرمانی گرتنی شاندی یاداشتەکەی دەرکرد. لەهەمان کات دا بەیانی ژمارە (١،١٣) بڵاوکردەوە کە باکوور ناوچەی جموجۆڵی سەربازی یە، مەلا مستەفاو هاوەڵانی ئەبێ هەتا ٢٤ کاژێردا چەك فرێ بدەن و خۆیان بخەنە بەردەستی حکومەت. لەهەمان ساڵ دا حکومەتی عبدالسلام بڵاوی کردەوە، هەرکەسێ مەلا مستەفا بکوژێت ١٠٠ هەزار دیناری خەڵاتی دەدرێتێ. حکومەت دەستی کرد بەگرتن و کوشتن و بەتۆپ و ناپاڵم دێهاتەکانی سوتاند هەر لەسلێمانی ٣٠٠ کەسی بەبێ پرسیاری دادگا کوشت و باقی بەندکراوەکانی تریش بەلێدان و لەناو تەوێلەی وڵاخ و جێگای پیس بۆ ماوەی دوو مانگ ئەشکەنجەیان ئەدان، زۆربەی دانیشتوان ڕوویان کردە شاربازێر و قەرەداغ بۆ ڕزگاربوون لەدەست زەعیم صدیق.

هەروەها لەقۆڵی کۆیەو هەولێریش پێشمەرگەکان کە ژمارەیان لە ٦٠ کەس تێنەدەپەڕی قارەمانییەکی بێ وێنەیان بەرامبەر هێزێکی گەورەی سەربازی و (حەرەس قەومی) و هێزە خۆ فرۆشەکان نواند، ئەمجا حکومەتی عێراق کە هیچ چارەیەکی نەما لەگەڵ حکومەتی سوریا یەکی گرت، لیوایەکی سەربازی سوری بەهەموو کەرەسەیەکی جەنگی هێنایە کوردستان، بەڵام پێشمەرگە قارەمانەکانی کورد لەقۆڵی زاخۆ و ئاکرێ و ئامێدی پەلاماریان دان دەستیان کرد بە کوشتار و گرتنیان، حکومەتی عبدالسلام سەری لێ شێواو ئەم بێ هێزی و تەکانەی خۆی بەهی حکومەتی بەعس دەزانی لەنێوان ئەحمەد حەسەن بەکر و سەرەك ئەرکانی سوپا بوو بەقرەو (میشیل عەفلەق)یان لە سوریا هێنایەوە بۆ چارەسەری ئەو ناخۆشییە کۆنگرەی لوتکەی عەرەبی لە میسر بەسترا بەسەرهاتی کورد خرایە بەرچاو لەو کاتەدا دەرگای گفتوگۆ کرایەوە لە١٩٦٤/١٢/١٤ لەنێوان

حکومەت و مەلا مستەفا ڕێکەوتن پەیدابوو بڕیاری ڕاگرتنی شەڕ بڵاوکرایەوە.

لە ١٩٦٦/٤/١٣ عبدالسلام لەگەڵ موتەسەریفی بەسرە لەناوچەی (قورنە)وە ئەچن بۆ بەسرە لەئاسماندا فرۆکەکەی ئاگری تێبەرئەبێ و ئەسووتێ، ئەمەش وا پێ ئەچێ پیلانی بەعسیەکان بووبێ، چونکە کەوتە وێزەی ئەوان بەکوشتارێکی زۆر گەورە بەعسیەکانی چەك کردو کۆتایی بەجموجۆڵیان هێنا.

لە١٩٦٦/٤/١٤عبدالرحمن عارف دەسەڵاتی گرتە دەست تا ١٩٦٨، وەفدی وتووێژ گەیشتە لای مەلامستەفا دوای گەڕانەوەیان بۆ بەغداد وتیان: مەلا مستەفا کاتێك ئامادە دەبێ بۆ گفتوگۆ کردن (دانوستان) کە حکومەت ئەم چواربەندەی خوارەوە پێشەکی پێك بهێنێ:

١- کشانەوەی هێزەکان لەکوردستان دا.

٢- هەرچی بەندکراوی سیاسی کورد و عەرەب هەیە ئازاد بکرێن.

٣- فورسان چەك بکرێن.

٤- دەوڵەتێك لە دەوڵەتەکانی عەرەب بێنە ناو ئەو ڕێکەوتننامایە.

ئەمجا حکومەت نائومێد بوو کەوا بەسادەیی مەلا مستەفا نایەتە ناو ریزی ڕێکەوتن، چەند لیوایەکی سەربازی ناردە سەر مەلامستەفا، لەناوچەی ڕەواندز بوو بەشەڕێکی گەورە بەڕۆژ و بەشەو فڕۆکەکانی بۆمباهاوێژ بەجۆرەها چەك و بێ بەزەییانە ناوچەکەیان ئەسووتان، بەڵام هێزی پێشمەرگە هیچ سڵێکی لەو هەموو پەلاماردانە نەئەکرد لەچیای هەندرێن فەوجی ( ١) لیوای (٤) لەگەڵ هێزێکی تەواوی چەکداری هۆزەکان بەهەموو جۆرە چەکێکەوە بە دیل گرت. ئەو سەرکەوتنەی پێشمەرگە بوو

بەهۆی شێواویەکی زۆر گەورە لە نێوەندەکانی رامیاری و رای گشتی جیهانیدا.

لەمانگی تشرینی یەکەمی ١٩٦٦دا عبدالرحمن عارف چوو بۆ ڕەواندز چاوی بە مەلامستەفا کەوت هەندێ بەڵێنی پڕ لە درۆ لەعبدالرحمن عارف وەرگیرا. بەڵام لە هەموو بەڵێن و پەیمانانەی کەلەگەڵ عبدالرحمن عارف پێك هاتبوو چەند زیندانیەك ئازاد کران، لەگەڵ گێڕانەوەی چەند مووچەخۆرێك بۆ سەر ئیشەکانیان.

لە ڕۆژی١٧/٧/ ١٩٦٨ دا ئەحمەد حەسەن بەکر کۆنە سەرۆك وەزیرانی عێراقی دەوری عبدالسلام کودەتای کرد، عبدالرحمن عارف سەرۆك کۆماری گرت و ناردی بۆ لەندەن. خۆی بە سەرۆك کۆماری عێراق ناونا، بەپێ ی بڕیاری ئەنجومەنی شۆڕشی خۆیان،عبدالرزاق نایفی کرد بە سەرۆك وەزیران و ئەنجومەنی وەزیرانی پێك هێنا،چوار وەزیری کوردیان خستە ناو ئەم وەزارەتە لەوانە(ئیحسان شێرزاد) و (عبدالله نەقشبەندی) و (صالح نەقشبەندی) و (محسن دزەیی)، بەڵام ئەم وەزارەتە خۆی نەگرت لە ٣٠تەموزی ١٩٦٨بەسەر عبدالرزاق نایف دا کودەتا کرا، لەلایەن بەعسیەکانەوە ئەوەبوو ڕووی کردە میسر، و صدام حسین دەبێتە خاوەنی دەسەڵاتی رەها.

جارێکی تر بەعسیەکان شەڕیان هەڵگیرساندەوە دژی کورد، لەشکستی زیاتر هیچیان دەستگیر نەبوو بەناچاری لە ١١ئازاری ١٩٧٠ بڕیاریان دا بەبەخشینی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد و ماوەی چوارساڵیان دانا بۆ جێ بە جێ کردنی، لەوماوەیەدا بەعس کەوتە خۆبەهێزکردن و پلان گێڕان بۆ لەناوبردنی سەرکردەی کورد. لە ١٩٧١/٩/٢٩ یانزە مەلا لەنەجەف و بەغداوە هاتبون کەچاویان بەمەلا مستەفا بکەوێ لەحاجی ئۆمەران،

مەلایەکیان دەزگایەکی لەپشتی بەستبوو دوو ئەفسەری بەعس کە مەلاکانیش نەیان ناسیبوو تیرۆری بارزانی پێ سپێرا بوو، دوو ئۆتۆمبێلی تۆیۆتاش کە دوو بۆمبی زۆر درێژ و ئەستووری لەبن قایم کرابوو تەقیەوە، خۆشبەختانە پلانی بەعس سەری نەگرت و بارزانی تەنها بریندار بوو. بەهۆی پاشگەزبوونی بەعس جارێکیتر جەنگ هەڵگیرسایەوە لەنێوان کوردو دەوڵەتی عێراق دا کەوەخت بوو بەسەرکەوتنی شۆڕشەکە کۆتایی بێت،لەدەرئەنجام صدام لەگەڵ شای ئێران(ڕێکەوتن نامەی جەزائیر لەئازاری/١٩٧٥) بەناوبژیوانی جەزائیر بەست، دەستی لەهەندێك شوێن و ئاوی عێراق لە شط العرب هەڵگرت  بۆ ئێران، ئێرانیش بەپێی ئەو ڕێکەوتننامەیە و لە بەرژەوەندی خۆی گشت جۆرە یارمەتییەکی لە شۆڕش بڕی و بەسەرکردایەتی شۆڕشی وت: یان بچنە ئێران وەك پەنا هەندە دانیشن یان ئەوان سنور دادەخەن و لەناو عێراق دا ئەوان چی دەکەن پەیوەندی بە ئێرانەوە نییە. بەم پلانە نێودەوڵەتیە شۆڕشی ئەیلول شکستی هێنا.

### ج – سیاسەتی پاکتاوکردنی کورد لەسەردەمی ڕژێمی بەعسدا:

بارودۆخی شکستی شۆڕشی ئەیلول زەمینەیەکی باشی بۆ ڕژێمی بەعس خۆشکرد تا ڕەفتاری فاشیانەی خۆی بەشێوەیەکی دڕندانە لەکوردستان ئەنجام بدات، بەهۆی دەیان هەزار پیاوانی ڕژێم و بەپارەو پولێکی زۆر و بەنەخشەی وردو لێبڕوانە کەوتە هەوڵدان بە قەلاچۆکردنی میللەتی کورد بەم شێوەیەی خوارەوە:

## یەکەم – بە عەرەب کردن (تەعریب):

**ئەویش بە چەند ڕێگایەك:–**

١– دەربەدەرکرن و دەرکردنی هاووڵاتیان لەشوێنەکانیان بەتایبەتی لەناوچە سنوورییەکانی کوردستان لەگەڵ عێراقی عەرەبیدا و نیشتەجێ کردنی عەرەب لە شوێنیان دا، وەکو ناوچەکانی خانەقین و کەرکوك و شەنگال و زۆر شوێنی تر.

٢– گۆڕینی ناسنامەی نەتەوایەتی: لەژێر فشاری هەڕەشەو دەربەدەرکردندا زۆریان بۆ خەڵکی دەهێنا خۆیان بەعەرەب ناونووس بکەن، پێناسەی کوردیان لێ بستێننەوە، وەکو ئێزیدیەکان و شەبەك وگەلێك لەخێزانەکانی خانەقین و گەرمیان.

٣– لابردنی خوێندنی کوردی لەقوتابخانەکان دا و هاندانی دەست و پێوەندەکانیان تا منداڵەکانیان بخەنە بەر خوێندنی عەرەبی.

٤– داخستن و لابردنی دەزگای زانستی و ڕۆشنبیرییەکان وسڕینەوەی کەسایەتی سەربەخۆی هەندێکی تریان وەکو زانکۆی سلێمانی، کۆڕی زانیاری کورد، یەکێتی نووسەرانی کورد.

٥– لکاندنی ڕێکخراوە پیشەییەکان بەڕێکخراوە عەرەبیەکانەوە، وەکو یەکێتی مامۆستایان و قوتابیان و ئافرەتان و کرێکاران و هتد...

٦– هاندانی ژن و ژنخوازی لەنێوان کورد و عەرەب دا،وەتەرخانکردنی پارەیەکی باش بۆ ئەو مەبەستە،کە بێتۆمان ئەنجامەکەی بەعەرەبکردن دەشکایەوە، چونکە عەرەب ڕەگەزی گەورەو سەرکەوتووبە دەسەڵات بوو، کوردیش ڕەگەزی بچووك و بێ دەرەتان.

## دووەم – بە بەعس کردن (تەبعیس):

ئامانجی بەعس لە بەرنامەکەیدا، ڕوون و ئاشکرایە ئەویش تێکۆشانە بۆ هێنانە دی ئاواتی نەتەوەی عەرەب لەیەکێتی و سەربەستی و سۆشیالیستیدا کە دروشمی ناوەندی حیزبی بەعسە، هەروەها ئەو کەمینەی نەتەوایەتیانەی لەپاڵ عەرەب دا دەژین بیانەوێ و نەیانەوێ لەڕەگەزدا عەرەبن یان پێویستە بکرێن بەعەرەب.بۆ ئەم مەبەستەش ڕژێمی بەعس گەلێك ڕێگای دۆزی یەوە تا ئامانجەکانی بێتە دی:

١- خەڵکی نەفام و ساویلکەو ڕوخسار بەپارە و پاداشت بیێ، یان بەهەڕەشە دەکران بەبەعسی بەپێی بەرنامە ، فەلسەفەو ڕێبازی بەعسیان فێردەکەن.

٢- وەرگێڕانی هەموو ئەو نووسینانەی نووسەرانی شۆڤینی عەرەب و بەعس دەریان دەکرد بەخۆڕایی یان بەهەرزان بەناو خەڵکیدا بڵاودەکردەوە.

٣- لەبواری پەروەردە و فێرکردندا سەرانسەری بەرنامەکانی خوێندیان گۆڕی و بەڕاو بۆچوونی بەعسیانەی خۆیان پڕیان کردەوەو نوسینەوەی مێژوویان سەر لە نوێ ڕاگەیاند، ناوی کوردستانیشیان لەهەموو شوێنێکدا کوێر کردەوە هەموو سەروەرییەکیان بەعەرەب بەخشی.

## سێهەم – وێرانکردنی شاروشارۆچکەو دێهات:

سیاسەتی (زەوی سوتاو) لەکوردستاندا لەلایەن فاشیەکانەوە پیادە کرا نزیکەی (٥٠٠٠) گوندیان کاول کرد باخ و کێڵگە و دارستانەکانیان سووتاند و سەرچاوەکانی ئاویان کوێر کردەوە و لەگەڵ زەویدا تەختیان کرد بەزیاتر لە(٢٠) ملیۆن مین کوردستانیان چنی.

## چوارەم – ڕاگوێزان (تەرحیل وتەهجیر وتەسفیر):

١– بەهەزاران مووچەخۆر لەمامۆستاو کارگێڕ و ئەفسەر و پۆلیس ئەوانەی بۆنی کوردایەتیان لێ دەهات گوێزرانەوە بۆ ناوچە عەرەب نشینەکان و دەربەدەرکران و خرانە ژێرچاودێری دام و دەزگاکانی بەعسەوەو لەشوێنەکانیان دا عەرەب و بەعسیان دانا.

٢– بەسەدان هەزار لە گوندنشینەکان لە شوێنەکانی خۆیان ڕاگوێزران و لەسەر کاروپیشەی خۆیان لەسەر خاك و وڵاتی خۆیان هەڵکەندران و بەرەوخوارووی وڵات و کۆمەڵگا زۆرەملێیەکان گوێزرانەوە.

٣– زیاتر لە نیو ملیۆن کوردی فەیلییان لەسەر زێدی بابوباپیرانیان گواستەوە بۆ سەر سنورەکانی ئێران بەبیانووی (التبعیة الایرانیة) و ڕەگەزنامەی عێراقیان لێسەندنەوەو دەستیان گرت بەسەر هەموو ماڵوموڵکیان، ئەمەش لەمێژوودا بە(تەسفیرکردنی کوردانی فەیلی) ناسراوە.

## پێنجەم– کۆمەڵگای زۆرەملێ:

لەو شوێنانە دا کە دەتوانرێت بە ئاسانی چاودێری بکرێن و دەستی بەسەردا بگیرێ ڕژێم چەند کۆمەڵگایەکی دروست کرد گوندنشینەکانی تیا کۆکردەوە، ئەم کۆمەڵگایانە ناویان لێ نابوون (شاری هاوچەرخ) کە لەڕاستیدا لەو سەربازگایانەی کە هیتلەر دروستی کردبوون گەلێك خراپتر بوون خەڵکی ناو ئەم کۆمەڵگایانە بێ ئیش و کار مابوونەوە، ڕژێم بەمەبەست برسیەو ڕیسوای دەکردن، تا خۆیان هانای بۆ ببەن و بۆ کوێ بیەوێ بیان گوێزێتەوە.

مەترسی ئەم کۆمەڵگایانە لەم ڕووەوە بوو:

أ- **سەربازی:** هیچ کەسێك دەرفەتی دەرچوون یا ڕاکردنی نەبوو.

ب- ڕامیاری **(سیاسی):** بەعسیەکان بەزۆرتێیان کەوتبون دەیانکردن بەبەعسی بەتایبەتی منداڵەکان.

ج- **کۆمەلایەتی:** کورد هەرگیز بەتایبەتی گوندنشین ڕانەهاتبوو لەشوێنی وادابژی بۆیە هەرزوو کێشەی کۆمەلایەتی ترسناك لەناویاندا بلاوبوەوە.

د- **تەندروستی:** ئەم کۆمەڵگایانە نە ئاوی هەبوو نەئاوەڕۆ سەرەڕای نەبوونی خەستەخانەو پزیشك و دەرمان و کوتانی منداڵان لەبەرئەوە نەخۆشی ترسناك وەکو ئاگر و پوش لەناویاندا بلاودەبۆوە.

## شەشەم: ئەنفالی کورد یان قڕکردنی بە کۆمەڵی مرۆڤ (جینۆساید)

ئەنفالیش یەکێکی ترە لەو سیاسەتە نامرۆڤانەی ڕژێمی بەعس بەرامبەر بە کورد بەمەبەستی قڕکردنی میللەتی کورد. بۆ ناسینی ئەنفال پێناسەی ڕێکخراوی (میدڵ ئێست ووچ)* دەهێنین کە دەڵێت: (( ئەنفال ئەو ناوە بوو کەبە زنجیرەیەك هێرش و پەلاماری چڕو پڕی سەربازی درا ، کە سەرجەم هەشت پەلامار بوو و لە شەش ناوچەی جوگرافی جیاوازدا بەڕێوە چوو ، لە نێوان کۆتاییەکانی مانگی شوبات و سەرەتای مانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٨٨زدا فەرماندەی گشتی پرۆسەکە لە دەستی نووسینگەی باکوری ڕێکخراوی حیزبی بەعسدا بوو، کەوا بنکەکەی لەشاری کەرکوك بوو لە مارتی ١٩٨٧ بەدواوە لەلایەن عەلی حەسەن مەجیدەوە سەرۆکایەتی

---

* *ڕێکخراوێکی مافی مرۆڤی ئەمریکییە و لقێکە لە ڕێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤی ئەمریکی کە بارەگاکەی لە شاری نیویۆرکە.

دەکرا.)) شایەنی باسە دانیشتوانی ئەو گوندانەی لە ڕووداوەکانی ١٩٨٨ ڕزگار بوون وەکو هەموو خەڵکی کوردستان بە شێوەیەکی ڕۆتینی عەلی حەسەن مەجید بە (عەلی ئەنفال) یان (عەلی کیمیایی) ناو دەبەن، بەڵام دکتۆر ئازاد محەمەد ئەمین نەقشبەندی پرۆفیسۆر لە زانکۆی سەلاحەدین دەڵێت: (بە بۆچونی ئێمە شاڵاوەکانی ئەنفال تەنها بریتی نین لە هێرشە سەربازییەکانی ڕژێمی عێراق بۆ سەر گوندەکانی کوردستان و هێزی بەرگری کوردی، بەڵکو ئەنفال پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی چەند لایەنەیە کە بە کاولکردنی هەزاران گوندی کوردی دەستیپێکرد کە دانیشتوانی دوای هێرشە سەربازییەکان بە هێرشی کیماویشەوە،کۆکرانەوەو بۆ کەمپەکان گوێزرانەوە. دواتر لە کەمپەکانەوە پرۆسەی پۆلێنکردنی گیراوەکان دەستیپێکرد و بۆ شوێنی جیا جیا گوێزرانەوە. ژن و منداڵیان لە کەمپی تایبەتیدا دەستگیر کرد، پیرەکانیان بەرە و کەمپ و زیندانەکانی باشووری عێراق نارد ئەوانەی تەمەنیشیان لە نێوان (١٥–٥٠)ساڵیدا بوو بۆ مردن نارد. گروپی (کوشتنی بە کۆمەڵ– فرق الاعدام) لە نزیك ئەو گۆڕانەوە کە پێشتر ئامادەکاربوون بە شێوەیەکی یەکجار نهێنی دانرابوو بۆ کوشتنی زۆرترین ژمارە لە نێرینەکان وشاردنەوەیان لەو گۆڕە بە کۆمەڵانە بە شێوەیەك هیچ شتێك دەربارەی چارەنووسیان نەزاندرێت.

### * هۆکارەکانی ئەنجامدانی شاڵاوەکانی ئەنفال:

١ – بایەخی جیۆپۆلەتیکی هەرێمی کوردستان کە بایەخێکی جیۆپۆلەتیکی تایبەتی هەیە، بەرادەیەك وای لێکردووە ببێتە گۆڕەپانی شەڕو ململانێی ڕژێمەکان لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە ئەم بایەخە بۆتە هۆی هەوڵدان بۆ لەناوبردنی نەتەوەی کورد.

٢- تێكدانی هاوسەنگی تەمەن لە نێوان گەنجی كورد و گەنجەكانی ناوەڕاست و باشوری عێراق . بەڵگە نەویستە شەڕی چەكدارانە هۆیەكی كاریگەرە بۆ كەمكردنەوەی ژمارەی دانیشتوان، بەتایبەتی هێزی بەرهەم هێنی ئابووری و مرۆیی لەهەر وڵات و هەرێمێكدا، هەڵبەتە ئەم هێزەش توێژی گەنجەكان دەگرێتەوە بەهەردوو رەگەزی نێر و مێیەوە، ئاشكراشە ئەوانەی لەشەڕ بەشداری دەكەن و دەكوژرێن رەگەزی نێرن.

٣ - دابڕینی بەشێك لە جوگرافیای عێراق لەلایەن هێزی پێشمەرگەی كوردستانەوە، بۆ نموونە زۆربەی ناوچە شاخاویەكانی كوردستان كە ناوچەی سەخت و یاخین بۆ بەرەنگاری و شەڕ لە بەرژەوەندی پێشمەرگە دابوو. ئەم ناوچانە بەزۆری لە ژێر كۆنترۆڵی هێزی پێشمەرگە بوون و هێزی سوپای عێراقی لێوەدەرنرابوو، بۆیە حكومەتی عێراق مافێكی یاسایی شەرعی بەخۆی دەدا بۆ گرتنەوەیان.

٤- نەتەوەی كورد لەلایەن رژێمەكانی عێراقەوە وەك كۆسپ و رێگرێك لەبەردەم یەكێتی نەتەویی عەرەب بینراوە، بە بیرو بۆچونی بڕیاردەرانی سیاسی و سەربازی یان كێشەی كورد لە عێراق مەترسیە لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی عێراق و عەرەب، بۆیە تا بۆیان بكرێ بە هەموو جۆرێك هەوڵی تواندنەوە و لەناوبردنی ئەم مەترسیە دەدەن، شاڵاوەكانی ئەنفال یەكێكە لەو هەوڵانە كە تێیدا سیاسەتی تواندنەوە و وێرانكردن گەیشتە ئەوپەڕی.

٥- بارودۆخی سەربازی و سیاسی ئەوسای كورد و عێراق یاریدەدەر بوو.((پۆست هێلتەرمان)) كە ئەندامی رێكخراوی (چاودێری مافی مرۆڤی) ئەمریكیە وای بۆ دەچێت: ئەگەر كۆمەڵگای نێودەوڵەتی یارمەتی سیاسی و سەربازی و دارایی حكومەتی عێراقی نەدایە، شاڵاوەكانی ئەنفال بەم شێوەیە پیادە نەدەكرا.

٦- سایكۆلۆجیەتی سەركردایەتی حكومەتی عێراق و فەرهەنگە سیاسیەكەی سەرانی رژێمی عێراقی لەبەر گەلێی هۆی كۆمەڵایەتی و سیاسی و سەربازی هەر لە سەرتاوە عەقلیەتێكی شەڕخوازانەیان بۆ دروست بوو ئەمەش وای كرد كەسەر لەبەری مێژووی حوكمرانیان خوێنای بێت.

## * جوگرافیای قۆناغەكانی شاڵاوەكانی ئەنفال:

ئەنجامدانی شاڵاوەكانی ئەنفال لەلایەن رژێمی بەعسەوە پێشتر بەرنامەرێژی بۆ كردبوو، پێش وەختیش سەردانی ناوچەكانیان كردبوو لەپێناوی كۆكردنەوەی زانیاری دەربارەی ناوچەكان ورێخۆشكردن و دانانی نەخشە بۆ ئەنفال. شاڵاوەكانی ئەنفالیش بە هەشت قۆناغی جیاجیادا ئەنجامیدا بەم شێوەیە:

**قۆناغی یەكەم یان ئەنفالی یەكەم:** (ئەنفالی دۆڵی جافایەتی):دوای ئەوەی حكومەتی عێراقی لە ١٧ی تشرینی یەكەمی ١٩٨٧ ئاماری دانیشتوانی عێراقی ئەنجامدا لە پاش چوار مانگ یەكەم قۆناغی ئەنفالی لە كوردستاندا لە شەوی ٢٣ی شوباتی ١٩٨٨ دا لە دۆڵی جافایەتی دەستپێكرد كە شەم ناوچانەی گرتبۆوە. (دوكان، بنگرد، چوارتا، قەڵاچوالان، سەرچنار، سورداش، زێی بچووك، ئەزمەر، سوسێ، ماوەت، سەرگەڵو، بەرگەڵو) وە لە ١٩٨٨/٠٣/١٨دا كۆتایی پێهات.

**قۆناغی دووەم یان ئەنفالی دووەم:** ئەنفالی ناوچەی قەرەداغ لە ٢٢ی ئازاری ١٩٨٨ تاوەکو ١ی نیسانی ١٩٨٨: ئەنفالی دووەم ئەم ناوچانەی گرتەوە:(چیای گڵەزەردە، بازیان، قەرەداخ، دەربەندیخان، زەرایەن، عەربەت).

**قۆناغی سێیەم ئەنفالی سێ:** ئەنفالی گەرمیان کە لە ٧ی نیسانی ١٩٨٨ تا ٢٠ی نیسانی ١٩٨٨ بوو.




نەخشەی ناوچە ئەنفالکراوەکانی هەرێمی کوردستان[١]

---

١- لە نەخشەکانی سەردار محەمەد عەبدولرەحمان (ئەتڵەسی هەرێمی کوردستانی عێراق ٢٠٠٩)

ئەم قۆناغەیان لەسەرجەم قۆناغەکانی تر کارساتبار و بە زیانتر بوو لە رووی ماددی ومرۆییەوە، چونکە (٧٠–٨٠) هەزار مرۆڤی کوردی تیا بێ سەرو شوێن کرا. ئەم ناوچانەی گرتەوە (دوزخورماتو، کفری، کەلار، دەربەندیخان، زنجیرە چیاکانی قەرەداغ، تەکیە، چەمچەماڵ و قەرەهەنجیر، قادر کەرەم، سەنگاو، تیلەکۆ، پێباز، ئاغجەلەر).

**قۆناغی چوارەم یان ئەنفالی چوار:** ئەنفالی حەوزی زێی بچووک ٣–٨ی مایسی ١٩٨٨ ناوچەیەکی فراوانی لە باکووری ئەو رێگا گشتیەی گرتەوە کە شاری کەرکوك بە شاری سلێمانی دەگەیەنێ و هەروەها باشوری رێگای نێوان کۆیە– دەریاچەی دوکانیشی گرتەوە، کە بریتی بوو لە ناوچەکانی( شوان، شێخ بزێنی، دەشتی کۆیە ،گۆپتەپە،عەسکەر، دێگەڵە،ئاڵتونکۆپری).

**ئەنفالی پێنجەم و شەشەم و حەوتەم:** ١٥ی مایس تا ٢٦ی ئابی ١٩٨٨ کە دۆڵی نێو چیاکانی شەقڵاوە و رەواندوز گرتەوە کە تیایدا رژێم بە کیمیابارانکردنی گوندەکانی (بالیسان و بالوکاوە وخەتێ) هێرشی دەستپێکرد، وە زیاتر لە ٥٢ گوندی ناحیەکانی خەلیفان و خۆشناوەتی و رەواندوز وێرانکران، وە ناوچەکانی چۆمان، شاخی قەندیل ، رانیە، چوارقورنە، هیزۆب و شاخی باواجی) گرتەوە.

**دوا ئەنفال:** ئەنفالی بادینان ٢٥ی ئاب تا ٦ی ئەیلولی ١٩٨٨:

بەهێرشێکی کیمیاوی لە ناوچەی (زیرەشکانی) نزیك سنوری عێراق و تورکیا دەستی پێکرد و ئەم ئەنفالەش ئەم ناوچانەی گرتەوە: (دهۆك، زاخۆ، کانی ماسی، زێوە، دێرەلوك، ئەتروش و زاویتە).

## * ئه نجامەکانی شاڵاوەکانی ئەنفال و کاریگەریەکانی:

١-کوژرانی چەند هەزار کەسانێك جا چ بەهۆی بۆمباران کردنەوە بووبێت یان چەکی کیمیاوییەوە، بۆمبارانی فرۆکەو هێلێکۆپتەرەکان، یان لە سێدارەدان بوبێت لە پیر و گەنج و ئافرەت و منالّ بەتایبەتی نێرینە زۆرینەی پێکهێنابوو.

٢-کیمیابی بارانکردنی گوند و ناوچەکان وەکو گۆپ تەپە و بەرگەلّوو و سەرگەلّوو و سێوسێنان و قادرکەرەم...هتد. بەچەکی کیمیاوی لە جۆرەکانی وەکو خەردەل و سارین و دەمارگاز.

٣- وێرانکردن و تێکدانی چەند هەزارێك لە گوند لە ناوچە ئەنفال کراوەکاندا. کە لە بەڵگەنامەکانی حکومەتی بەعسیدا هاتووە کە ((سوتاوە))، ((تێکدراوە))، ((تەخت کراوە)) و(( پاکسازی کراوە)) و لانی کەمیش دەیان شارۆچکەی گەورە و مەڵبەندی بەرێوەبردن و ((قەزا و ناحیە)) هەمان شتیان بەسەر هاتووە.

٤-بەهۆی بەکارهێنانی ((سیاسەتی زەوی سوتاو)) وە ناوچە ئەنفال کراوەکان لە گشت بنەماکانی ژیان کوێرکرانەوە و باخ و باخات و رەزەکان سوتێنراو سەرچاوە ئاویەکان کوێرکرانەوە، و ئەو ناوچانەش کرانە ناوچەی قەدەغەکراو. هەر کەسێك لەو ناوچانە بگیرایە یان ببینرایە یان بێسەر وشوێن یان گوللەباران دەکرا.

٥-بە تالانبردنی سەروەت و سامانی ناوچە ئەنفال کراوەکان وەکو کەلوپەلی ناومالّ و ئۆتۆمبێل و مەرو مالات و....هتد. لەلایەن ئەنفالچیەکانەوە کە لەوانە جاشی کوردی خۆفرۆشیان تیابوو.

٦- بێسەرو شوێن بوونی دەیان هەزار لە پیر و گەنج و منداڵ و ئافرەت دوای ئەوەی بۆ کەمپەکانی وەکو ((تۆپزاوا و نوگرەسەلمان و ....هتد)) راپێچکران و بەپێی رەگەز و تەمەن جیاکرانەوە تەنانەت دابەشکردنیشیان ، لە راپۆرتێکی دەزگای ئەمندا هاتووە کە ژمارەیەك لە کچە ئەنفال کراوەکان کە تەمەنیان لە (١٩-٢٩)ساڵدا بووە دراون بە وڵاتی میسر.

٧- ئەوانەی لە ئەنفال رزگاریان بووە، بەهۆی بێ سەرو شوێن بوونی زۆرێك لە کەسوکاریان تووشی بارێکی کۆمەڵایەتی و خێزانی و دەروونی وئابووری ناهەموار هاتوون یان گرفتاری تووشبوونی نەخۆشی سەختن بەهۆی پێکرانیان بە چەکی کیمیاوی.

٨- ئاوارەبوونی خەڵکی ناوچە ئەنفال کراوەکان، بۆ نموونە لە ئەنفالی ناوچەی دۆڵی جافایەتیدا زۆرێك لە خەڵکەکەی بەرە و وڵاتی ئێران ئاوارە بوون کە زۆرێکیان لە رێگادا گیانیان لە دەستدا بەهۆی سەرما و سۆڵە و بۆمباران بە راجیمە و فرۆکەکانی بەعسەوە.

٩- هەرچەندە رژێمی بەعس ناوی شاڵاوەکانی ئەنفالی لە ساڵی ١٩٨٨ بەکارهێنا، بەڵام هەر لەگەڵ هاتنی بۆ سەرحوکم بەکردار دەستی بە ئەنفال کردنی کورد کردبوو، هەر بۆنمونە لەنیسانی ١٩٨٠ زیاتر لە نیو ملیۆن کوردی فەیلی تەسفیر کرد کە تا ئێستاش چارەنوسی (٤)هەزار لاوی کوردی فەیلی بێ سەرو شوێنە، هەروەها لە ٣١ی تەمموزی ١٩٨٣ دا(٨) هەزار بارزانی ئەنفال کرد، وەلە ساڵی ١٩٨٨ دا (١٨٢) هەزارکوردی تری ئەنفال کرد، ئەمە جگە لەوەی کەلەپێش و لە دوای راپەرینەکەی ١٩٩١ سەدان کوردی کوشت و شوێن بزرکرد.

شایانی باسە دوای پرۆسەی ئازادی عێراق و روخانی رژێمی بەعس لە ٢٠٠٣/٤/٩ تاوانباران و ئەنجامدەرانی پرۆسەی ئەنفال لەساڵی ٢٠٠٧ حوکمی لەسێدارەدانیان بۆ دەرچوو.

## د- هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی چەکدارانەی ڕزگاریخوازی کورد:

مەرەکەبی لاپەڕەی شەرمەزاری و زەرد هەڵگەڕاوەکانی ڕێکەوتننامەی جەزائیر وشك نە بوویەوە کە ڕۆڵەگیان لەسەر دەستەکانی میللەتە ستەمدیدەکەی کوردستان ڕاپەڕینەوەو ئالآی شۆڕشی مەردانەیان هەڵکرد بە ڕووی ئەو بەعسەی کە ئاشکرا بانگیان ڕاهێشت کە بزوتنەوەی چەکدارانی کورد هەتا هەتایە کۆتایی پێ هات ئەگەر دارخورما لەسەریان بڕوێت جارێکی تر ناتوانن حەوت کەس بنێرنە شاخ.

ئەو شکستانەی باس کران کۆتاییان بە خەباتی ڕزگاریخوازی کوردی نەهێنا، ئەوەبو پارتی دیموکراتی کوردستان بە فەرمانی مەلا مستەفای بارزانی لە٢٦ی گوڵانی١٩٧٦ دووبارە درێژەی بەشۆڕش و خەبات دایەوە دژی ڕژێمی بەعس.

هەروەها لە ١٩٧٥/٦/١ یەکێتی نیشتمانی کوردستانیش بەڕابەرایەتی (جەلال تاڵەبانی) دامەزرا تا سەر لەنوێ درێژە بە خەباتی کوردایەتی بداتەوە،ئەوەبوو پاش ساڵێك شۆڕشی نوێی گەلەکەمان دەستی پێکردەوە.

(پاسۆك)یش یەکێکە لەپارتە سیاسییەکانی کوردستان کە ساڵانی ١٩٧٦ ڕوویان کردۆتە شاخ دژی ڕژێم جەنگاون.

پاشانیش حیزبی سۆشیالیستی یەکگرتوی کوردستان لە ساڵی ١٩٨٠ دامەزرا ئەویش گوڕوتینێکی زیاتری بە شۆڕش و خەباتی کورد دا دژی بەعسیەکان.

هەرهەموان بۆ ڕژێمی بەعسیان سەلماند کە کورد میللەتێکی زیندووە خاوەنی وڵات و ژیان و مێژوو و شارستانی خۆیەتی، مەینەتی و ئەشکەنجەی لەسەر دەستی دوژمنان بینیوە و خۆشەی ڕۆژگارە تاڵەکان

بووه، داستانی وایان تۆمار کرد کەڕژێم بەخەویشیدا نەدەهات وەکو شەڕەکانی شارستێن و (هەرسۆن – دالآنی) و دابان و بالیسان ، (قەیوان – ماوەت)، ئەزمەڕ، داستانی ڕزگاری و سماقوڵی و خواکوڕك و (حەمك و زینانە لەگەرمیان) نموونەی ئەو نەبەردی و ئازایەتیەی گەلەکەمانن.

### * بەکارهێنانی چەکی بەکۆمەڵکوژ (کیمیابارانی کوردستان):

ڕژێم بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە کردارەکەی لە سەرکوتکردنی میللەتی کوردا ڕاست و تەواوە،چی کۆکردبووەوە لەتەکنەلۆجیای جەنگ بڕیاری دا بەکاری بهێنێت، دیارە ئەوەندەش پشت ئەستوور بوو کە کەس نییە هەڵبداتێ لەچەندین شوێندا تاوانە ڕەشەکەی ئەنجام دا تاوانی کیمیابارانی. چەکی بەکۆمەڵکوژ، ئەو کارەساتانەی (هێرۆشیماو ناگازاکی)ش هەر ئەوەندە سامناك بوون، کیمیابارانی دۆڵی بالیسان، بادینان، سەرگەڵو، بەرگەڵو، گۆپتەپە، سێوسێنان وچەندین ناوچەی ترو دواجاریش شەهیدکردنی شاری هەڵەبجە لە ١٦ / ٣/ ١٩٨٨ کەزیاتر لە (٥) هەزار ژن و منداڵ وپیاوی تیادا شەهید بوو.

## * جەنگی عێراق و ئێران[*] :

### هۆیەکانی :

١- ململانێی عەرەب و فارس لەسەر دەسەڵات و چەسپاندنی خودی نەتەوایەتی لە ناوچەکە دا.

٢- شەڕی مەزهەبی.

٣- پشت گوێخستنی ڕێکەوتننامەی جەزائیر کە هەریەکەیان ئەوی تری پێ تاوانبار کرد.

٤- خۆپڕچەك کردن لەلایەن ڕژێمی عێراقەوە بەچەکی قورس و کۆمەڵکوژ بەتایبەتی چەکی کیمیاوی.

٥- لەخۆباییبوون و گیانی شۆڤێنیەتی لای سەرانی عێراق بەتایبەتی سەرۆکی ڕژێم.

لە٢٢ئەیلولی ١٩٨٠هێزەکانی سوپای عێراق بەدرێژایی سنوور هێرشی بەرفراوانیان کردە سەر ئێران، و لە ١٩٨٨/٨/٨ دا شەڕ وەستێنرا بەکوژرانی سەدان هەزار لەڕۆڵەکانی گەلانی عێراق و وێران بوونی دەیان شارو پرۆژە، لەدەستدانی سامانی عێراق و هەمووی بوو بەخۆراکی جەنگی لەخۆباییبوون و شۆفینیەت.

---

[*] مەبەست لەباس کردنی جەنگی عێراق و ئێران و جەنگی کەنداو تەنیا هەرئەوەندە تاپێ بزانین کە ڕژێم ڕێبازێکی خوێناوی و درندانەی گرتۆتە بەرو ئەم دوو جەنگە چۆن لەبارەی مەسەلەی کورد ڕەنگی داوە نەك باس کردنییان بەدوورو درێژی.

## * جەنگی کەنداو:

ڕژێمی عێراق پاش کۆتایی هاتنی جەنگی ئێران، بۆی دەرکەوت کە کەوتۆتە بن قەرزێکی زۆرەوە، بۆیە کەوتە بیانوگرتن بە دەوڵەتانی کەنداو بەتایبەتی کوێت، ڕژێم بەو چەکو تەقەمەنیە دەنازی کە لە جەنگی ئێران بەرێگای دەوڵەتە زلهێزەکان بەدەستی کەوتبوو بۆیە کەوتە هەڕەشەکردن لە دەوڵەتانی دراوسێ.

لەئەنجام دا هەڕەشەکانی سەری گرت لە ١٩٩٠/٨/٢ پەلاماری کوێتی دا جاڕێ دا کە کوێت پارچەیەکە لە عێراق و بەپارێزگای نۆزدەیەمی دایە قەڵەم بە پێچەوانەی جەنگی عێراق و ئێرانەوە، دەوڵەتانی دونیا بەتایبەتی زلهێزەکان کەوتنە خۆیان و نەتەوە یەکگرتوەکان بڕیاری تەواوی بێ قەیدو شەرتی کشانەوەی هێزەکانی عێراقیان لە کویت دەرکرد.

کە ئەگەر بەئاشتی نەکشایەوە ئەوا بەزۆر واتە بەزەبری جەنگ بکێشێتەوە بڕیاری ژمارە(٦٦٠) بۆ ئەم مەبەستە دەرچوو ،وڵاتە یەکگرتووەکان و فەرەنسا و بەریتانیا و دەوڵەتانی عەرەب وەکو میسر و سووریا و سعودیە و زۆری تر کە ژمارەیان (٣٠) دەوڵەت بوو هێزی هاوپەیمانییان دروست کرد بەتەواوی سەرباز و چەکی پێش کەوتووە وە خۆیان گەیاندە کەنداو و سعودیە.

نوێنەری دەوڵەتان و مرۆڤدۆستان پەیتا پەیتا خۆیان دەگەیاندە بەغدا بۆ ڕازی کردنی عێراق بۆ کشانەوەی لە کوێت بەڵام کەللە ڕەقی سەرۆکی ڕژێم لەخۆبایی بوونەکەی لەوە زیاتر بوو. کە دەیوت بیابانی سعودیەو کوێت لەژێر پێی هێزەکانی هاوپەیماناندا دەکا بە دۆزەخ و نیوەی ئیسرائیل دەسوتێنێ بە چەکی (کیمیاوی جووت لا) ژێراو ژووری دەکا. ئەمجا سەرۆکی ئەمریکا(جۆرج بۆش)ی یەکەم لە ١٩٩١/١/١٧ دا جەنگی کەنداوی ڕاگەیاند بەناوی( گەردەلوولی بیابان)ەوە هێزەکانی هاوپەیمانان پەلاماری

هێزی عێراقیان داو لەماوەی (١٠٠) سەعات دا تەفرو تونایان کرد، ئەنجامەکانی:

١- کوژرانی زیاتر لە (١٠٠) هەزار سەرباز.

٢- دەستگیرکردنی (٧٠) هەزار سەرباز.

٣- تیکشکانی هێزی سەربازی عێراق بەرێژەی زیاتر ٥٠٪.

٤- لەکارخستنی هێزی ئاسمانی عێراق.

٥- لەکارخستن و تێکدانی زۆربەی کارگەو هۆیەکانی ڕاگەیاندن و پردو پرۆژە سەربازیەکان.

٦- نابووت بوونی تەواوی عێراق لەڕووی ئابووریەوە و قەرزاری عێراق گەیشتە ١٥بلیۆن دۆلار.

٧- ملکەچی تەواوی عێراق بۆ هەموو بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان.

## * ڕاپەڕینە مەزنەکەی ئازاری ١٩٩١:

دەبێ میللەت مافی خۆی وەربگرێت و تۆڵەی زوڵم و زۆرداری هەربکاتەوەو هەر واش بوو، بۆیە بەرەی کوردستانی بەئەنجامدانی پلانێکی تۆکمەدارێژراو بە پشتیوانی سەرتاسەری جەماوەری کوردستان، لەڕۆژانی یەکەمی مانگی ئازاری ١٩٩١دا ڕێبەرایەتی ڕاپەرینی مەزنی کرد بەگوروتینێکی واوە کە پیاوانی ڕژێم و خوێن ڕێژەکانی وەکو پووش و پەلاشی دەم ڕەشابایان لێ هات.

دەزگاکانی ڕژێم لەبارەگای حزبی و ئەمن و ئیستخبارات و موخابەرات و جەیشی شەعبی و سوپا کەوتنە بەر زەبری ڕق و تۆڵەی ڕۆڵەکانی میللەت و شۆڤینیەکان سزای ڕەوای خۆیان وەرگرت، ئەوەشی دەرفەتی هێنا هەڵهات و چووە نێو باوەشی ڕژێمەوە. ئەوە لەیاد نەکەین کە ئەم ڕاپەڕینە مەزنە سەرپێی و لەخۆوە ڕووی نەداوە، ڕاستە سەرانسەری میللەت به پیاو ژن و

مناڵەوە بەشداریان تێداکرد، بەڵام هەروەکو ئاماژەمان پێ کرد، نەخشەی ڕاپەڕین کێشرابوو بەتایبەتی لە ساڵی ١٩٩١کە بڕیاردرابوو تێکۆشانی چەکدارانە لەناو شارەکاندا دەست پێ بکات هەر پێشمەرگە گیان لەسەر دەستەکانی کوردستان ڕێ نیشاندەربوون و هەر ئەوانیش بەهاناوە هاتن.

## ڕاپەڕینەکەی ئازاری ١٩٩١ی چی بەدەست هێنا...؟

**١- ڕزگارکردنی سەرتاپای کوردستان لە زاخۆوە تا خانەقین.**

٢- ڕاپەڕین هەموو پارت و چینەکانی کوردستان هاوبەشیان تیاداکرد.

٣- ڕژێم سووک و ڕیسوا بوو، ئەو هەیبەتە ترسناکەی لەناو خەڵکدا هەیبوو سڕایەوە.

٤- چەک کردنی زیاتر لە دوو فەیلەق و زیاتر لە ١٠٠ هەزار سەرباز خۆیان بەدەستەوە داو دەست بەسەراگرتنی هەموو چەکەکانیان بەچەکی قورسیشەوە.

٥- دەست بەسەراگرتنی هەموو نهێنیەکانی ئەمن و ئیستخبارات.

٦- کەلوپەل و کەرەسەی حیزبی و سەربازی و کەرەسەی سەر بە مەقەڕو پارت و سوپا، کە بەهای سەدان ملیۆن دینار بوو کەوتە دەست خەڵکەوە.

## * كـــــــۆڕەوە مەزنەکەی خەڵکی کوردستان لە بەهاری ١٩٩١:

ئەوەی چاوەڕەوان دەکرا و گەلی عێراق بەتایبەتی گەلی کورد ئومێدی پێ دەخواست دیکتاتۆری هەتا هەتایە بنبڕکرێت و حوکمی دیموکراتی مــافی



سەربەستی ئازادی بێتە جێگری شەوە زەنگی بەعسی و هەموو جیهان پشتگیری ئەم پرۆسەیە بێت بەتایبەت دەوڵەتانی هاوپەیمان کەچی بەبێ هیچ پێشەکییەك و لەبەر هەر هۆیەك کە ڕەنگە تا ئێستا ئاشکرا نەکرا بێ بەعس کەوتە شالاو و هێرشی بردنە سەر خەڵك و وشك و تەڕی پێکەوە سوتان.

بەڵام گەلی کوردستان ئەوەندەیان لاستەم بوو جارێکی تر بکەونەوە ژێر باڵی ڕەشی بەعس سەرتاپا زیاتر لەسێ ملیۆن کەس ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێهێشت و دایانە شاخ و سەر سنوورەکانی ئێران و تورکیا بەدەیان هەزار منداڵ و پیر لەناوچوون و بوونە کۆچی قوربانی فاشیەت ، ئەوەندە

هەیە سەردەمی ئەمڕۆ هۆکانی گواستنەوە و ڕاگەیاندن و ئەوەندە پێشکەوتوون سەعات بەسەعات کارەساتەکە دەگەینرا بەهەموو لایەکی جیهان و تەلەفزیۆن هەموو کارەساتیان دەبینی دەنگی نارەزایی و پشت گرتنی بەشێوەیەك ڕاست بۆوە بەقەدەر گەورەیی کۆڕەو بەدەنگ کوردەوە هاتن ئەویش خۆی لە خۆی دا گەورەترین دەستکەوتی میللەتی خۆڕاگری کوردە.

کۆڕەوەکە ئەم ئەنجامانەی لێکەوتەوە:

١- سووربون لەسەر یەکێتی ڕیزەکانی میللەتی کورد

٢- ڕەفزی دیکتاتۆریەت

٣- نەتەوە یەککرتووەکان (U.N) بڕیاری ئەوەی دا کەڕژێمی بەغداد نابێ هێرشی چەکداری بکاتە سەر گەلی کورد ولە ٥/٤/١٩٩١(بڕیاری٦٨٨) لەلایەن ئەنجومەنی ئاسایشی سەر بەنەتەوە یەکگرتوەکان بریاردرا ناوچەیەکی ئارام لەسەروی هیڵی ٣٦ بۆ کورد دابنرێ.

٤- دانانی هێزی هاوپەیمان لەبنکەی (ئەنجەرلیك) لەتورکیا بۆ پاراستنی خەڵکی کوردستان (هێزی چەکوشی ئامادە).

٥- ناردنی هێزێکی چەکداری بۆ ناو کوردستان بۆ پاراستنی خەڵکی لەکاتی گەڕانەوەیان دا.

٦- چی تر لەمە ناترسێ کە بەتەنیایە، بەڵکو مەسەلەی کورد نەك لەڕووی مرۆڤایەتییە وە تەماشای دەکرێ، بەڵکو میللەتێکە پێویستە مافی سیاسی خۆی وەربگرێت.

### * هەڵبژاردنی پەرلەمان و دامەزراندنی حکوومەتی هەرێمی کوردستان:

پاش کشانەوەی دام و دەزگا ئیدارییەکان لەکوردستان لەلایەن ڕژێمەوە بە ئومێدی خولقاندنی بەرەڵڵایی و سەرگەردانی لەناو ڕیزەکانی گەلی کوردا، بەڵام لە دوای زنجیرەیەك ڕاپەڕین بەتایبەتی ڕاپەڕینی سێیەم کە بە(داستانی ڕزگارکردنی کفری) ناودەبرا.

ئەو ڕاپەڕینەی کە پێشمەرگە قارەمانەکانی کوردستان گەورەترین داستانیان بۆ نەوەکانی کورد لە٨/١٠/١٩٩١ تۆمارکرد، بۆشاییەکی کارگێڕی لە کوردستان دا پەیدابوو، بۆیە سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی چاپوکانە هەوڵی کارکردنی دا بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمان و ئەو هەڵبژاردنەش لە ڕۆژی ١٩/٥/١٩٩٢ ئەنجام دراو بۆ یەکەم جار لەمێژوودا پەرلەمانی کوردستان دامەزرا و پاشان حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ٤/٧/١٩٩٢ پێك هات.

وەبۆ ڕاستی مێژوو کرداری هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان بەشایەتی نوێنەرانی دەوڵەتان و ڕۆژنامەنووسان، کەرنەڤاڵێکی قەشەنگ و تاقیکردنەوەیەکی ڕووناك بوو لە شەوە زەنگی جیهانی سێیەم و سەرانسەری ڕۆژهەڵاتدا لەڕووی چەسپاندنی دیموکراتیەت و بەهێز بوون. ڕیزەکانی گەل و (فیدراڵیەتیش) بووە دروشمی هەموو لایەك. ئەوەی شایانی باسە مامۆستایانی کوردستان ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو شان بە شانی چین و توێژەکانی تری کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بۆ پووچەڵکردنی پیلانی ڕژێم لە کشانەوەی دام و دەزگا ئیدارییەکان لە کوردستان.

# بەشی دەیەم

## بزووتنەوەی ئیستعماری نوێی ئەوروپی لە نیشتمانی عەرەب لەسەدەی نۆزدەو بەرهەڵستی عەرەب لە سەدەی ﴿١٩﴾ و سەرەتای سەدەی ﴿٢٠﴾ دا

### أ- هاتنە ناوەوەی دەسەڵاتی بەریتانیا بۆ کەنداو و عێراق:-

مێژووی هاتنە ناوەوەی دەسەڵاتی بەریتانیا بۆ کەنداو بۆ سەدەی حەڤدەی زایینی دەگەڕێتەوە، ساڵی ١٦٠٠ز بەریتانیا کۆمپانیای هیندی – خۆرهەڵاتی لە لەندەن دامەزراند بۆ ئەوەی ببێتە ئامرازێك بۆ بڵاوکردنەوەو جێگیرکردنی سیاسەت و بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا لەنزماییەکانی زەریای هیندی و ناوچەکانی دەوروبەری.

بەریتانیەکان لەکەنداودا (بەندەر عەباس) یان کرد بەمەڵبەندێکی سەرەکی چالاکییە سیاسی و بازرگانیەکانیان بۆ ماوەی زیاتر لە ١٥٠ساڵ.

کاتێك بایەخی ئەم بەندەرە رووی لە کەمیکرد لە ئەنجامی ئەو ئاژاوەیەی ناوچەکەی گرتبۆوە لەناوەڕاستی سەدەی (١٨) لەبەرئەوە بەریتانیەکان بنکەکانیان بۆ بەسرە گواستەوە،و لەساڵی ١٧٦٣ دا بەریتانیەکان بارەگایان بردە(بوشەهر)، ئەو کاتەش کەبەرژەوەندیەکانی بەریتانیا لەهیندستان بەهۆی شۆڕشی فەرەنساو هێرشی ناپلیۆن بۆ میسر و هەڕەشەکردنی لەرێگای هاتووچۆی بەریتانی لەخۆرهەڵاتدا کەوتە مەترسیەوە، بەریتانیا نرخ و بایەخی ستراتیژی کەنداوی بۆ دەرکەوت بۆ پاراستنی دەسەڵاتەکەی لەهیندستاندا، لێرەوە بەریتانیا کەوتە هەوڵدان بۆ

دەست بەسەرداگرتنی کەنداو ودواتریش بۆ هاتنە ناو عێراق، چونکە عێراق کەوتبووە سەر ڕێگای هیندستان.

**گرنگترین بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا لەعێراق بریتی بوون لە:-**

**١- بەرژەوەندیە ئابوورییەکان:-**

بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا لە ڕووی ئابوورییەوە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی١٦٣٥، ئەو ساڵەی یەکەم کەشتی بەریتانی گەیشتە بەندەری بەسرە. لەساڵی ١٧٣٣یشدا بەریتانیەکان بەمەبەستی سەرپەرشتیکردنی بەرژەوەندییەکانیان مەڵبەندێکی هەمیشەییان لەشارەکەدا کردەوە. سەرهەڵدانی شۆڕشی پیشەسازی بوو بەهۆی زۆربوونی ڕێژەی نێردراوەکانی بەریتانیا بۆ دەرەوە، ئەمەش پێویستی بە بازاڕ هەبوو بۆ ساغکردنەوەی کالاّ پیشەسازیەکان ، جگە لەمەش کردنەوەی نۆکەندی سوێس لەساڵی (١٨٦٩ز) بوو بەهۆی کورتکردنەوەی ڕێگای هاتووچۆی نێوان خۆرهەلاّت و خۆرئاوا و کەمبوونەوەی تێچوونی گواستنەوەی ئاوی.

عێراق جگە لەوەی دانەوێڵەو خورماو خوری و پێستەی بۆ بەریتانیا دەنارد، بازاڕێکیش بوو بۆ ساغکردنەوەی بەرهەمەکانی بەریتانیا، ڕێگایەکی هاتووچۆش بوو کەلوپەلەکانی بەریتانیای پێدا تێدەپەڕی بۆ ئێران.هەروەها لە عێراقدا لقی چەند بانقێکی بەریتانی دامەزرا بۆ کار ئاسانی بازرگانی و بەرهەمهێنانی سەرمایەی بەریتانی.

دۆزینەوەی نەوت چالاکی دەوڵەتە ئەوروپاییەکانی بەتایبەت بەریتانیاو ئەڵمانیای لەعێراقدا زیاتر کرد لەپێناو وەرگرتنی مافی دەرهێنانی نەوت لەدەوڵەتی عوسمانی.پاش ململانێیەکی زۆر بەریتانیا و ئەڵمانیا و هۆڵەندا

ڕێککەوتن لەسەر دامەزراندنی کۆمپانیای نەوتی تورکی، کە مافی دەرهێنانی نەوتی لە دەوڵەتی عوسمانی پێدرا، بەڵام هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی پرۆسەی دەرهێنانی نەوتی دواخست.

**٢- بەرژەوەندییە رامیاری و سەربازییەکان:-**

بەریتانیا بایەخێکی زۆری بەپاراستنی ڕێگاکانی هاتووچۆی بازرگانی دەدا، بەتایبەتی ڕێگای هیندستان. بۆ ئەم مەبەستەش لەماوەی سەدەکانی حەڤدەو هەژدەدا ڕووبەڕووی پورتوگالییەکان، هۆڵەندییەکان، فەرەنسییەکان وەستایەوە، لێرەوە بەرژەوەندییە سیاسی و سەربازییەکانی بەریتانیا لەعێراق دەستی پێکرد.

سەرەتا بەریتانیا هەوڵی ئەوەیدا ڕوباری فورات بۆ هاتووچۆی نێوان دەریای ناوەڕاست و کەنداو بەکاربهێنێ، وئەوەبوو ساڵی ١٨٦١ز هینری لینچ مافی بەڕێ خستنە کەشتی وەرگرت لە حکومەتی عوسمانی لە ڕووبارەکانی عێراقداو، خێزانی لینچ (کۆمپانیای کەشتیوانی بازرگانی دیجلەو فورات) دامەزراند. ئەم کۆمپانیایە ڕۆڵێکی گرنگی بینی لە چەسپاندنی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا لەعێراق دا.

هەروەها بەریتانیا بایەخی دا بەدامەزراندنی ڕێگا نوێیەکانی کەبەعێراقدا تێدەپەڕین چونکە دەست بەسەر داگرتنی نۆکەندی سوێس لەلایەن فەرەنسییەکانەوە، هانی سەرمایەدارە ئینگلیزەکانی دا بۆ بیرکردنەوە لەدۆزینەوەی ڕێگایەکی نوێ تا بەربەرکانێی نۆکەندی سوێسی پێبکەن. بۆ ئەم مەبەستە بەریتانیەکان لیژنەیەکیان دامەزراند بۆ لێکۆڵینەوە لە پرۆژەی ڕاکێشانی هێڵێکی ئاسن لەنێوان دەریای ناوەڕاست

و کەنداو. بەڵام بەهۆی تێچوونی زۆری پرۆژەکەوە حکومەتی بەریتانی پرۆژەکەی پەسەند نەکرد. بەریتانیەکان دژی پرۆژەی هێڵی ئاسنی (بەرلین ـ بەغدا ــ بەسرە)ش وەستانەوە کە ئەڵمانیـــا دەیویست ئەنجامی بدات.

هەروەها بەریتانیا بایەخێکی گەورەیدا بەدروستکردنی هێڵی بروسکەیی، تا لە ڕێی عێراق و کەنداو و ئێرانەوە بەهیندەوە ببەسترێتەوە.

دەسەڵاتی بەریتانیا لە عێراق وردە وردە زیاتر دەبوو، تا وای لێهات دەستیان دەخستە نێو هەموو کاروبارێکی ناوخۆی عێراقەوە.

هاتنە ناوەوەی بەریتانیا بۆ عێراق و کەنداو ڕووبەڕووی زۆر کۆسپ و تەگەرە بۆوە، وەك ڕووبەڕووبونەوەی والی عێراق سلێمان پاشای بچووك (١٨٠٨–١٨١٠ز) لەگەڵ نوێنەری نیشتەجێی بەریتانیا لەعێراق (کلۆدیوس جیمس ریچ) کەنەیدەویست دەست لە کاروباری ناوەوەی عێراق وەربدات.

بەڵام دەوڵەتی عوسمانی لە زۆرکاتدا دەیویست بەرەنگاری چوونە ناوەوەی بەریتانیا ببێتەوە، بەڵام ئەم کێشەیەی ئەوەندە بە بایەخ نەگرتبوو ، لە هۆیەکانی سەرنەکەوتنی ئەم هەوڵانە لاوازیی حکومەتی عوسمانی و نەتوانینی بوو لە بەرهەڵستی بەرژەوەنیەکانی بەریتانیا بەهێزی سوپایی .

لەکەنداویشدا بەریتانیەکان تووشی بەرەنگاربوونەوەی خێڵە عەرەبیەکانی وەك (ئەلقەواسم) لە عومان و عەرەبەکانی مەسقەت و بەحرەین و قەتەرو کوەیت.

مەترسی بەریتانیەکان لەپەرەسەندنی بەرهەڵستی عەرەبی لە لایەك و هەروەها مەترسی لەململانێی دەوڵەتە ئەوروپییەکان لەلایەکی تر پاڵی بە بەریتانیاوە تا کۆمەڵێك ڕێککەوتننامەی تا بەرامبەر لەگەڵ میر و

شێخەکانی مەسقەت و بەحرین و کوەیت و قەتەر ببەستێت، بەمەبەستی مانەوەی دەسەڵاتی لە شێخ نشینەکاندا راگرتنی سەربەخۆیی فەرمانڕەواکان و بەستنەوەی رامیاری دەرەوەیان، بەڵام ئەم ڕێککەوتنانە نەبوون بەڕێگر لەبەردەم سەرهەڵدانی چەندین ڕاپەڕین دژ بە بەریتانیەکان.

## ب - هاتنە ناوەوەی بەریتانیا بۆ میسر و بەربەرەکانێی گەلی میسر:-

کەمکردنەوەی دەسەڵاتی(محەمەد عەلی) نەخشەکانی بەریتانیای بۆ داگیرکردنی میسر کۆتایی پێنەهێنا، چونکە بەریتانیا بەوردی ئاگاداری بایەخی میسر بوو، وەك بنکەیەك بۆ گواستنەوە و بازرگانی، بە تایبەتی دوای کردنەوەی نۆکەندی سوێس لە ١٨٦٩ز.

فەرمانڕەوای میسر خدێوی ئیسماعیل ١٨٦٣ ـ ١٨٧٩ ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە ڕاکێشانی بەریتانیەکان بۆ دەست خستنە نێو کاروباری وڵاتەکە. خدێوی کابرایەکی زۆر دەست بڵاوبوو، پارەیەکی زۆری لەبانقەکانی ئینگلیز و فەرەنسا قەرزکردبوو، ئەمە دەرفەتی بۆ ئینگلیز و فەرەنسییەکان ڕەخساند تا بەبیانووی پاراستنی بەرژەوەندییە ئابووریەکانیانەوە، دەست بخەنە ناوکاروباری نێوخۆی میسرەوە.

حکومەتی میسر لەسەرەتادا نیوەی بەشەکانی کۆمپانیای نۆکەندی سوێسی هەبوو، بەڵام خدێوی ناچاربوو کە بەشەکانی میسر لەنۆکەندەکە بفرۆشێت بۆ دانەوەی قەرزەکانی، بەریتانیا ئەم دەرفەتەی قۆستەوەبۆ ئەوەی دەست بەسەر ئابوری میسردا بگرێت و بیخاتە ژێر دەستی سەرمایەدارەکانیەوە، پلانی خێرای دانا بۆ کڕینی بەشەکانی میسر و پلانەکەشی جێبەجێ بوو.

دوای ئەوەی بەریتانیا بە هاوبەشی لەگەڵ فەرەنسا نەخشەی پێویستیان دانا بۆ داگیرکردنی وڵات.لەتشرینی دووەمی ١٨٧٦ لیژنەیەکیان بۆ چاودێری کاروباری دارایی میسر پێك هێنا پاش ئەوەی خدێوی ئیسماعیل بێ توانایی خۆی لەدانەوەی قەرزەکان ڕاگەیاند. بەمجۆرە تا دەهات دەسەڵاتی بێگانە لە میسردا زیاتر دەبوو.

کاتێك بەریتانیا هەستیکرد، کە کاتی دوور خستنەوەی خدێوی ئیسماعیل هاتووە ناچاریانکرد واز لەدەسەڵات بهێنێ بۆ (خدێوی تۆفیق)ی کوڕی، کە ئەمیان زیاتر ملکەچی داواکانی بێگانە بوو.

لەئەنجامی هاتنە ناوەوەی ئەوروپی و خراپبوونی باری ئابووری و نارەزایی گەل وباجی قورس، سوپاییە نەتەوەییەکانی میسر پەنایان بردە بەر دامەزراندنی ڕێکخراوێکی سوپایی نهێنی کە دیارترین دامەزرێنەرەکانی(ئەحمەد عورابی و علی فەهمی) بوون ئەم ڕێکخراوە بزووتنەوەیەکی چەکداری بە سەرۆکایەتی(ئەحمەد عورابی) دژی بەریتانیا بەرپاکرد.


ئەحمەد عورابی

ئەحمەد عورابی لە ٩ئەیلولی ١٨٨١ دا داوای لەخدێوی تۆفیق کرد وەزارەتی (نوبار پاشا) هەڵبوەشێنێتەوەو وەزارەتێکی نوێ دابمەزرێنێت، هەروەها داوای زۆرکردنی ژمارەی سوپا و دیاریکردنی دەسەڵاتی خدێوی و نەهێشتنی دەست خستنە ناوەوەی بێگانەی کرد بۆ میسر.خدێوی

تۆفیق داواکاریەکانی عورابی جێبەجێکرد، وەزارەتێکی نوێ بەسەرۆکایەتی(شەریف پاشا) و دواتریش وەزارەتێکی نیشتمانی تر بەسەرۆکایەتی (مەحمود سامی بارودی) لەسەرەتای ساڵی١٨٨٢دامەزراند، لەم وەزارەتەیاندا ئەحمەد عورابی کرا بەوەزیری جەنگ و دەریا.

بەریتانیا ڕایگەیاند کە نیشتمانپەروەرانی میسر و لەسەروو هەمووشیانەوە عورابی هەڕەشە لە بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا دەکەن و ژیانی بێگانەکان لەمیسر دەخەنە مەترسیەوە ئامادەییشیان نیشاندا بۆ هاوکاریکردنی خدێوی توفیق بۆ لەناوبردنی شۆڕشەکەی عورابی.

هەروەها لەگەڵ فەرەنسییەکان بەهاوبەشی یاداشتێکیان دا بەحکومەتی میسری و تیایدا داوای دەست لەکار کێشانەوەی وەزارەتەکەو دوورخستنەوەی ئەحمەد عورابی کرا بوو بۆ دەرەوەی وڵات، بەڵام وەزارەتەکەی میسر ئەم داوایانەی ڕەتکردەوە.

بێگانەکان کە بیستیان پاپۆڕە جەنگیەکانی بەریتانیا هاتوونەتە ناو ئاوی ئەسکەندەریەوە لەشارەکە کۆبوونەوەو، لەحوزەیرانی١٨٨٢بەهاندانی قونسوڵی بەریتانیا کەوتنە ئاژاوە نانەوە لەئەسکەندەرییە، سەرەنجام بەیەکدادان لەنێوان بێگانەکان و هاووڵاتیە میسرییەکان ڕوویداو چەند بێگانەیەك کوژران. قونسولگە بیانیەکان ئەم ڕووداوەیان کردە بیانوویەك بۆ سەرزەنشتکردنی حکومەتی میسر و داوای پاراستنی ژیانی بیانیەکانیان کرد. خدێوی تۆفیق ئەم بارەی بەهەلزانی و لەپایتەخیەوە چوو بۆ ئەسکەندەرییە تا لە کەشتیگەلی بەریتانیا نزیك ببێتەوە.

دەوڵەتەئەورووپاییە گەورەکان بۆ تاووتوێکردنی بارودۆخەکە لەمیسر کۆنگرەیەکیان لە ئەستانبوڵ بەست. نوێنەری بەریتانیا بۆ چارەسەرکردنی

دۆخەکەو گەڕاندنەوەی ئارامی و ئاسایش داوای دەست خستنە نێو کاروباری میسر و پێویستی بەکارهێنانی هێزی کرد. لەتەموزی١٨٨٢ز هێزێکی گەورەی بەریتانیا پەلاماری ئەسکەندەرییەی داو دەستی بەسەر داگرت و دواتر ئەم هێزە بەرەو قاهیرە بەڕێکەوت و لەئەیلولی هەمان ساڵدا توانیان لەشەڕی(تەل ئەلکەبیر) دا هێزەکانی میسر تێکبشکێنن، لەئەنجامدا ئەحمەد عورابی خۆیدا بەدەستەوە لەگەڵ هاوڕێکانیدا دران بەدادگاو سەرەتا فرمانی خنکاندنی درا، بەڵام دواتر فرمانەکە گۆڕدرا بەدوورخستنەوەی یەکجاری لەمیسر.

هەر چەندە بزووتنەوەی ڕزگاری میسر ماوەیەك تووشی شکست و بێهێزی بوو بەهۆی تێکشکاندنی شۆڕشەکەی عورابییەوە، بەڵام چالاکی نیشتمانی بەنهێنی بەردەوام بوو،(مستەفا کامل) لەدیارترین ڕێبەرانی ڕزگاری میسر بوو. تادەهات بزووتنەوەی نیشتمانی لەمیسر زیاتر پەرەی دەسەند و لەساڵی ١٩٠٧ز بەسەرۆکایەتی مستەفا کامل(حزبی نیشتمانی ـ حزب الوطن) دامەزرێندرا، لەگرنگترین ئامانجەکانی ئەم حیزبە داواکردنی دەرچوونی داگیرکەران لەووڵات و بەرهەڵستی داگیرکەرانی بەریتانیا بوو. دوای مردنی مستەفا کامل لەساڵی١٩٠٨(محەمەد فەرید) بوو بەسەرۆکی حیزبەکە.

کودەتای عوسمانی ساڵی١٩٠٨دەنگدانەوەیەکی زۆری هەبوو لەسەر ڕەوتی ڕووداوەکانی میسر، چونکە نیشتمانپەروەرانی هاندا تەوژمێکی نوێ بەچالاکیەکانیان بدەن و چەندین خۆپیشاندانیان سازکرد، حزبی نیشتمانی داوای کشانەوەی هێزەکانی بەریتانیا و دانانی دەستوورێکیان دەکرد بۆ میسر، بەڵام بەریتانیا بە توندی ڕووبەڕوویان بوویەوە، ئەمەش وای

لەنیشتمانپەروەران کرد پەنا ببەنە بەر شێوازی تێکۆشانی نهێنی و سەرەنجام کۆمەڵەیەکی نهێنییان بەناوی (کۆمەڵەی وەردانی) دامەزراند کەبەیەکەم کۆمەڵەی فیداکارانەی نهێنی دادەنرێت لەمیسر بۆ بەرهەڵستی داگیرکاران و نۆکەرانی.بەریتانیا بەبیانووی هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانییەوە لە١٨کانوونی یەکەمی١٩١٤دا جاڕی پاراستنی میسری دا.

### * شۆڕشیساڵی ١٩١٩لە میسر:-

دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهان، وەفدێکی میسری بەسەرۆکایەتی (سەعد زەغلول) چوون بۆ لای (ریجناڵد وینگیت) مەندوبی سامی بەریتانی لەمیسر بۆ داواکردنی سەربەخۆیی میسر و چەند داواکاریەکی تری وەك: هەڵگرتنی حوکمی عورفی، لابردنی چاودێری لەسەر چاپەمەنی و ڕۆژنامە. بەڵام مەندوبی سامی سەعد زەغلول و هاوڕێکانی بەنوێنەری گەلی میسر نەناسی. بۆیە وەفدەکە لەسەرانسەری میسر وەکالەتنامەیەکی مۆرکرد کە پشتگیری وەفدەکەی سەعد زەغلول دەکەن و ئەوانیان بە(وەکیل)ی خۆیان داناوە بۆ داواکردنی سەربەخۆیی میسر و سودان، لەمەوە (جوڵانەوەی تەوکیلات) سەری هەڵدا.

بەریتانیا لەپەرەسەندنی جوڵانەوەکە نیگەران بوو، بۆیە سەعد زەغلول و هاوڕێکانی بەدەست بەسەری نارده دورگەی(ماڵتە). لێرەوە شۆڕش و ڕاپەڕین لەقوتابخانەو پەیمانگاکان دەستی پێکرد، پاشان کرێکارانی هێڵی ئاسن هاتنە پاڵیان، شۆڕش بەهەموو لایەکی میسردا بڵاوبۆوە. بەریتانیاش بۆ کپکردنەوەی هەموو ڕێگا و شێوازێکی گرتە بەر، بەڵام نەیتوانی

شۆڕشەکە بێ دەنگ بکات، بۆیە بە ناچاری سەعد زەغلول وهاوڕێکانی ئازاد کردن.

وەفدی میسر چوون بۆ پاریس بۆ ئەوەی مافەکانی میسر و سودان بخەنە بەردەم کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس لە ساڵی ١٩١٩ دا ، بەڵام بەبێ ئومێدی گەڕانەوە، چونکە کۆنگرە بڕیاری سەپاندنی پاراستن(حماية)ی بەریتانی بەسەر میسردا پەسەند کردبوو بە پشتیوانی دەوڵەتە گەورەکان لەسەروو هەمووشیانەوە ئەمریکا.

لەساڵی ١٩٢١ جارێکی تر سەعد زەغلول لەوڵات دوورخرایەوە بۆ دورگەی(سیشیل) لەزەریای هیندی و دواتر ڕەوانەی(جەبەل تاریق) کرا، بۆیە سەر لەنوێ شۆڕش دەستی پێکردەوە.بەریتانیا ناچار بوو بانگەوازی ٢٨شوباتی ساڵی١٩٢٢ بڵاوبکاتەوە کە بەڕووکەش دانی بە سەربەخۆیی میسر دانا کەچی لەڕاستیدا دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی بەریتانیا هەر مایەوە.

### ج - پەلاماری بەریتانیا بۆ سەر سودان ١٨٩٨:-

بەریتانیا بە گەرمی کەوتە کارکردن بۆ ڕوخاندنی ئەو دەوڵەتەی کە(مەهدییەکان) لە سودان دایانمەزراندبوو. بۆ ئەم مەبەستەش داوای لەخدێوی میسر(عەباس حیلمی) کرد هاوکاری بکات، سوپایەکی هاوبەش لەهەدوولا بەسەرکردایەتی(کتشنەر) فەرماندەی گشتی سوپای میسر پێکهێنرا.

دەوڵەتی مەهدییە لە چەندین لاوە ڕووبەڕووی هێرش و پەلامار بووەوە، ئەو کاتەی لەساڵی ١٨٩٦ زهێزەکانی بەریتانیا بەفەرماندەیی کتشنر لەباکوورەوە هێرشیان دە کردە سەر سودان، لەهەمانکاتدا هێزێکی

فەرەنسا لەباشوورەوە بەفەرماندەیی (مارشان) پەلاماریان دەدا، هەردوو هێزەکە ڕووبەڕوو بەیەکگەیشتن، لە فاشودە(پایتەختی خێڵەکانی شلك لەباشووری سودان) ئەو ڕووبەڕووبوونەوەیەش بە(کێشەی فاشودە) ناسراوە لەمێژوودا. ئەم کێشەیە بەپێ ی ڕێککەوتننامەی نیسانی ساڵی ١٨٩٩ز لەنێوان بەریتانیا و فەرەنسا لەسەر بنچینەی یەکسانی هێزەکانیان نەك تەنها لە ئەفریقیا بەڵکو لەهەموو جیهاندا کۆتایی پێهات و بەپێ ی ڕێککەوتنەکەش سودان بوو بەناوچەیەکی دەسەلاتی بەریتانی.

دوای ئەم ڕێککەوتنە هێزەکانی بەریتانیا هێرشیان کردە سەر مەهدییەکان و سەرەنجام سوپای بەریتانیا توانی لە چەند شەڕێکدا بەسەر مەهدییەکاندا زاڵ بێت، لەو شەڕانەدا خەلیفەی مەهدی (عەبدوڵلا تەعایشی) لەگەڵ بەشێك لەفەرماندەکانی کوژران، بەمەش دەسەلاتی مەهدییەکان کۆتایی پێهات و سودان داگیر کرا.

لە کانوونی دووەمی ١٨٩٩ز بەریتانیا بەپێی ڕێککەوتنێك لە قاهیرە لە نێوان بەریتانیاو میسر، فەرمانڕەوایی دوو قۆڵی(بەریتانی ــ میسری) دانا بۆ بەڕێوەبردنی سودان بە دووقۆڵی، بەلام لەڕاستیدا دەسەلات هەر بە دەست بەریتانیەکانەوە بوو.

### د - داگیرکردنی لیبیا لەلایەن ئیتاڵیا ١٩١١ز:-

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەوە ئیتالیا پەیوەندییە ئابووری و ڕۆشنبیرییەکانی خۆی لەگەڵ لیبیا لەڕێگای کردنەوەی چەندین بانك و پێدانی قەرز و بەرهێنانی سەرمایە بەهێزو پتەو کرد، ئیتاڵیەکان لە بەنغازی نووسینگەیەکی پۆستەو گەیاندنی لەتەرابلوس و بەرقە

قونسولگەیان دامەزراند و چەند قوتابخانەیەکیشیان لەشارەکاندا کردەوەو چەندین دەستە نێردراوی تایبەتیشیان نارده لیبیا. هەموو ئەمانە ڕێگا خۆشکەربوون بۆ داگیرکردنی لیبیا لەلایەن ئیتاڵیاوە.

**هۆکارەکانی پەلاماری ئیتالیا بۆ سەر لیبیا بریتی بوون لە:-**

١- ئیتاڵیا مەبەستی بوو خۆی لە گێروگرفتی ئابووری ڕزگار بکات و بەدەست کێشەی زۆربوونی ژمارەی دانیشتوانیشەوە دەینالآند.

٢- گەڕانەوە بۆ ئەو سەروەری و پلەو پایەی کە لە ڕابردوودا هەیبوو.

٣- بۆ ئەوەی ئیتاڵیا بکاتە ئاستی دەوڵەتە گەورەکانی ئەورووپا.

دوای ڕێککەوتنی لەگەڵ فەرەنسا، ئیتاڵیا هەڕەشەیەکی ئاراستەی دەوڵەتی عوسمانی کرد کە دەبێت لە لیبیا پاشەکشە بکات، بەڵام عوسمانییەکان هەڕەشەکەیان ڕەتکردەوە.لەئەنجامدا ئیتالیا هێرشەکانی بۆ سەر لیبیا دەست پێکرد و زۆر شوێنی داگیرکرد.

گەلی لیبیا بەرەنگاری ئەم هێرشانە بوونەوەو لە زۆر شەڕدا لەگەڵ هێزەکانی ئیتاڵیا ڕووبەڕووبوونەوە، کە گرنگترینیان شەڕی(بوملیانە) لە تشرینی دووەمی١٩١١ز و شەڕی (بیر تەرابلوس) بوو لەکانوونی یەکەمی هەمانساڵدا. دواتر عوسمانییەکان و ئیتاڵیەکان شەڕیان وەستاند و ڕێککەوتننامەیەکیان لە(ئوشی)لە(لۆزان)ی سویسرا لە (١٩١٢ز)مۆر کرد بەپێی ئەم ڕێککەوتنە عوسمانییەکان دانیان نا بەداگیرکردنی لیبیا لەلایەن ئیتالیا بەرامبەر بە مانەوەی دەسەڵاتی ئایینی سوڵتانی عوسمانی لە لیبیا.

گەلی لیبیا بەم داگیرکردنە ڕازی نەبوون لەناوچەکانی تەرابلوس و بەرقە بەربەرەکانی بەردەوام بوو. هەرچەندە ئەم بەربەرکانێیانە زیانی

زۆریان بەهێزەکانی ئیتاڵیا گەیاند، بەڵام لەدەرکردنی داگیرکاران و کۆتایی پێهێنانی دەسەڵاتیان لە لیبیا سەرکەوتوو نەبوون. لەساڵانی دوای جەنگی یەکەمی جیهانیشدا(عومەر موختار) ئەرکی ڕابەرایەتی جووڵانەوەی نیشتمانی دژی ئیتاڵیەکان گرتە ئەستۆی خۆی.

(عومەر موختار) توانی شۆڕشگێڕان سازبکات و چەکداریان بکات و گەلی لیبیا لەدەوری یەك شت کۆبکاتەوەو ئەویش ڕزگاریە، خێڵ و عەشیرەتەکانی یەکخست و(جبل الاخضر) ی کردە بنکەی سەربازی خۆی لە گەرووی چیاکەشدا دەزگایەکی دامەزراند بوو بۆ مەشق پێ کردن و مووچەپێدانی ئەو کەسانەی دێنە ناو ڕیزەکانی شۆڕشەوە.

هەرچەندە هێزەکانی شۆڕش کەمدەرامەت و لاواز بوون ، بەڵام داگیرکەرانی ئیتاڵی لە بەرگری گەلی لیبیا کەوتنە مەترسییەوە، شۆڕشگێڕەکان شارەزای بست بەبستی وڵاتەکەیان بوون، ورەیان بەرزتر و بەهەڵمەت تر بوون، بەڵام لە ئیتاڵیا و هێزێکی گەورە بۆ لیبیا بەرێکرد بەمەبەستی دۆزینەوەی بنکەی شۆڕشگێڕەکان و هێرشیان بەرنەسەر، فڕۆکەشیان بۆ ئەو مەبەستە خستە کار.

داگیرکەران زۆر دڵڕەقانە کەوتنە وێزەی میللەت و گەلێك شێوەیان بەکارهێنا لەوانە:

١- دادگای باڵدار: دادگایەکی سەربازی گەڕۆك و سەرپێی بوو بە فەرمانی سەرکردایەتی ئیتاڵیا هەڵسوکەوتی دەکرد، شۆڕشگێڕان و تۆمان لێکراوان ئەدران بەو دادگایە، لەماوەی چەند دەقیقەیەکدا دەکوژراو هەندێك جار لەفڕۆکەیەکی بەرزەفڕەوە دەخرایە خوارەوە.

٢- بەنیازی دابڕینی جەماوەر لە شۆڕش و پەککستنی بەشداربوونیان لە شۆڕشی (عمر المختار) دا کەوتنە دابڕینی گوندەکان و چۆڵ کردنیان و کۆکردنەوەیان لەچەند ئۆردوگایەکی زۆرەملێ ی دا کە بەسەربازی داگیرکەران ئابڵوقە درابوون.

سەرەڕای هەموو ئەم شێوازانە عمر مختار توانی لە جەنگەکانی(الزاوية ــ الرحيبة ــ عقيدة المطمورة) هێزی داگیرکەران بشکێنێت و تووشی سەرشۆڕیان بکات، وە لەئەنجامدا پایەی عومەر موختار وەك تێکۆشەرێك لەناو عەرەبەکان بە گشتی و لەلای گەلی لیبیا بە تایبەتی درەشایەوەو پتەوتر دەبوو.

لە ئەنجامی سەرکەوتنەکانی عمر المختاری پاڵەوان دا ئیتاڵیەکان جەنەڕاڵ (غرازیانی)ی خوێن ڕێژیان ناردە لیبیا بە مەبەستی کپکردنەوەی شۆڕش و لەناوبردنی، بۆ ئەم مەبەستە ئەم نەخشەیەی خوارەوەی کێشا:-

١- جبل الاخضر کە بنکەی شۆڕشە، ئابڵوقە بدرێت و لەناوچەکانی دوەوربەری بڕی دەن، لەئەنجامدا هێرش بەرنە سەری و داگیری بکەن.

٢- ڕێگە نەدرێت بە شۆڕشگێڕان کە پەیوەندی بە جیهانی دەرەوەی لیبیاوە بکەن و ئازووقە و تەقەمەنیان لێ ببڕێت.


دادگایی کردنی عومەر موختار

٣- مێرگی جغبوب داگیر بکرێت و هێڵێکی بەرگری تیا بچەسپێ و بەکارەبا بتەنرێت بەو نیازەی پەیوەندی نێوان میسر و بەرقە بپچرێت.

ئیتاڵیەکان بەهاوکاری ئینگلیز و ڕەزامەندی مەلیك فوئاد توانیان مێرگی جغبوب داگیر بکەن و بەکارەبا بیتەنن، بەڵام شۆڕش درێژەی کێشا. ئەوسا داگیرکەری ئیتاڵی بەناچاری کەوتە وتووێژەوە لەگەڵ عمر المختار ، بەڵام سەری نەگرت و کوشتار دەستی پێکردەوەو ئیتاليا لای مەبەست بوو بەهەر نرخێك هەیە عمر المختار لەناوبەرێت و نەخشەی بۆ ئەوە کێشا ، ئەوە بوو لەشەڕێکی نابەرامبەردا توانی عمر المختار بەدیل بگرێت لەتەمەنی(٧٠)ساڵیدا لەساڵی ١٩٣١دا. پاشان لەسێدارەدرا.

## ه - ئیستعماری فەڕەنسی لەمەغریبی عەرەبی و بەرهەڵستی گەلی عەرەب:-

### ١ - جەزائیر:-

فەڕەنسا لەبەر چەند هۆیەك لە ساڵی ١٨٣٠دا جەزائیری داگیر کرد لەوانە شوێنی جوگرافی و سرو شتە ستراتیژیەکەی، ئاسان بوو بۆ کەشتی گەلەکەی فەرەنسا کە بنکەی چاکی دەستکەوێت بۆ دەستگرتن بەسەر دەریای ناوەڕاستدا، هەروەها وڵاتێکی فراوانە، سامانی زۆرە بە هەموو جۆرەکانییەوە، سەرەڕای ئەو هۆیانەی کە پەیوەندی بە باری ناوخۆی فەرەنساوە هەیە.لەدوای ئەوەی کە ئیمپراتۆیەتییەکی گەورەو فراوانی لە دەستچوو لەکاتی شەڕەکانی شۆڕشی فەرەنسا و ناپلیۆن و وازهێنانی لە هەندێ وڵاتە ژێر دەستەکانی بۆ بەریتانیا وە ویستی بگەڕێت بەدوای سەرکەوتنێکی دەرەوەدا تا سەرنجی گەلی فەرەنسا دوورخاتەوە لەگیروگرفتەکانی ناوخۆ و کە ڕووداوی باوەشێن (المروحة) ڕوویدا کردیە

بیانوویەك بۆ داگیرکردنی جەزائیر ، کورتەکەشی ئەوەبوو کە فەرەنسا هەندێ پارەی جەزائیر قەرزدار بوو نرخی ئەو گەنمەی لێی کڕیبوو.چەند ساڵێك خستییە پشتگوێ و دەمەقاڵێ ڕووی دا لە نێوان (دای حسین) فەرمانڕەوای جەزائیر و باڵیۆزی فەرەنسا (داڤاڵ) و لەوکاتەدا (دای حسین) لەقین و داخدا باوەشێنەکەی بەدەستیەوە بوودای بە باڵیۆزەکەدا ئەمە بووە بیانوویەك بۆ داگیرکردنی جەزائیر و هێزێکی نارده سەر جەزائیر بەسەرکردایەتی مارشاڵ بۆرمۆن لەساڵی١٨٣٠دا ناوچە کەناریەکانی جەزائیری داگیری کرد. بەڵام گەلی جەزائیر ملی بۆ داگیرکەران کەچ نەکردو کەوتە بەربەرەکانی فەرەنسییەکان و بزووتنەوەی بەرهەڵستی عەرەب لەجەزائیر دا بە سێ قۆناغ دا تێپەڕی:-

١- سەردەمی زوو: ئەو سەردەمەیە ئەکەوێتە ساڵانی (١٨٣٠ - ١٨٣٢) داگیرکەر هەوڵیاندا لە ناوچەکەنی ناوەوەدا چەند سەرۆکێکی هۆزەکانی جەزائیری بدۆزنەوە بڕوا بە دەسەڵاتیان بکەن، بەڵام تووشی بەرهەڵستیەکی توند بوون.

٢- سەردەمی دووەم: دەرکەوتنی کەسایەتی(عبدالقادر جەزائیری) کە سەرکردایەتی بزووتنەوەی بەرهەڵستی کرد تا ساڵی١٨٤٧. عبدالقادر جەزائیری شاری(مەعەسکەر)ی کردە پایتەختی خۆی و هۆزەکانی لەدەوری خۆی کۆکردەوەو و کردیان بە سەرکردەی خۆیان کە هێشتا تەمەنی ٢٤ساڵ بوو.

عبدالقادر سوپایەکی دامەزراند و توانی نزیکەی دووبەش لەسێ بەشی جەزائیر ڕزگار بکات. هەندێك جاریش پەنای دەبردە بەر ڕێککەوتنی کاتی لەگەڵ فەرەنسیەکان بۆئەوەی سوود لەکات وەربگرێت و هێزەکانی

ڕێکبخاتەوە، چەك لەدەرەوە بهێنێ و بیدات بەلایەنگرانی، دەنگی گەلی جەزائیریش بگەیەنێت بەدەرەوە. پاش ئەوەی فەرەنسییەکان لەدوای چەند شەڕێك نەیانتوانی بەسەر جەزائیرییەکاندا زاڵ بن، ساڵی ١٨٣٧ز بە ناچاری پەیمانی (تافتا) یان لە گەڵ عبدالقادر دا مۆر کرد، بە پێی پەیمانەکە شارەکانی (جەزائیر و وەهران و شارەکانی تری کەنار درا بە فەرەنسیەکان)، بەلاّم هەرێمەکانیتر لەژێر دەسەلاّتی میر عبدالقادر مایەوە کەلە سێبەش دووبەشی خاکی جەزائیربوو.

بەلاّم دوای ئەوەی لە فەرەنسا حکومەتێکی نوێ هاتە سەر کار، ئەم حکومەتە داوای داگیرکردنی سەرتاپای جەزائیری کرد. بۆیە سوپای ناردە جەزائیر و دوای شەڕێکی قورس توانی شاری(مەعەسکەر) بگرێت دوای ئەوەی ئەمیر عبدالقادر چۆڵی کردبوو پاش ئەوەی فەرەنسییەکان شۆڕشەکەیان سەرکوتکرد، عبدالقادر ناچار بوو بکشێتەوە بۆ ناو خاکی مەغریب، بەلاّم کاربەدەستانی مەغریب ئەمجارەیان دوو دڵ بوون لەوەرگرتنی چونکە بەپێ ی ئاشتینامەی(تەنجە)ی لە تشرینی دووەمی ١٨٤٤ لەگەڵ فەرەنسا ڕێککەوتبوون کە هیچ جۆرە یارمەتیەك پێشکەش بەشۆڕشگێرانی جەزائیر نەکەن و دەرچوونی میر عبدالقادر جەزائیری لەیاسا تێدابوو لەگەڵ نەهێشتنەوەی سوپای



وێنەی عبدالقادر جەزائیری

مەراكیش لەسەر سنوور، بەمجۆرە عبدالقادر جەزائیری ساڵی١٨٤٧ز دوای ئەوەی هێزێكی وای شك نەدەبرد، ناچار بوو چەك دابنێ و ئەوسا بەدیلی دوور خرایەوە بۆ دیمەشق و ساڵی١٨٨٣ لەوێدا مرد.

٣- سەردەمی دوای عبدالقادری جەزائیری: وێڕای ئەمەش بەربەرەكانێی گەلی جەزائیر هەر بەردەوام بوو،ئەوە بوو ساڵی ١٨٧١ز لەهەرێمی (قسنطینة) ڕاپەڕینێك بەسەركردایەتی (محەمەد كوڕی ئەحمەدی مقرانی) بەرپابوو، بەڵام هەرزوو سەركوت كرا، دوای ئەوەش ڕاپەڕینی هۆزەكانی بیابان هەر بەردەوام بوو.

داگیركردنی جەزائیر لەلایەن فەرەنسا، تا ساڵی١٩٦٢درێژەی كێشا، لەم ساڵەداو لەئەنجامی شۆڕشی(١٩٥٤ـــ١٩٦٢)ز فەرەنسا ناچار بوو دان بەسەربەخۆیی جەزائیر دا بنێت، دوای ئەوەی وڵاتەكە نزیكەی یەك ملیۆن شەهیدیان بەخشی.

## ٢ - تونس:-

سەرەتای بەرژەوەندیەكانی فەرەنسییەكان لە تونس دا دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شازدەهەم، تا لەساڵی١٨٦١دا فەرەنسی یەكان چەند دەسكەوتێكی ئابورییان دەسكەوت وەك فراونكردنی بەندەری تونس و ڕاكێشانی هێڵەكانی ئاسن و هێڵەكانی بروسكەو تەلگراف لە وڵات دا، پاشان چەند كۆمپانیایەكی فەرەنسی كەوتنە كڕینی هەندێ زەوی تونسی ، لەوانە پارچە زەوییەك گە پێی ئەوترا (النفیضة) نێوان شاری تونس و سووسە ڕووبەرەكەی (١٠٠) هەزار هكتاربوو كاتێكیش (بای محمد صادق) ویستی بەرهەڵستی چوونە ناوەوەی ئابووری فەرەنسا بكات(روستان) داوای

لە حکومەتەکەی کرد کە هەڵوێستێکی توندی هەبێت بەرامبەر بەبای و ناچاری بکات ئاسانکاری دارایی نویٚ بدات بەفەرەنسیەکان.

دوای داگیرکردنی جەزائیر فەرەنسییەکان هەوڵیان دا تونس بگرن، کۆچکردنی هەندێك لە هۆزەکانی عەرەبی تونس بەسەر جەزائیر دا کرا بەبیانوو بە ناوی ئەوەی یارمەتی شۆڕشگێرە جەزائیریەکان ئەدەن و لەساڵی١٨٨١دا هێزەکانی داگیرکەرانی فەرەنسی سنووری تونسیان بڕی داگیریان کردو پەیمانی (بۆردۆ)ی بەسەردا سەپاند، کەلە پێشتر ئەم پەیمانە ئامادەکرابوو و ماوەی (٥) سەعاتیان دا بە (بای محمد صادق) تا پەسەندی بکات ئەویش دوای (٢) سەعات پەیمانەکەی مۆرکرد.

دەقی پەیمانەکە ئەوە بوو کە داگیرکرد نەکە کاتییەو هێزەکانی فەرەنسا تەنیا لەسەرسنوورو کەناری دەریا ئەبێت و هەر کاتێك ئیدارەی تونس توانی ئاسایش و یاسا بپارێزێت ئەمان وڵات بەجیٚ دەهێڵن و هەروەها بۆبای نییە پەیمان لەگەڵ هیچ دەوڵەتێکی بێگانە ببەستێت بەڕەزامەندی فەرەنسا نەبێت، هەروەها حکومەتی بای نابێت بهێڵێت چەك و کەرەستەی سوپایی بچێتە ناو جەزائیرو وەزیرێکی فەرەنسی نیشتەجیٚ لەجێی حکومەتی فەرەنسا چاودێری بەجیٚ هێنانی پەیمانەکە ئەکات. بەرامبەر بەمە فەرەنسا بەڵێنی پاراستنی بای و خێزانەکەی دا.

بەڵام گەلی تونس بە توندی بەرهەڵستی ئەم پەیمانەیان کردو لەئەنجامی تێکۆشانی دژبە داگیرکردنی فەرەنسی دوو هەڵوێست گەڵاڵە بوو:-

١- هەڵوێستی خۆ بەدەستەوەدان بوو لەلایەن بای و دەست و پێوەندەکانییەوە.

٢- بەرەی بەرهەڵستی پاڵاوانانەی میللی دژ بەداگیرکەران.

لە ساڵی ١٨٨٣دا فەرەنسا پەیمانێکی تری نوێی سەپاند بەسەر تونسدا کە ئەویش پەیمانی (مرسی) بوو بەپێی ئەم پەیمانە توانای ئابووری تونس خرایە ژێر دەستی داگیرکەرە فەرەنسی یەکان ، بەڵام گەلی تونس بەچەند شێوەیەك بەرهەڵستی ئەم پەیمانەیان کرد لەوانە:-

١- لەساڵی١٨٨٤دا کۆبوونەوەیەکی میللی گشتی یان بەست و ئەنجامەکەی مۆرکردنی بڕوانامەیەکی بێزاری بوو درایە بای ، بەڵام دەسەڵاتەکانی فەرەنسا دەستیان کرد بەڕاونانی ئەوانەی ئەم بڕوانامەیان مۆرکردبوو.

٢- کۆبوونەوە لە دەوری ڕۆژنامەکان لەوانە ڕۆژنامەی(الحاضرة) و(الزهرة) و (سبیل الرشاد) ، دەوری ئەم ڕۆژنامانە دەورێکی گەورە بوو لەبڵاوکردنەوەی هەستی نیشتمانی و بەرپەچدانەوەی سیاسەتی ئیستعماری.

٣- دامەزراندنی کۆمەڵی(تونس الفتاة) لەساڵی ١٩٠٩ دا ئەم کۆمەڵە دەورێکی گەورەی بوو لەبەرهەڵستی عەرەب دژ بەداگیرکەرە فەرەنسییەکان و گەلیان لەپشت بوو.

پێش هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهان بەربەرەکانێ ی گەلی تونس بەرامبەر فەرەنسییەکان کە لە ساڵی(١٨٨١) هوە تونسیان داگیر کردبوو، چووە قۆناغی ڕووبەڕووبونەوە و بەیەکدادانی ڕاستەوخۆ لەگەڵ داگیرکەران دا، لەم ڕووەوە چەند ڕاپەڕینێك ڕوویدا لەوانە:

## أ- ڕاپەڕینی جەللاز :

ئەم ڕاپەڕینە ساڵی ١٩١١ ڕوویدا کاتێك جەماوەر لە گۆڕستانی جەللاز کۆبوونەوە بۆ ئەوەی نەهێڵن هێڵی ئاسن بۆ ترامواى بە ناو گۆڕستاندا ڕابکێشرێت، چونکە بەشوێنێکی پیرۆزی ئایینی ئیسلام دادەنرا، بۆیە بەیەکدادان ڕوویدا و هێزەکانی پۆلیس نەیانتوانی جەماوەر لەگۆڕستانەکە بکەنە دەرێ و لەگەڵ خەڵکەکەدا بەگژیەکداچوون و (١٤) کەسیان کوشت. سەرەنجام دەسەڵاتدارانی فەرەنسا هاتووچۆیان قەدەغەکرد، ڕۆژنامەی نیشتمانپەروەری(التونسی) یان داخست، ژمارەیەکی زۆر لەتونسییەکان گیران لەوانە(٧١) کەسیان دران بەدادگاو(٧) کەسیان لەسێدارەدران.

## ب- ڕاپەڕینی بەکارنەهێنانی ترامواى:-

ئەم ڕاپەڕینەش هەر لەشاری(تونس)ی پایەتەختدار دوای تێپەڕبوونی سێ ڕۆژ بەسەر ڕاپەڕینی جەللازدا ڕوویداو، نزیکەی دوومانگی خایاند. هۆیەکەیشی بریتی بوو لەبێزاربوون و تووڕەیی گەل لە کۆمپانیای ترامواى فەرەنسی و ڕەوشتی خراپی بەرامبەر کرێکارە تونسییەکان و ئازاردانی کرێکارەکان بەوشەی بریندارکەرو گاڵتە پێکردن و پەستکردنی دانیشتوانی گەڕەکەکان ... هتد.

سەرکردەکانی بزووتنەوەی نیشتمانی تونس بۆ دانانی سنوورێك بۆ ئەم ڕەفتارە دزێوانە، چەند داخوازیەکیان بەرزکردەوە ، بەڵام فەرەنسییەکان سەرکردەکانیان گرتن و دووریان خستنەوە، بەمە بزووتنەوەکە دانەمرکایەوە تا سەرکردەکانیان لەدەست بەسەری نەگەڕاندەوە.

دوای جەنگی یەکەمی جیهانیش نیشتمانپەروەرانی تونس بەسەرکردایەتی(عبدالعزیز الثعالبي) توانیان حیزبی(الدستور) لەساڵی١٩٢٠دابمەزرێنن، کە ئامانجی ڕزگاری و سەربەخۆیی تونس بوو لەژێر دەستی فەرەنسییەکان.

لەسییەکانیشدا حیزبی (الدستور الجدید) بەسەرکردایەتی (حبیب بورقیبە) بۆ خەبات دژی فەرەنسییەکان پێکهات.

## ٣ - مەراکیش:-

فەرەنسا هەوڵی دەست بەسەرداگرتنی تەواوی مەغریبی داو، لەبەر ئەمە سوڵتان عبدالرحمن کوڕی هیشام سوڵتانی مەراکیش هەستی بەمەترسی فەرەنسییەکان دەکرد، بۆیە بڕیاری درێژە پێدانی پشتگیری کردنی خەبات گێڕی جەزائیر (عبدالقادر) جەزائیری بەماڵ و چەك دا.

فەرەنسییەکان ناڕەزایی خۆیان دەربڕی بەرامبەر بەو یارمەتیدانە و لەئەنجامدا شەڕی (دۆڵی ئەسڵی) لە ١٤ی ئابی ١٨٤٤ دا ڕووی دا لەنێوان مەڕاکیش و فەرەنسادا و دوای ئەم شەڕەش ئاشتینامەی(تەنجە)ی لە تشرینی دووەمی ١٨٤٤ ی لێکەوتەوە.

فەرەنسا لەساڵی ١٨٧٧دا دەستەیەکی سەربازی فەرەنسی بەسەر سوڵتانی مەراکیشدا (الحسن کوڕی محمد) سەپاند بەبیانووی مەشقکردنی سوپای مەراکشی. بەڵام سوڵتان (الحسن کوڕی محمد) هەوڵی نزیك بوونەوەی دا لەبەریتانیا، چونکە پیّ ی وابوو ئەم نزیك بوونەوەیە دەبێتە کۆسپێك لە بەردەم تەماحکاری فەرەنسا لەمەراکیشدا بە تایبەتی بەریتانیا لەسەرەتاوە بەرهەڵستی درێژەدانی دەست بەسەرداگرتنی فەرەنسی بەسەر

مەراکیشدا کرد، هەروەها لەڕووی بەرژەوەندییەکانی ئیسپانیا دا وەستا لەترسی ئەوەی نەك ئیسپانیا دەست بەسەرگەرووی (جەبەل تاریق) دابگرێت . سولّتان(مولای عبدالعزیز کوڕی حسن) ساڵی ۱۹۰۰ دەسەڵاتی گرتە دەست لەمەراکیشدا کە هێشتا منداڵ و کەم ئەزموون بوو هەوڵی تازەکردنەوەی مەراکیشی دا، بەڵام کەم شارەزاییەکەی بووە هۆی هێنانە ناوەوەی دەسەڵاتی ڕۆژ ئاواییەکان، سولّتانیان بەهۆیەکانی ڕابواردن و ڕووکەشە و بریقەدارەکانی شارستانی ڕۆژئاوا هەڵئەخەڵەتاند، حکومەتی فەرەنسا خاوەن بانقە فەرەنسییەکانی هان دەدا کە قەرز بدەن بە مەغریب، لەساڵی ۱۹۰٤ ڕادەی قەرزەکانی فەرەنسا بۆ مەراکیش گەیشتبووە نزیکەی(۷۰) ملیۆن فرەنکی فەرەنسی.

فەرەنسا خۆی ئامادەکرد بۆ داگیرکردنی مەراکیش بۆ ئەم مەبەستە کێشەی خۆی یەکلاییکردەوە لەگەڵ هەریەکە لە بەریتانیا و ئیسپانیا بەم شێوەیە: دانی نا بەداگیرکردنی میسر لە لایەن بەریتانیاوە، دانی نا بە داگیرکردنی ناوچەی ریفی مەراکیش لەلایەن ئیسپانیاوە.

پاشان قەرزی تازەی خستە پێش سولّتان(عبدالحفیظ کوڕی حسن) کە ساڵی ۱۹۰۸ فەرمانڕەوایی گرتبووە دەست، بەڵام ئەمجارەیان بەمەرجی قورس وەك دەرامەتەکانی گومرگ کە لە هەموو بەندەرەکانی مەغریب کۆدەکرایەوەو باجی (چا)،و لە( ٥۰٪)ی باجەکانی خانووبەرەی ناو شارەکان بخرێتە ژێر دەستیەوە بۆ دانەوەی قەرزەکان . پاشان لە ئازاری ۱۹۱۲دا پەیمانی پاراستنی سەپاند بەسەر مەراکیشدا دوای یەکلایی کردنەوەی کێشەی (ئەغادیر) لەگەڵ ئەڵمانیا دا کە ئەڵمانیا ڕێی لەهاتنی کەشتیە جەنگییە فەرەنسییەکان گرت بۆ ناو ئەم بەندەرەی مەراکیش بە

تایبەتی دوای ئەوەی کە بەرژەوەندیە ئابوورییەکانی ئەڵمانیا لەمەراکیشدا دەرکەوتبوو پاش سەردانەکەی ولیەمی دووەم ئیمپراتۆری ئەڵمانیا بۆ مەراکیش لەساڵی ١٩٠٥دا. بەڵام فەرەنسا بۆ ڕەزامەندی ئەڵمانیا وازی لەناوچە کەنارەکان هێنا لە(کۆنگۆ) کە بووە هۆی ئەوەی فەرەنسا بتوانێت دەست بەسەر مەراکیشدا بگرێت.

دوای ئەوەی فەرەنسا ساڵی ١٩١٢ز بەرپرسیاری پاراستنی بەسەر مەغریبدا سەپاند زۆر شۆڕش و ڕاپەڕین هەڵگیرسا، کە بەناوبانگترینیان شۆڕشی (فاس) بوو، کە ناوچە جیاوازەکانی مەغریبی گرتەوەو هەزاران جەنگاوەر لەناوچەی شاخەکانی (ئەتڵەس) چوونە ڕیزەکانیەوە، بەڵام فەرەنسییەکان بەسەرکردایەتی (بیرلیۆنی) توانیان شۆڕشگێڕان پەرتەوازە بکەن و شۆڕشەکە دابمرکێننەوە.

دوای جەنگی یەکەمی جیهانیش(محەمەد عبدالکریم خەتابی)سەرکردایەتی جووڵانەوەی بەربەرەکانێی چەکداری گرتە دەست و توانی لە مایسی ١٩٢١لەشەڕی (ئەنوال)دا بەسەر ئیسپانیەکاندا سەربکەوێت و کۆماری (ریف)ی لەناوچانەدا دامەزراند، کەدەستی بەسەر داگرتبوون.



لەئەنجامی سەرکەوتنەکانی (خەتابی) بەسەر ئیسپانیەکاندا، فەرەنسییەکان ئارامیان لێ هەڵگیرا، چونکە ترسان لەوەی

بەرژەوەندیەکانیان نەك تەنها لەخۆرئاوای عەرەبی، بەڵکو لەهەموو ئەفریقادا بکەوێتە بەر هەڕەشەو مەترسییەوە، بۆیە لەگەڵ ئیسپانیەکان پێکهاتن و لەدوولاوە هێرشیان کردە سەر کۆماری (ریف). خەتابی توانی بۆ ماوەی یەك ساڵ (مایسی ١٩٢٥ – مایسی ١٩٢٦) بەڕووی هەردوو دەوڵەتدا بوەستێت، بەڵام دواتر بەهۆی چەندین هۆکار کۆماری ریف ڕووخا، گرنگترین ئەو هۆکارانەش بریتی بوون لە:

١– ڕووبەڕووبوونەوەو بەرەنگاری لەگەڵ دوو دەوڵەتی گەورەی ئەورووپی (فەرەنسا، ئیسپانیا) کارێکی قورس بوو، وێڕای پشتیوانی سەربازی ئەمریکا بۆ فەرەنسا و ئیسپانیا.

٢– فەرەنسییەکان بەر لەوەی بچنە دۆخی هێرش بردنەوە، چەك و هێزێکی ئێجگار زۆریان هێنایە مەراکیش.

٣– پادشای مەراکیش دەستی لەگەڵ داگیرکەراندا تێکەڵ کردو کەوتە هاوکاری کردنیان دژی خەتابی.

٤– هەوڵدان بۆ ئەوەی بەمافی ئۆتۆنۆمی شۆڕشگێڕان ساردبکەنەوە .

سەرەنجام داگیرکەران خەتابیش توانیان لەسێ هێرشی گەورەدا بنکەی خەتابی بگرن و خەتابیش لەساڵی ١٩٢٦ خۆی دا بەدەستەوەو دواتر بۆ دورگەی(ریۆنیۆن) لەزەریای هندی دوورخرایەوە، تاساڵی ١٩٤٧ لە و دوورگەیە مایەوە پاشان گوازرایەوە بۆ فەرەنسا و دواتریش لەمیسردا کۆچی دوای کرد.




## و – کورتەیەك دەربارەی مەسەلەی فەلەستین و شۆڕشەکانی:

فەلەستین لەساڵی١٩١٧ داگیرکرا لە لایەن هێزەکانی ئینگلیزەوەبەسەرکردایەتی جەنراڵ (ئەللنبی) کە پێشتر بەشێك بوو لە دەوڵەتی عوسمانی لەئەنجامی هەوڵەکانی بزووتنەوەی سەهیۆنی (زایۆنیزم) کە جووڵانەوەیەکی ئایینی و ڕامیاری و فراوان بوون و داگیرکردن بوو، هەردەم هەوڵی دەدا بۆ کۆکردنەوەی جولەکەکان و گواستنەوەیان بۆ فەلەستین بە مەبەستی دروست کردنی دەوڵەتێکی فراوان بۆ خزمەتی بەرژەوەندی ئیمپریالیزم لە ناوچەکە ، توانی بەریتانیا قایل بکات بە دەرکردنی بەڵێنی(بلفۆر) لەتشرینی دووەمی١٩١٧دا. وە دواتر هەریەکە لە ئەمریکاو فەرەنسا و ئیتالیاش پشتگیریان لێ کرد.

بەڵێنی (بلفۆر) کەلەلایەن ئارثەر جیمس بلفۆر (وەزیری دەرەوەی بەریتانیا) لەشێوەی نامەیەك دەرچوو لەدەقەکەی دا هاتووە ((دەوڵەتی پاشای خاوەن شکۆ بەچاوێکی سۆزەوە دەڕوانێتە دروستکردنی نیشتمانێکی نەتەوەیی بۆ گەلی جوولەکە لە فەلەستیندا، بۆ ئاسانکردن و بەجێ هێنانی ئەم ئامانجە هەوڵ دەدات، وە هیچ شتێکی وەهاش ناکرێت کە مافی مولکی ئایینی ئەو تایەفانە بگۆڕرێ کە جوولەکە نین و لەفەلەستیندا دەژین)).

ساڵی ۱۹۲۰ بەریتانیا ئینتدابی خۆی سەپاند بە سەر فەڵەستین وەك ڕێگایەك بۆ بەدیهێنانی بەڵێنی بلفۆر،ئینتدابی بەریتانیا لەسەر فەڵەستین بەردەوام بوو تاساڵی ۱۹٤۸ کاتێ کە دەوڵەتی ئیسرائیل لەسەر خاکی فەڵەستین دامەزرا.

## * شۆڕشەکانی فەلەستین لە نێوان هەردوو جەنگی جیهانی یەکەم و جەنگی جیهانی دووەمدا (۱۹۲۰-۱۹۳۹):

### ۱- شۆڕشی ۱۹۲۱:-

لەمایسی ۱۹۲۱دا فەلەستینیەکان هێرشیان کردە سەر داگیرگە جولەکەییەکانی(رحبوت،الخضیرة،بتاح تکفا، دیران، الیهودیة)هەروەها جوولەکەکانیش هێرشیان کردە سەر شاری (قەلقیلیە) و تاڵانیان کرد، بەڵام داگیرکەران خۆیان لە هێرشی جوولەکەکان گێل کرد. کەچی لەهەمان کاتدا بەرەنگاری هێرشی فەلەستینیەکان بوونەوە بەفرۆکەو جۆرەها چەکی تر.

لەپاشاندا فەرمانڕەوای ئینگلیز لیژنەی(هایکرافت) ی دامەزراند و لیژنەکەش هۆی بەیەکدادانەکانی مایسی١٩٢١ی وەها لێکدایەوە:

١- سیاسەتی میری دەیەوێت وڵاتێکی نەتەوەیی بۆ جوولەکە دامەزرێنێت.

٢- میری پرس و ڕای بەرێکخراوی سەهیۆنی جیهانی کردو ئەو ڕێکخراوەش بوو بوو بە میریەك لەناومیرییەك دا، بەرامبەر بەمەش عەرەبەکان پشت گوێ خرابوون.

٣- ژمارەیەکی زۆر لە جوولەکەکان لەکاروباری میری دا دامەزرابوون.

٤- بەبێ هیچ تەگەرەیەك کۆچکەرە جوولەکەکان بەلێشاو دەهاتنە فەلەستینەوە.

## ٢- شۆرشی بوراق ١٩٢٩:-

لە ١٤ئابی ١٩٢٩دا (٦٠٠٠) جوولەکە زۆربەیان لەرێکخراوی (المكانة)ی ترسێنەری سەهیۆنی بوون لە (تەل ئەبیب) دا خۆپیشاندانێکی دژ بەعەرەبیان کرد، لەرۆژی دوایدا کە ڕێکەوتی هەینی و لەدایکبوونی پێغەمبەر (د.خ) دەکرد و سەهیۆنیەکان بەشێوەیەکی گەورەترو شەڕ فرۆشتنێکی بەرزتر قودسیان بڕی ڕووەو (البراق) ڕۆیشتن وبەیەکدادانێك لەنێوان عەرەبەکان و جوولەکەکان دا ڕووی دا، هەرچەندە پۆلیس توانی لێکیان بکاتەوە، بەڵام چەند جارێکی تر شەڕو پێکدادان ڕووی دایەوەو پاشان شەڕ زۆربەی شارەکانی قودس و نابلوس و خەلیلی گرتەوە تا گەیشتە شارەکانی حەیفاو یافا.

دوای کۆتایی هاتنی شۆڕشەکە دەوڵەتی ئینگلیز وەك نەریتی خۆی لیژنەیەکی نارد بەناوی لیژنەی (شۆ) بۆ لێکۆڵینەوە لەهۆکانی شۆڕش، بەڵام کەس گوێی لەڕاسپاردەکانی نەگرت، چونکەڕاسپاردەکانی بریتی بوون لە: سنوردانان بۆ کۆچ کردنی جوولەکە بۆ فەلەستین و، وەستاندنی گواستنەوەی زەوی وزار بۆ جوولەکەو، دابین کردنی ماڤی عەرەبەکان.

هۆکارەکانی سەرنەکەوتنی شۆڕشی بوراق (١٩٢٩):-

١- نەبوونی سەرکردایەتی یەکی شۆڕشگێڕ لەنێو جووڵانەوەی نیشتمانیدا.

٢- شۆڕش کە لاوازبوو، چونکە پەرت پەرت بوو و سیمایەکی جوتیارانەشی پێوە دیاربوو.

٣- نەبوونی نەخشەو بەباش زانینی کاری بێ نەخشە و گوێنەدان بەڕێکخستنی جەماوەر.

٤- سەرکردایەتی جووڵانەوەی نیشتمانی ئینگلیزی بەدوژمنی سەرەکی نەدەزانی.

٥- نەبوونی ڕێکخستنێکی شۆڕشگێرانە.

٦- بارو هەڵوێستی جیهانی ئەو سەردەمە ڕێگای سەرکەوتنی جووڵانەوە ڕزگاریخوازەکانی لە وڵاتە داگیرکراوەکاندا نەئەدا، لەهەمان کاتدا ئیستعمار و سەهیۆنیەت لەقۆناغی گوڕ و هێز دابوون.

### ٣- ڕاپەڕینی ١٩٣٣:-

لەئەنجامی بەجوولەکە کردنی فەلەستین چەند خۆپیشاندا نێکی بەتین لەساڵی ١٩٣٣دا شاری قودسی گرتەوە پاشان تەنیەوە بۆ یافا و خۆپیشاندەرەکان چەند داخوازیەکیان هەبوو لەوانە:

١- وەستاندنی کۆچی جوولەکە بۆ فەلەستین.

٢- دانانی یاسایەك کە بەهیچ شێوەیەك نەهێڵێت موڵکایەتی زەوی لەعەرەبەوە بگوێزرێتەوە بۆ جوولەکەکان.

٣- دامەزراندنی حکومەتێکی نیشتمانی بەرپرسیار بەرامبەر بەکۆمیتەیەکی هەڵبژێردراو کە بەرێژەی ژمارەی خەڵکی وڵاتەکە هاوبەشی تێدا بکەن.

### ٤ - جوڵانەوەی قەسام:-

دوای ئەوەی کە(عزالدین قەسام) لەسوریا بڕیاری لەسێدارەدانی درا بەسەردا، چونکە لەسەرکردایەتی شۆڕشە ژێر کەوتووەکەی (الشیخ صالح العلی)دا هاوبەشی کردبوو پەنای هێنا بۆ فەلەستین و پێی وابوو ناتوانێت سەرکەوتن بەدەست بهێنێرێت بەبێ:

١- یەکێتی بەڕێوەبردنی شۆڕش.

٢- دامەزراندنی ڕێکخراوێکی شۆڕشگێرانەی بەهێز.

٣- ڕێکخستنی جەماوەر و خستنە کاری.

٤- دانانی نەخشەی زانستی لەکاری شۆڕشگێری دا لەڕووی ڕامیاری و سەربازیەوە.

٥- ڕوونی بیروڕا.

٦- هەوڵ دان بۆ ئامادەکردنی بارودۆخ بەمەبەستی تەقاندنەوەی شۆڕش.

قەسام دوای فراوانکردنی ڕێکخراوەکەی و دەست خستنی چەند پارچە چەکێك دەستی کرد بەکوشتنی هەندێك لەئەفسەرەکانی ئینگلیز و هەندێ لەتۆمان لێکراوانی عەرەب کە یارمەتی دەزگا داگیرکاریەکان و سەهیۆنیەکانیان دەدا. لە ١٥ تشرینی دووەمی ١٩٣٥دا لەنێوان شۆڕشگێڕەکان وپۆلیسدا پێکدادانێك ڕووی دا لەنزیك دێ ی(السبارد) شێخ(محمد الحلحولي)کە یەکێك بوو لە ئەندامەکانی ئەو ڕێکخراوە شەهیدکرا.

دواتر لە ئێوارەی ١٨ تشرینی دووەم دا نزیکەی٥٠٠سەربازی ئینگلیزی ئابلوقەی قەزای(جەنین) یان داو لەشەڕێکی نابەرامبەر دا عزالدین قەسام و چەند هاوڕێیەکی شەهید کران.

* ئەزموون و تاقیکردنەوەکانی جووڵانەوەی قەسام:-

١- ئەو شۆڕشە وەك مەشخەڵانێك ڕووناك بوو، بەڵام بەخێرایی دامرکێندرایەوە لەگەڵ ئەوەشدا سەرەتای تێکۆشان بوو لەشێوەی ڕێکخستندا.

٢- جووڵانەوەی (قەسام) لاوازی و دوو دڵی سەرکردایەتی جووڵانەوەی نیشتمانی نیمچە دەرەبەگی ئاشکرا کرد.

٣- جووڵانەوەکە دەرگای بۆ جەماوەر خستە سەر پشت کە جڵەوی سەرکردایەتی لەسەرکردە کۆنەکان بسەننەوە.

٤- ڕێکخراوەکەی (قەسام) لەبەرئەوەی کە چاودێریکردنی سیخوری بەسەردا سەپا، قەبارەکەی ڕووەو کەمبوون ڕۆیشت و تەنیا ژمارەیەکی باوەڕ پێکراوی مایەوە.

٥- (قەسام) کەوتە هەڵەیەکی سەربازی سەرەکییەوە چونکە گورج و گۆڵیە ڕامیاری و سەربازیەکانی خزاندە یەك ناوچەوە کەسەرووی فەلەستینە (قەزای جەنین) ، ئەمەش ڕێگای لەناوبردنی ئاسان کرد لەبەردەم داگیرکەرانداو نەیانهێشت پرپشکەکان بگاتە شوێنەکانی تر.

## ٥- شۆڕشی ١٩٣٦:-

### هـۆیـەکـانـی:-

١- زیادبوونی ناڕەزایی فەلەستینیەکان دژی سیاسەتی حکومەتی بەریتانیا، بۆ ئەوەی فەلەستین بکاتە دەوڵەتێکی جوولەکە لەسەر حسابی دانیشتووە ڕاستەقینەکانی.

٢- پاشەگەزبوونەوەی ئینگلیز لەو گفتوگۆو پەیمانانەی کەدا بووی لەمەڕ سەربەستی فەلەستین و دانانی یەك دەوڵەتی عەرەبی سەربەخۆ.

٣- ڕەشبینی سەرکردە و ڕۆڵەکانی گەلی فەڵەستین لەمەڕ گەیشتن بە مافە ڕەواکانیان بەڕێگای گفتوگۆ لەگەڵ لیژنەکانی ئینگلیزدا ــ بڕواشیان وا بووتە نها ڕێگا خەباتی چەکدارانەیە.

٤- خراپی ئینگلیز لەگەڵ فەلەستینیەکان و ڕێك کەوتن لەگەڵ جوولەکەکاندا.

٥- پایە ئیداریە گرنگەکان بەسەرجوولەکەکاندا دابەش کرابوون و فەلەستینیەکان لێی بێبەش کرابوون.

٦- لەسەربازگەکانی ئینگلیز لەفەلەستیندا و لەدەرەوەی فەلەستینیشدا چەك دەڕۆیشت بۆ جوولەکەکان.

٧- لەسەر دەستی شەهید(قەسام) جۆرێك لەرێکخستن هاتەکایەوە بەئاسانی هانی دان بۆ فەرمانی یەکەم شەڕکردن.

٨- دەست خستنی چەند پارچە چەکێك.

٩- پشتگیریکردنی شۆڕش لەدەرەوەو ناوەوەی فەڵەستین.

سەرەتاکانی شۆڕش لەیافاوە دەستی پێکرد بەمانگرتنێکی گشتی دەستی پێکردو دواتر قودس و حەیفا و شارەکانی تری گرتەوە لەسنووری( یافا - تەل ئەبیب) دا پێکدادانێك لەنێوان جوولەکە و فەلەستینیەکاندا ڕوویداو میریش هاتووچۆی قەدەغەکرد و باری نائاسایی ڕاگەیاند.

ئەوەی کەیارمەتی سەرکەوتنی مانگرتنە گشتییەکی فەلەستینی دا ئەو مانگرتنە گشتی یە بوو کە لە میسر ڕووی دا لەساڵی ١٩٣٦ دا بۆ دەرکردنی ئینگلیزەکان و لەسوریا لەساڵی ١٩٣٦وا دا بۆ دەرکردنی فەرەنسییەکان.

هەروەها ڕۆژنامەگەری دەورێکی دیاری هەبوو لەهاندانی مانگرتن و درێژەدان بەو مانگرتنە. سەرەڕای ئەنجامدانی چەندین خۆپیشاندان لەشارەکانی عەمان - دیمەشق - تەرابلوس - صەیدا- بەغداد - موسڵ و قاهیرە بۆ پشتگیریکردنی گەلی فەلەستین. پاشان لە ٢٥ نیسانی ١٩٣٦ دا بەرەیەك بەناوی(لیژنەی عەرەبی باڵا)دروست بوو بڕیاری درێژەپێدانی مانگرتنیدا.

**دواتر ئینگلیزەکان بۆ لەناوبردنی شۆڕش دوو ڕێگایان گرتە بەر:-**

**یەکەم:** ڕێگای سەرکوتکردن و داپڵۆسینی جەماوەری شۆڕشگێڕی عەرەب و سەرکردایەتییە ناوچەییەکانی ڕێکخراوەکانیان.

**دووەم:** ڕێگای ئابلۆقەدان و فرت و فێڵی سیاسی، بەبەکارهێنانی دەسەڵاتی گەورەییان لای سەرۆکەکانی ڕژێمە عەرەبیەکان.

ئینگلیز توانی بەهاوکاری پاشاکانی عەرەب شۆڕشەکە لەناو بەرێت و دواتر لیژنەی (بیل)ی نارد بۆ لێکۆڵینەوە لە هۆیەکانی شۆڕش و هۆیەکانی بەرپابوونی شۆڕش. بەم شێوەیەی لێك دایەوە کە (عەرەبەکان دەیانەوێت سەربەستی  نەتەوایەتی بەدی بهێنن و دەترسن و ڕقیشیان لەبیری دروستکردنی نیشتمانی نەتەوەیی جوولەکەیە) لیژنەکە پێشنیاری دابەشکردنی فەلەستینی کرد لەنێوان عەرەب و جوولەکەدا، بەڵام عەرەبەکان لەکۆنگرەی بلودان کەلەسوریا بەسترا لەساڵی ١٩٣٧دا ئەم پێشنیارەی ڕەتکردەوە.

## هۆیەکانی سەرنەکەوتنی شۆڕشی ١٩٣٦:-

١- ناهاوتایی لەنێوان هێزی شۆڕشگێڕەکان و هێزی جوولەکەکان و ئینگلیزەکانەوە لەڕووی هونەری و بەڕێوەبردن و ڕێکخستنەوە.

٢-باری پارچە پارچەیی و دواکەوتن و پاشکۆیەتی بێگانە لەوڵاتە عەرەبییەکاندا ڕۆڵێکی خراپی بینی بەتایبەتی ئەو ڕۆڵە خراپەی کە پاشاو ئەمیر و کاربەدەستانی عەرەب گێڕایان بۆ لەناوبردنی شۆڕش.

٣- سەرکردایەتی فەلەستینی کە بریتی بوو لەدەرەبەگ و بۆرجوازی گەورە نەیتوانی بچێتە ئاستی ڕووداوەکانەوە.

٤- دواکەوتوویی کۆمەڵ و سەرکردەکان بووە هۆی نەبوونی بیرکردنەوەیەکی شۆڕشگێڕانەو ڕێکخراوێکی جەماوەری فراوان و نەگۆڕ.

٥- سروشتی چینایەتی و ڕامیاری سەرکردایەتی فەلەستینیەکان نەیتوانی پەیوەندیەکی نەپساوی بەرهەم هێن دروست بکات لەگەڵ ئەو هێزە جیهانیانەی کە دژی ئیستعمار و داگیرکردن و چەوسانەوە دەجەنگان.



# پێرست